مەریەم مەعجونی (ڕۆیا)

# دوایین پەنا

وەرگێڕانی: غەریب پشدەری



ڕۆمان

# دوایین پەنــا

نووسینی

**مەریەم مەعجونی (رویا)**

وەرگێڕانی لە فارسییەوە

**غەریب پشدەری**

وەزارەتی ڕۆشنبیری و لاوان بەڕێوەبەرایەتی
گشتی ڕۆژنامەنووسی و چاپ و بڵاوکردنەوە
بەڕێوەبەرایەتی بڵاوکردنەوەی هەولێر

دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

# ● دوایین پەنا

● نووسینی: مەریەم مەعجونی (رویا)
● وەرگێڕانی لە فارسییەوە: غەریب پشدەری
● نەخشەسازی ناوەوە: تەها حسێن
● بەرگ: جێگر عەبدولجەبار
● نرخ: ٢٥٠٠ دینار
● چاپی یەکەم ٢٠١١
● تیراژ: ١٠٠٠دانە
● چاپخانە: وەزارەتی ڕۆشنبیری و لاوان
● لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی(٦٧٨)ی ساڵی (٢٠١١) پێدراوە.

زنجیرەی کتێب (٦٤٥)

ئەو کتێبە و کتێبەکانی وەزارەتی
ڕۆشنبیری لەسەر ئەو ماڵپەڕە بخوێنەوە
www .Kurdchap.com

ماڵپەڕ: www.mukiryani.com
ئیمەیل: info@mukiryani.com

# پێشکەشە

بەو مرۆڤانەی ستەمی رۆژگار پێیان ناوێرێ، کە (شەرا) خانی جوانیش یەکێکە لەوان.

(غەریب)

# (١)

کێیەوە؟

ببورن خانم، ماڵێ خانمی ئەحمەدییە؟

- بەڵێ، بەڕێزتان؟

- من لە گۆڤاری... هاتووم و بڕیارە چاوم بە ڕەها خاتوون بکەوێ.

- بە ڕەها خاتوون! لەلایەن گۆڤارەوە؟ بەڵام خاتوون هیچ شتێکیان لەم بارەیەوە بە من نەگوتووە.

- بە یارمەتی خۆتان! پێیان بڵێن کە من هاتووم.

پیرێژن سەرنجە کونجکاویەکەی دەمنەوە بڕیبوو و بێ جوولە لە سەرتاپامیەوە دەڕوانی. منیش دەوییەوە ڕامابوومەوە و بیرم لەوەی دەکردەوە داخوا تاکەی هەروام ڕادەگرێ. دوایەش تەکانێکی دایە بەر خۆی و بەرەو لای حەسارەکەی ئاوڕدایەوە و چۆوە نێو ماڵێ. لە کەلێنی دەرگای نیوە کراوەکەمەوە ڕۆیشتنەکەی سەیری کرد، ئەو چارشێوە ڕەنگاوڕەنگە جوانەی کە بەسەریەوە بوو دەگەڵ جووڵانەوێی بەدەم باوە جوان دەهات و دەچوو و دەشەکایەوە. لە بەردەمی دەرگای چوونە ژووری خانووەکەیەوە بە دەنگێکی مەیلەو بەرزەوە بانگی کرد:

- خاتوون لەبەر دەرکێیان کار بە تۆیە.

دەنگی جوانە ژنێك لە ژوورێوە بەرزبۆوە کە:

- ڕەبابە خانم بفەرموون پێشیان کەون بێنە ژووری.

پیرێژنەی کە ئێستا زانیم ناوی ڕەبابەیە بەرەو لامەوە هات و دەرگا نیوە کراوەکەی خستە سەرپشتێ و بە دەنگێکی میهرەبانانەوە گوتی:

- فەرموونە ژووری، ڕەها خاتوون چاوەڕێتانە.

چوومە حەسارێکی هەراوو جوانەوە، تەختی زەوییەکەی وا دەدرەوشایەوە پێم حەیف بوو بە وەنێوەکەوتنێی پیسی کەم. سەیرێکی ئاسمانی هەوراویم کرد، وەك بڵێی خۆی بۆ بارینێ ئامادەکا. هەوای ساردی زستانێ ناچاری کردم بێ ئیختیار زیاتر خۆ دەپاڵتۆیەکەمدا

خڕکەمەوە. هەروەك منداڵێکی بە ئەدەب کە بەبێ هیچ شەیتانیەکی وە دووی لەخۆ گەورەترەکەی کەوێ، بە دوای ڕەبابە خانمێمدا هەنگاو هەڵدێنانەوە و بە وردیم دەولاولا دەڕوانی. لە چەند پلیکانێکی بەردەمی خانووەکەی وەسەر کەوتین. دەنگی جوانە ژنێکی کە خۆی دەشاڵێکی خوری زەیتوونی جوانەوە پێچابوو وەخۆی هێنامەوە.

- بفەرموونە ژووری، زۆر بەخێر بێن.

چوومە نێو ماڵێ و هەر دەگەڵ یەکەم هەنگاوێشمدا زانیم پێم دەماڵە ئەشرافێکیەوە ناوە. چوومە سالۆنێکی پێشوازییە یەکجار زۆر شیك و جوانەوە کە هەمووی بە داری ئەبەنووسی دیکۆرکرابوو و ڕازێندرابۆوە و منی سەرسام کرد. سەرنجێکی پڕتاسەم لە ژنەکەدا، حەزم دەکرد ئەوەی کە زەنگی بۆ نووسینگەی گۆڤار لێدابوو هەرچی زووتر بناسم. جوانە ژنێکی بەژن و باڵا بەرزی سەرو پرچ وەك تاریکایی شەوێ ڕەش و دووچاوی گەش و مێشی، لووت یۆنانی و دوو لێوی تا بڵێی لەبار و پێستێکی زەیتوونی کە ئەوی تا بڵێی زۆر جوان دەنواند.

جوانە ژنەکە فەرمووی دانیشتنێی لەسەر موبیلێکی شاهانەی ڕەنگ زێوی لێ کردم.

سەرنجێکی دیکەشم لە دەوروبەرێ دا هەموو کەڵ و پەلەکانی هێندە شیك و جوان بوون کە سەرنجی هەر بینەرێکی بیدیبایە بە لای خۆیدا ڕادەکێشا و ئەوق دەبوو. جا چونکە کەسی دیکەم لەوێ نەدی مەزەندەم کرد کە هەر دەبێ ئەو ژنە جوانە بووبێ زەنگی لێدابێ و ئەوە خودی خۆی بێ. هەر بۆ ئەوەی سەری قسان دامەزرێنم گوتم:

- ماڵێکی تا بڵێی شیك و جوانتان هەیە!

زەردەخەنەیەکی لە دڵان نیشتووی بەڕوومدا پژاند و گوتی:

- شادم کە ئێرەتان پێ خۆشە، ڕاستیت دەوێ من زیاتر باوەڕم بە تەقدیری جوانیەیە نەك بە شوێن و دەوروبەرەکەی.

لە ئاوازی دەنگە غەماوییەکەی نارەحەت بووم. سەرنجە پرسیاراوییەکانم دەوییەوە بڕین.

- ببوورن، دوێنێ ئێوە تەلەفۆنتان بۆ نووسینگەی گۆڤارێ کردبوو؟

ڕەها سەرنجە میهرەبانیەکەی لە ڕوخسارمەوە بڕی و بەدەم بیرکردنەوەوە لە وەڵامی مندا سەرێکی ڕاوەشاند و گوتی:

- بەڵێ.

هێندێکم خۆ لەسەر جێیەکەم هێنا و برد و گوتم:

- باشە دەی ئەوە ئێستا من لێرەم و ئامادەی گوێ راگرتنی قسەکانتانم، بەڵام پێش هەموو شتێك دەمهەوێ بزانم کە ئێوە مەبەستتانە دەربارەی چ باسێك بدوێن؟

رەها بە زەردەخەیەکی دڵ نشینەوە وەڵامی دایەوە:

زۆر سوپاسی ئەو زەحمەتەی هاتن و چاوپێکەوتنەمتان دەکەم، من خۆم داوام لە ئێوە کردووە بێنە ئێرە و هێندێك دەگەڵ ژنێکی دەرد و ئازار و رەنج و ناخۆشی دیتوو دانیشن، چونکە بەو تەمەنە کەمەوە بای یەك دنیام قسە پێیە. جیا لە روخساری جوان، خواوەند چارەنووسێکی تاریك و کرێت و دزێو و ناشرینی بۆمن قەڵەمکێش کردووەو دە تافی لاوەتیەدا، گیانێکی پیرو سیس و ژاکاوم هەیە. حەزم لێیە قسەی دڵی خۆم و ئەو ئێش و ئازارانەی ناخی خۆم بۆ کەسێکی هەڵڕێژم. ئەوجا هەڵوێستەیەکی کردو درێژەی دایەوە:

- بەڵام رێم بدەیە با لە پێشدا پێشوازی و بەخێرهاتنی تۆم لە بیر نەچێتەوە، چونکە کاتێ کە ئەو کۆنە برینە دەم بکاتەوە وام دادەگیرسێنێ کە ئیدی هەرچی دەوروبەرە هەموویم لە بیر دەباتەوە، بۆیە حەزناکەم واتێبگەی کەمن رەسمی میواندارییە نازانم. بەزەردەخەنەیەکەوە سوپاسم کرد و ئەویش لەجێی خۆیەوە هەستا تا لە هۆڵەکە بچێتە دەرێ. هێندە بە جوانی دە دوا کە هەر بەو چەندساتە وەختە کورتەوە منی ئاشوفتەو ئۆگری خۆی کردبوو. حەزم دەکرد تا زووە دەرگای قسانی کردبایەوە و منی لە جیهانە پڕنهێنێ و هێما نادیارەکانی دنیای خۆی شارەزاکردبایەو چارەنووسی تاڵ و سوێر و تاریکی خۆی بۆ باس کردبامایە، بەخەیاڵی خۆم پێموابوو ئەگەر ئەوم لە جێیەکی دیکەی وەك سەر شەقامێك یا لە کۆڕو دانیشتنێکدا دیبایە، هەرگیز بەبیرو مێشك و خەیاڵمدا نەدەهات کە لەو دیو ئەو دەموچاو وروخسارە جوانەوە دڵێکی رەنجور و پڕ ئێش و ئازارو گیانێکی شەکەت و ماندوو هەبێ.

چەند دەقیقێکانم دەربارەی ژیانی رەهایە بیرکردەوە و تا دەشهات بۆ زانینی بەسەر هاتی وی کونجکاوتر دەبووم.

زۆری نەبرد کە رەها دووبارە هاتەوە هۆڵەکە و لە بەرامبەرمەوە دانیشت، ئەو زەردەخەنە دڵ نشینەی سەر لێوی ئەوی زۆر جوانتر و نەرمونیان و میهرەبانتر دەردەخست. بە دەنگێکی زۆر بە ئەدەبانەوە گوتی:

- داوام لە رەبابە خانم کردووە تا جێیەکی دیار و ئامادەکا و شتومەکی پێویستی پێشوازییە میوانە ئازیزەکەمان فەراهەم کات و هەر بۆخۆشی بەسەر پێشوازییە ئێوە رابگات.

دوایەش هەروا کە لەسەر موبێلەکە دادەنیشت درێژەی دایە:

- دەترسم هێندە بچمەوە ناو رابوردوو و ئەوەندەی تێدا رۆچمەوە خزمەت و پێشوازییە تـۆم لە بیربچێتەوە و کەموکوورپیەکم لێوە رووبدات. زۆرم سوپاسی رەها خانمێ کرد و تکاشم لێکـرد هێندە زەحمەت نەکێشێ، لەبەر ئەوەش کە من لە سـەعاتێك زیاتر نەمدەتوانی لە ماڵی ئـەوان بمێنمەوە داوام کرد هەرچی زووترە دەرگای گفتوگۆ بکەینەوە و دەست بە قـسان بکـەین. رەهـا هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی:

- راستیەکەی من ئەگەر بمەوێ لە سەرەتاوە هەرچی هەیە باسی بکەم ئەوە لە چیرۆکەکانی هەزار و یەك شەوەش زیاتر و بەولاوەترە، بەڵام من هەوڵ دەدەم بۆ ئەوەی ماندووتان نەکەم تـا بکرێ بە کورتی و پوختی ئەوەی هەیە بۆتانی بگێڕمەوەو باسی بکەم.

بەم جۆرە رەها دەستی بە قسان کرد و پەردەی لەسەر ئەو ئێش و ئازارە گیان پرووکێنە لادا کە تەواوی گیان و قولایی ناخی هەڵپڕوکاندبوو.

کچێکی شازدە ساڵانە بووم و گورج و گۆڵ و چالاك، رووخۆش و سـەربزێو، کـچێکی تـەڕو شادو پڕ ژاوەژاو و بە هەرا و هوریا، تا بڵێی هەستیار و بزۆز، پڕاوپڕ و لێوانلێو لە تاسەو حەزو نارەزووی ژیان و دنیـای دەوروبـەرم، ژیـانم زۆر جـوان و رازاوە دەدیـت و هـەروەك باڵنـدەکانم بێرەوبەوێدا باڵ لێك دەدان و بێ دەردەسەری دەژیام.

چونکە نۆبەرەی بابیشم بووم منی یەکجار زۆر خۆشدەویست و نازدار ئازیزی ئەو بووم، بابم زۆر زووی ژن هێنابوو و کەس پێی وانەبوو کە ئەو منداڵی ئاوا بەو ساڵ و تەمەنانەی وەك مـن و خوشکەکانی هەبێ. ئەو لە دەوڵەمەنـدە مولکـدارە دیارەکـانی شـاری تارانـە کـە خـەڵکی رێزێکی زۆر لە خۆی و بنەماڵەکەی دەگرن.

بابم ناوی فەرهاد و دایکم ناوی نەسرینە، بەری ژیانی پڕ ئەویـنداری و خۆشەویـستیان چـوار کچ و کوڕێکە کـە ئـەو دایـك و بابـەم لـە هـیچ شـتێکیان بـۆ ئێمـە چـاو نـەبوو و لـەپێناو خۆشگوزەرانی ئێمەدا درێغیان لە هیچ نەدەکرد.

دایکم ژنێکی میهرەبان و شیرین زمانـە کـە مێـرد و منداڵـەکانی لـە گیـانی خـۆی خۆشتر دەوێن.

بابیشم بەڕاستی شەیدای دایکمە و ئەگەر زێدەڕۆییم نەکردبێ هـەر دەیپەرسـتێ. مـن لـە دەوروبەرێکی پڕ لە خۆشەویـستی و میهرەبانیدا گەورە بووم و سەردەمی منداڵی و بێ ئاگاییەم بەسەر بردووە، رۆژانە دەگەڵ خوشکەکانم کە نێوانی تەمەنی هەریەکێکمان دەگەڵ یـەکتردا دوو ساڵە بە گەمەو گاڵتە و شەیتانیە بەسەر دەبرد.

برایەکەم بچووکترین منداڵی خێزانەکەمانە و من دەوان ڕۆژانەدا وەخت و ناوەخت گوێم لـە سـەرزەنشتەکانی نەنکم دەبوو کە بە دایکمی دەکرد بەڵام هیـچی لـە ماناکـەی نەدەگەیـشتم. دایکم گیانیشی لە بابم چاو نـەبوو و تـەنیا مەسـەلەیەکیش کـە لەوانـەبوو جاروبـارە دایکـم نارەحەت و بابم تەریق کاتەوە ئەو زمان لێدانەی خانمێ گەورە (نەنکم) بوو کە بـە زۆر ڕێگـا و شێوەی جیاواز و بیانوانەوە دە دایکمی دەگەیاند کە ئەو هەر کچ زایە و تەنیا کوڕێك بۆ وەچاغ روونیە بنەماڵەی مولکی بەس نیە.

ئێستا کە بیر دەکەمەوە تێدەگەم کە هەر لەبەر تیغی ئەو زمانەی خانمێ گـەورە بـووە کـە دایکم، ئەو بەندەی خوایە هەر بە دوو سـاڵان جارێـك زاوە و منـداڵێکی بـووە بـەڵام هـەموو جارێکیش دەگەڵ لە دایکبوونی هەر یەکێك لە ئێمە سەر لە نوێ کەوتۆتەوە بەر تانەو تەشەر و تیغی زمانەکەی خانمێ گەورە و هێندەی دیشی هاتۆتە سـەرێ.

لە بەرەبەری کۆتایی هاتنی ساڵێدا بووین و چەند ڕۆژێکانی زیاتر نەمابوو بۆ بەهارێ. هەوا تا دەهات تەزووی بەهاریی بەخۆوە دەگرت و ئیدی سۆزەی سەرمای زستانێ شوێنەوارێکی وای نەمابوو. خاو و خێزان خۆیان بۆ پێشوازییە ساڵی نوێ و جەژنی نەورۆزێ ئامادە دەکرد.

ئەو ساڵە جەژن دەگەڵ ساڵەکانی دیکەدا زۆر جیاواز بـوو، بریـار بـوو هـەر دەگـەڵ سـپی هەڵگەڕانێ بەرگی درەختان پوورە فـرانکیش جلـی سپی بووکێنیـە لەبـەرکا. ڕۆژەکـان هـەر هەموویان هەر شایی و هەڵپەڕکێ و شادی بـوون. هـەموو ڕۆژێ دەنگـی ریکـۆردەری ماڵـێ چەندین ماڵ بەولاوەترەوە دەچوو و دەبیسترا.

چەند ڕۆژێکان پێش جـەژنێ کۆڕوکۆبوونـەوەی خۆشـی و شـادی و هەڵپـەڕکێ و سـەما و سووڕدان دە ماڵێ مەدا بەرپا ببوو و من و خوشکەکانیشم کە لێوانلێوی شۆڕو شادی و گورج و گۆڵی و جووڵەی لاوەتیە بووین لە خوامان دەویست هـەلێکمان بـۆ هەڵکـەوێ و چـووباینایەوە شایی و هەڵپەڕکێ و سەما و سوڕدانێ.

بەیانیی ئەو ڕۆژە کە کۆتایی بێ ئاگاییە من بوو لە خەوێ هەستابووم کە زەنگی دەرکـێ لێیدا. بە پەلە و بە وردە ڕاکردنێکەوە بەرەو لای دەرکی حەسارێوە چووم کـە دەرکـەم کـردەوە خانمێ گەورە و بابە گەورەم لە بەردەمی خۆمدا دیـتن. بـە هـەراو هوریـا و هـات و هـاوارەوە هەردووکیانم بە گەرمییەوە ماچ کرد و بەخێرهاتنم کردن و فەرمووی ژوورەوەم لێکردن.

دوای چەند دەقیقێکان تەواوی خاوخێزانی ماڵێ بۆ بەخێرهێنانێ بابە گەورە و دایە گەورەی ڕژانە حەسارێوە و هەریەکە بە نۆرەی خۆی دەستیان ماچکردن و دەست و مستیان بوون. دایـە گەورە بە دەنگێکی بەرزەوە قاقا پێکەنی و گوتی:

- ماشاڵڵا ئادەمیزاد کە دێتە ماڵێ فەرهادی وا دەزانێ چۆتە قوتابخانــەی کـچانەوە، وەرن کچینە با بزانم هەمووم ماچ کردوون، و کەسم هەڵنەبواردووە؟

ئەو تەشەرەی دایە گەورەی دەگەڵ هاتنە ژوورەوێیدا رووی دایەی سوور هەڵگێرا بەڵام ئــەو بەو هەموو نەجابەتەی کــە هــەیبوو بەســەر خــۆی نــەهێنا و زەردەیــەکی هێنایــە ســەر لێــوە جوانەکانی و هیچی نەگوت.

بابە گەورە و دایە گەورە دەگەڵ فەرموو فەرمووی دایك و بابمــدا چــوونە هــۆڵی میوانــان و دانیشتن، سفرەی قاوەڵتیە بەیانی داخراو بەسەر و دڵێکی خۆش و گەرموگورییەکەوە بەڵام بەدەم درکە و تانە و تەشەری جاروبارەی دایە گەورەوە کە دڵی ئەو دایکە بێدەرەتانەمەی ئــازار دەدا قاوەڵتی خورا.

دەو ساتەیدا رەبابە بەخۆ و سینییە چاو شرینییەوە هاتە ژوورێ و رەهای ناچــارکرد قــسەکانی بە نیوەچڵی بەجێ بێڵێ و خــەریکی فــەرموو و پێــشوازییە بــێ. ئــەو هەڵمــەی کــە لــە پیاڵــەی چــایەکانەوە هەڵدەســتا خــۆی دەدڵ و هــەناوی هەوایــدا دەشــاردەوە ســەرنجی راکێــشام. پیاڵــە نەخشاوەکان دەنێو سینیە زێڕینە پێچکە دارەکەدا جیلوەیەکی جوانییە جوانیان دەدایە مێزەکە.

رەها پیاڵە چایەکی لە بەردەمم لەسەر مێزەکە دانا و شیرینیەکەی بــۆ راگــرتم و فــەرمووی کرد. دوای پێشوازییە تکام کرد کە پاشماوەی داستانەکەی ژیــانیم بــۆ بگێڕێتــەوە. هــەروا کــە چاوی هەر بەسەر پیاڵە چایەکەیەوە بوو لێوی بە دەم قسانەوە کردەوە:

- بەڵێ دوای قاوەڵتیە من و دایکم چووینە ژووری نووستنێ دایك و بــابم، تــا دایکــم ئــەو جلانە لەبەرکات کە شەوی پێشتر کریبووی و منیش باری سەرنجی خۆمی بدەمێ.

لەبەر ئەوەی من منداڵی گەورەی ماڵێ بووم باری سەرنجی من بۆ زۆر شتان لەلای دایــك و بابم بایەخێکی تەواوی هەبوو و بە هەند وەردەگیرا.

من هەروا کە سەیری جلەکانی دایکیشمم دەکرد، لە دەبەرکردنێشیدا یارمــەتیم دەدا و بــە جوانیەکەیدا هەڵدەگوت. دایکم بــە بۆچــوونەکانی مــن زۆر ئاســوودە و خورســەندبوو و چــوو لەبەردەمی ئاوێنەی راوەستاو لە هەموو گۆشە و لایەکیەوە کەوتە سەرنجدانێی.

هەموو لایەکانی سەیرکرد و جارجارە ئیرادی لەلایەکیەوە دەگرت بەڵام من هــەموو جــارێ دڵنیام دەکردەوە کە جلێکی یەکجار زۆر شیك و جوانە و پڕ بەبەریــەتی. دایکــم هەمیــشە لــە بابەتی جلانەوە دوو دڵ بوو و ئەگەر جوانترین جلیشی لەبەر کردبایە شتێکی هەر لێ دەدیتەوە. سەرگەرمی باسی جلی تازە و نوێ بووین کە دەنگی دەرگای ژوورێ بەرزبۆوە.

من و دایکم هەردووکمان سەیرێکی یەکترمان کردو من بە دەنگێکی بەرزەوە گوتم:
- فەرموون دەرگا کراوەیە.
دەو دەمەیدا دایە گەورە هاتە ژوورێ. سەیرێکی دایکمی کرد بە دەنگێکی مانادارەوە گوتی:
- پیرۆزە نەسرین، تۆ دەبێ قەدری فەرهادی هەر بزانی.
دایکم زۆر بە خاکەڕایی و پێزانینەوە وەڵامی دایەوە:
خانمێ گەورە فەرهاد تاجی سەری منە، هەموو دەزانن کە من فەرهادم هێندەی هەردوو چاوم خۆشدەوێ.
خانمێ گەورە چاوێکی قیچ کردەوە و گوتی:
- نیدی هەر ئەوەیە، ژنانی ئەم دەور و زەمانە زۆر شارەزان لەوەی چۆناو چۆن یاری بە وشە بکەن و هەر بەو قسانەشیانەکە پیاوان...
قسەکەی بە نیوەچڵی بڕیەوەو ڕووی وەرگێڕا تا لە ژوورێ بچێتە دەرێ بەڵام وەك دڵی بەرایی نەدات قسەکەی هەروا بەنیوە چڵی واز لێ بێنێ، دووبارە بەرەو لای دایکمەوە وەرسووڕایەوە، چاوێکی بە سەرتاپایدا خشاندەوە و ئەوجا ڕووی لە من کرد و گوتی:
- وا... ئەگەر ئێمە چوار زگمان لەسەر یەك کچ بووبایە چارەنووس و ڕۆژگارمان لە خەڵووزێ ڕەشتر دەبوو جا چ جای ئەو هەموو...
چاوێکی بە جلە نوێیەکەی دایکمدا خشاندەوە و هەمدیس قسەکەی بە نیوەچڵیەوە بەجێ هێشتەوە و لە ژوورێ چووە دەرێ. فرمێسکی تەڕ کەوتە سەر چاوە میهرەبانەکانی دایکم، دەمزانی کە دایکم زۆری دڵ لە دایە گەورەی پڕە، بەڵام هێندە خاکەڕا و ناسکە کە هەرگیز بەسەر خۆی نەدەهێنا. تا بڵێی زۆر بەدەست خانمێ گەورە و تیغی زمانیەوە تووڕە و وەزاڵە هاتبووم، نازانم ڕەنگە لەبەر بێدەنگی و بێ زمانیە دایکیشم بووبێ وا نارەحەت بووم، بەڵام دایکم بۆ ئەوەی من نارەحەت نەبم بە تۆزێ زەردەیەکی کرد و گوتی:
- ڕەها ئەو سەرو ڕووە چییە بە خۆتەوە گرتووە؟ ئازیزەکەم دەبێ وردە وردە فێربی کە نابێ بە هەر قسەیەکی کە دەیبیسی نارەحەت ببی، حەیف نییە ئەو دەمووچاوە جوانە بە مرچ و مۆنیەوە گلێ و ناشیرین بێ؟ پێبکەنە ئیدی، ئەو ڕۆژانە، ڕۆژانی شادین و هەرکەسێك دەو ڕۆژانەدا سیس و ژاکاو و غەمباربێ تا کۆتایی ساڵ هەروا دەبێ، خێراکە زووتر بچۆوە ژوورەکەت و ئامادەبە تا تیبە خانم نەڕۆیوە بچۆ جلەکانت وەرگرەوە.

قسەکانی دایکم نارەحەتیەکانی لەبیر بردمەوەو لە خۆشـیە بیرەوەرییـە هاتنـەوەی جـەژنی نەورۆزێ و هـات وبـاتی بووکێنیـە پـوورە فرانکـێ وەك فەنـەری لـەجێی خۆمـەوە دەرپـەڕیم وچوومەوە ژوورەکەم و خـۆم ئامـادەی چـوونە دەرێ کـرد تـا هەرچـی زووتـرە بگەمـە مالـێ تیبەخانمێ بەرگدرووی خانەوا دەمان و جلە کانمی لێ وەربگرمەوە. لەبەر ئاوێنـەی راوەسـتام و بەر لەوەی لە مالێ دەرچم هەر لە ژووری چاوێکی دیکەم بەسەر خۆمدا خشاندەوە، قژم داهێنا و جلەکانم رێك خستن و لـە ژووری هاتمـە دەرێ. دەحەسـارێدا هـەروا کـە بـەرەولای دەرکێـوە دەچووم، بە دەنگێکی بەرزەوە گوتم:

- دایە ئیشت نییە؟ من وا دەڕۆم، هیچت ناوێ لەسەر رێیە بیکڕم؟

دایکم لە دیوی مەتبەخێوە بە میهرەبانییەکەوە وەلامی دایەوە:

نا ئازیزەکەم سوپاس، خوات لەگەڵ. تەنیا ئەوندە، زووتر وەرەوە زۆرمان ئـیش هەیـە. بـە نیشانەی ئەرێوە سەرێکم بادا و گوتم:

- بە چاوان هەر ئیشەکەم تەواو ببێ دێمەوە.

هەر ئەو دەمی کە دەرگام کردەوە ئەوم دیت. ئەوەی کە دلّی دزیم و هێلێکی سووری بەسەر دەوران و سەردەمی بێ ئاگابییەمدا هێنا.

لاوێکی تەمەن دەوروبەری بیست و دوو، بیست و سێ سالانە لە پشت دەرکێوە*راوەستاو و خـەریکی زەنـگ لێـدانێ بـوو. بـە دیتنـێ مـن هـەنگاوێك کـشایە دواوە و بـە دەسـتە پاچەییەکەوە گوتی:

- سلاو، ببوورن کچە خاتوون، ئەوە مالێ ئاغای مولکییە؟

منیش هەر بە دەستەپاچەییەوە و بێ وەلامدانەوەی سلاوەکەی وەلامم دایەوە:

- بەلێ، بەرێزتان؟

سەری بەردایەوە و گوتی:

- من ئومێدم، خالم ناردوومی تا لە خانمێ گـەورە و بابـە گـەورەی بپرسـم ئەگـەر کـارو ئیشێك مابێ بیکەم.

بەسەر سامیەوە پرسیم:

- خالت؟

بەلێ خالە رەزای دەلێم، هەروەك عەرزم کرد، من ئومێد، خوارزای ئەوانم. تازە تێگەیشتم کە ئەو، ئومێد خوشکەزای زاوای تازەبوو، بۆیەش هێندە جێی سەرنج و پەسەندی خانمێ گەورە

بوو و هەر بۆیەش دەگەڵ هاتنە ژوورێیدا وای باسی ئەدەب و نەجابەتی وی کردبوو. کونجکاوانە دەسەر تاپایمەوە هەڵڕوانی و گوتم:

- بە یارمەتی هەروا چەند ساتێك مۆڵەت بفەرموون.

هاتمەوە نێو حەساریّ و بانگی دایکمم کرد و پێم گوت کە ئومێد لەبەر دەرکیّ راوەستاوە و چاوەڕێی وەڵامە.

دایکم هەروا بەدەم سەرپۆش بەسەر دادانێوە هاتە حەساریّ، بەرەو لای دەرکێوە چوو، دەگەڵ ئومێدیان دەست بە چاك و چۆنی و ئەحواڵپرسییە کرد و فەرمووی چوونە ژوورەوەی لێکرد.

ئومێد جارجارە سەیرێکی دایکمی دەکرد و وردە سەرنجێکیشی لە من دەدا و بە دەستەپاچەییەوە وەڵامی دایکمی دەدایەوە. بە زۆریە دایکم چووە ژووریّ. منیش ئەوە هەروا راوەستاوم و سەیری ئومێد و دایکم دەکەم و گوێم بۆ فەرموو فەرمووی ئەوان راگرتووە کە بەدەنگی دایکم بەخۆهاتمەوە:

- رەها ئەوە بۆ هەروا راوەستاوی دەخێراکە دەی ئیدی برۆ!

بە شەرمێکەوە گوتم:

- بە چاوان دایکە من وا رۆیشتم.

بەرەو لای دەرکی حەسارێوە کەوتمە ریّ. نازانم بۆ کاتیّ کە دەمویست لە دەرکیّ وەدەرکەوم پێم خۆش بوو جارێکی دیشی ببینمەوە و بیّ ئیختیار ئاوڕم دایەوەو سەیرێکی دواوەم کردەوە. ئەویش راست دەو دەمەیدا کە لە پلیکانەکان وە سەر دەکەوت ئاوڕێکی بەرەو لای من دایەوە.

بۆ ساتەوەختێك سەرنجەکانمان تێك ئالقان و لێکیان دا. خێرا رووی خۆم وەرگێڕایەوەو لە دەرکیّ چوومە دەریّ، دڵم بە توندی لێیدەدا، وەك بڵێی دەقەفەزەی سینگمیدا جیّ نابێتەوە، راست وەك باڵندەیەکی هەراسان هەر خۆی بە دیواری سینەمدا دەدا و خۆی هەڵداویشت، دەرگاکەم داخستەوە و بە شانازییەکەوە لەبەر خۆمەوە گوتم:

- چەند چاو حیزە، چۆناوچۆن دەڕوانیّ و سەیر دەکا:

بەڵام دە دڵی خۆمدا پێکەنینم بە قسەکەی خۆم هاتیّ و دە وەڵامدا گوتم:

- باشە ئەی تۆ بۆ سەیرت کرد

وەك بڵێی بەویّ خۆمی لیّ بەرمە دەریّ دوبارە بە توورەییەکەوە گرماندم:

- راستیەکەی کارێکی بیّ جێی کرد لەو تەماشاکردن و سەرنج دانانەی بۆیە دەبیّ بە بابەگیانم بڵێم... بەڵام بەینی خۆشمان بیّ چەند بەتاموخویّ دەدوا.

هەستێکی نامۆی سەیر دەناخمدا هاواری لێ هەستا:

- بیبڕەوە کچێ ئەو قسانە چین؟ ئەوە دەزانی چ دەڵێی و چ مەرگێکتە؟

بە کورتیەکەی تا بەردەرکی ماڵێ تیبە خانمێ هەروا یەك و دووم بوو دەگەڵ خۆمدا. هەندێ جار ستایشم دەکرد و هەندێ ساتیش بە هەستێکی کە دەناخمدا سەری هەڵدەدا دەکەوتمە بگرەو بەردە و کێشمە کێشەوە.

کاتێ کە چوومە حەسارێ ماڵێ تیبەوە و چاوم بە جلە تازەکانم کەوت هەموو شتێکم لەبیرچۆوە. کەتیبە خانمیش دەجلەکانیەوە هەڵڕوانی دیاربوو زۆر لە کارەکەی رازییە.

جلەکانم لە تیبەخانمێ وەرگرتنەوەو بەرەو ماڵ بوومەوە، جیا لە جارانی پێشوو کە بە بەردەمی دوکان و موغازەی زێڕ فرۆشەکاندا دەهاتم و رادەوەستام و دەکەوتمە تەماشاکردنێ، ئەمجارەیان بە پەلە بەرەو ماڵەوەم هەلینگ دەدا و دەڕۆیشتم. دەو ساتانەدا نەمدەزانی لەبەر راسپاردەکانی دایکمە یا بە تاسەی دووبارە دیتنەوەی ئومێدە وا هێندە بە پەلەی رۆینێم.

وا دەبیرەوە چوو بووم و هێندەم بە خێرایی هەنگاو داویشتن کە هیچ ئاگام لەو چاڵەی بەرپێم نەبوو و بە تێکەوتنێشیم هێندەی نەمابوو تخێڵ بم. چەند لاوێك کە بەرەو ڕووم دەهاتن چەند مەتەڵەکێکیان تێگرتم و بە پێکەنینەوە بە لامدا ڕەتبوون.

بە گرژی و تووڕەییەوە گەیمەوە بەردەرکی ماڵێ. مجێزی دووبارە دیتنەوەی ئەو هەموو گیانی داگرتم و تووڕەییەکەی لەبیر بردمەوە.

کاتێ کە زەنگی دەرگام لێدا، لە دڵەوە نزام دەکرد درەنگ نەهاتبمەوە و ئەو هێشتا هەر لە ماڵەوە بێ. سالاری برا بچکۆلەم دەرگاکەی کردەوە و من دەستبەجێ چوومەوە ژوورێ. کە لە پلیکانەکان وەسەر کەوتم چاوم لە جووتە پێڵاوەکانی بەردەمی دەرگای ژوورێ دەگێڕا بەڵام بە داخەوە هیچ جووتە پێڵاوێکی بیگانە دەنێو پێڵاوەکاندا وەبەرچاو نەدەکەوت و نەبوو. دیاربوو ئومێد رۆیوە لەبەر خۆمەوە گوتم:

- باشە نەیدەتوانی کەمێکی دیکە راوەستێ دەڵێی بۆ ئاور رووی هاتووە بیبا.

پێکەنینم بە شێوەی بیرکردنەوەکەم هاتێ و سەریشم لەو بارە دەروونیەی خۆم سوڕما. دەنگی دایکم لە ژوورەوە منی بەرەو ئەو لایە راکێشا.

دەرگاکەم کردەوە، دایکم خەریکی ڕێکخستنی ژووری میوانان بوو، لە ڕەنگی رووە پەڕیوەکەی و مرچ و مۆنیە دەموچاویەوە دیاربوو کە دایە گەورە برینێکی تازەی دە دڵی کردۆتەوە. دایکم هەروەك هەموو جاران بێدەنگ و ئارام بوو و دەبێدەنگیەدا دەبیر و خەیاڵانەوە

چـوو بـوو. هەرکـە منـی دیـت هـەوڵی دا وەك هـەموو جـاران نهـێن کاریـەکی بکاتـەوە. زەردەخەنەیەکی دەستکردانەی هێنایە سەر لێوان و پرسی:

- جلەکانت تەواو ببوون؟

بە زەردەخەنەیەکەوە وەڵامم دایەوە:

- بەڵێ.

بە پێداگرتن و سوور بوونێ چەند جارەی دایکم جلە تازەکانم دەبەر کردن و دایکم هەمدیس بە هەمان دوو دڵیە هەمیشەییەکەی خۆیەوە لە هەموو لایەکیـەوەڕا سـەیرکرد و کاتـێ کـە دڵنیا بوو چ عەیب و عار و ئیرادێکی نییە ڕێی پێ دام جلەکانم داکەنمەوە و خۆم بگۆڕمەوە.

خانمێ گەورە و بابە گەورە لە هۆڵی پێشوازییە لەسەر موبێلیان پاڵ دابۆوە و دەگەڵ بابمیـان دەربارەی چۆنیەتی بەڕێوەچوونێ ڕێوڕەسمی ئاهەنگی بووکێنیەکە دەدوان. دایکم داوای لێکـردم تا بچمە لایانەوە و خەریکی پێشوازییە بم و بپرسم داخوا هیچیان ناوێ بۆیان بەرم.

لە کاتێکدا کە لە بن لێوانەوە گۆرانییەکم دەگوتەوە بەرەو لای هۆڵەکەوە چووم و لەسەرخۆ سڵاوم کرد. هەرسێکیان بە میهرەبانیەوە وەڵامیان دامەوە. پرسیم:

- دایکم گوتی ئەگەر شتێکتان پێویست بێ تاهەر ئێستا بیهێنمە خزمەتتان. بابە گـەورە پێکەنی و گوتی:

- سوپاس کچەکەم، ئینـشاڵڵا هـەر بـەو زووانـە دوای فرانـك تـۆش لـە بـەرگی سـپی بووکێنیەدا ببینم.

لە قسەکانی بابە گەورەی تەریق بوومەوە و سەرم بەردایەوە و وەڵامم دایەوە:

- ئەی، بابە گەورە، واز بێنە.

بابە گەورە بە دەم پێکەنینەوە درێژەی دایە:

- بۆ خۆم دەبێ ڕەهای بە مێرددەم، بۆ خۆم مێردێکی چاکم بۆ دیوەتەوە.

بابم بە میهرەبانیەوە گوتی:

- ئەگەر کچە جوانەکەم چەند پیاڵە چایەکی تازە دەم کردوومان بداتێ مەمنون دەبـین. لـە کاتێکدا کە ڕوومەتەکانم بە قسەی بابە گەورە سوور هەڵگەڕابوون لەسەرخۆ گوتم:

- بە چاوان هەر ئێستا دەیهێنم.

بەرەو لای مەتبەخێوە چووم کە لە پشتەوەمڕا گوێ لە دەنگی دایە گـەورەی بـوو بـە بابمی دەگوت:

- پێشینان گوتوویانە کە کچ وەك هەویرێیە تا چاو هەڵێنی باڵای کردووە و کاتی شوویەتی، کوڕە بەستەزمانە بێدەرەتانەکەم هێشتا ڕاست و چەپی خۆی بە تەواوی نەناسی دوو کۆمەڵە کچ دەورەیان گرت، جا ئەوجار وەرە بەسەریان رابگە و بە مێردیاندە و غەمی بەرو جیازیانت لەبەر بێ و چووزانم کە هەموو ئەو شتانە لە پەل و پۆت دەخەن و پیر و کەنەفتت دەکەن، چەند جارم گوت ئەو ژنە هەر کچ زایە، و وەرە تا درەنگ نەبووە با ئەو کچەی بۆم دیاری کردووی بۆت بێنم. بەڵام کێ گوێت دەداتێ...

بابم بە گرژیەوە وەڵامی دایەوە:

- دایە تووبی خوا هەمدیس دەست پێ مەکەوە، ئێستا وەختی ئەو قسانە نییە. من ئەگەر بمویستبایە ژنێ بەسەر نەسرینێ بێنم دەمێك ساڵ بوو ئەوەم دەکرد. ئێستاش چ پێویست ناکا وە دوای قسەی پێشینان کەوین...

بە تووڕەییەوە چوومە مەتبەخێ و توندم گوێی خۆم گرت تا گوێم لە پاشماوەی قسەکانی بابم و خانمێ گەورە نەبێ. کە دایکم ئاوای دیتم بە نیگەرانییەوە پرسی:

- ئەوە بۆ وات سەری خۆت گرتووە؟ ناکا سەرت بێشێ؟

بە هەنیسکی ئاشکراوە گوتم:

- نا هیچم نییە، دەمەویست قسەکانی دایە گەورەی نەبیسم، من نازانم ئەو ئامان دەداتێ وا هێندە بە بوونی ئێمە نارەحەتە؟

دایکم دەستێکی میهرەبانانەی بەسەرمدا هێنا و سەری ماچ کردم و گوتی: تۆ دەبێ ئەوەی بزانی کە هەموو کەسێك بە گوێرەی ویستی مرۆڤ و مجێزی وی قسان ناکەن و نادوێن، هەروەك چۆنیش بە ستایش و پێدا هەڵدانیشیان دڵشاد و شەنگوڵ و کەیف ساز دەبی دەبێ ئاواش بە رەخنە و گازاندەکانیشیان رازی بیت، هەرکەسە و بۆخۆی سەر پشکە لە دەربڕینی بیروباوەڕ و بۆچوونەکانی و چۆنیشی حەز لێیە ئاواشی دەربڕێ. کاری بنەڕەتی بابیشتانە کە شانازی بەتاك تاکی ئێوەوە دەکا و پێشموایە ئەوەندەش بۆ ئێمە بەسە.

ئێستاش دایە گەورەت چەندی دڵی دێنێ و چەندی دەتوانێ با بە پێچ و پەنا بێروبەوێدا هەر پلاران باوێ. بەو قسانە هەر خۆی نارەحەت و تووڕەو ماندوو دەکات، دیاریشە هیچ کەسێك تا سەرەتا خۆی نارەحەت نەکا ناتوانێ کەسانی دیکە نارەحەت کات و برەنجێنێ.

قسەکانی دایکم هێندێکیان هێور کردمەوە. بە هاریکاریە وی سێ پیاڵەم چا تێکردن و بۆ بابم و میوانانم بردن.

ڕیەکەی جەژنی نەورۆزێ هات و دەگەڵ دەستپێکی ساڵی نوێدا ژاوە ژاو و هات و بات
ئەوتە ناو خاوخێزان و نێو ئەندامانی کەس وکاری مەوە. هەفتەی دواتریش زەماوەندی
بووکێنیە پوورە فرانکێ بوو کە بچووکترین ئەندامی بنەماڵەی بابە گەورەم بوو، خانمێ گەورە
بەردەوام بەسەر پێوە بوو و هەر دەهات و دەچوو و فەرمان و دەستووری دەدان و هەڵسووڕانی
کارەکانی زۆر بەدڵی نەبوو.

هەر ڕۆژێك کە تێدەپەڕی و لە زەماوەندی ڕۆژی بووکێنیە پوورە فرانکێ نزیکتر دەبووینەوە
تای تەرازووی بۆڵە بۆڵ و گرموهوڕی دایە گەورەی زیاتر هەڵدەکشاو قورستر دەبوو.

ڕۆژی زەماوەندو شاییە پوورە فرانکێ هات. ئەو ڕۆژە لە ڤیەللایەکەی شەمیراناتی بابە
گەورە هات و باتێکی تایبەتی بەرپا بوو، بە دەستووری خانمێ گەورەش چەندین بەردەست بۆ
پێشوازییە ڕاگیرابوون. دە هۆڵە ڕازاوەکەی ڤیەللای بابە گەورەی و بەتەك مەلیحەی
ئامۆزامەوە کە بەساڵێکی لەمن گەورەتر بوو و تازە بە تازە بە دەزگیران بوو دانیشتبووم.

چەندانێکی دیش کیژوکاڵی هاو ساڵ و تەمەنی مەش هەر لە دەوری مێزەکەی من و
مەلیحەی خڕببوونەوە و ئالقەیان بەستبوو و قسەو باسی خۆش و بەتاموچێژمان دەکردن و
دەنگی قاقای پێکەنین و قسەکانمان هۆڵەکەی پڕکردبوو.

لە دەنگی تلی لیلی و هەلهەلەی ژنانڕا زانیمان کە بووك و زاوا هاتنە نێو هۆڵەکەوە.
هەموو لە هەموو بە خۆشیە دیتنێ بووکێوە بەجلە سپییەکانیەوە لە جێی خۆمانەوە ڕاپەڕین و
بەرەو لای حەسارێوەمان ڕاکرد. هەریەکەو لەسەر سەری ئەویدیکەوە یا هەرکلاو ڕۆژنەیەکی
وەرگیر کەوتبا گەردەنی کێل دەکرد و سەرێکی خواردەکردەوە تا زووتر بووك و زاوای ببینێ.

هەر لە پێش هەیوانێوەشڕا زۆر بە ئاسانیت دەرکی حەسارێ کە بەخوێنی مەڕی قوربانییە
سوور ببوو، دەدیت. زۆرم زگ بەدیتنێ سەرە مەڕە بڕاوەکان سووتا و بۆ ماوەیەکم چاو
لەسەریەك دانان و سوپاسی خوام کرد کە لە جێی وان نیم.

دەنێوهات و هاواری ژنانڕا بووك وزاواهاتنە هۆڵێوە وشایی و زەماوەند و هەڵپەڕکێ و
سەماو سووڕدان جۆشێکی دیکەی ستاند.

چاکم سەر گەرم ببوو کە دایکم بانگی کردم و گوتی:

- ڕەها بە یارمەتی خۆت ئەو دەورییانە بدە خەدیجە خانمێ تا پەڕۆیەکیان پێدا بێنێ. بەبێ
مەیلیەکەوە دەورییەکانم هەڵگرتن و بە بۆڵەبۆڵەوە بەرەولای حەسارێوە چووم. هەرکە گەیە
حەسارێ بەسەر پلیکانەکاندا دەڕۆیشتم لە پڕ تەواوی هەموو لەشم لەرزی. ئەم دیت سۆندەی

ئاوێ بەدەستەوە تا مامە فەرزاد دەستی کە بەخوێنی سەربڕینێ مەڕەکانی بەڕێی خوشکەکەی سوور ببوو بشوا.

هەروا کە سەرتاپای گیانم یەکپارچە ئاگربوو و لە ژێرەوە بە دزیەوە سەیری ئومێدم دەکرد بەرەو لای ئەنبارێ ئەو سەری حەسارێوە چووم. کاتێ کە بە بەردەمیاندا تێدەپەڕیم بە ئەنقەست بە بەرزیەکەوە گوتم:

- مامە گیان ماندوو نەبی.

مامە و ئومێدیش هەردووك پێکەوە سەیری لای منیان کرد. لەرزینێکی وام دەدەستەکانمدا هەستکرد کە هێندەی نەمابوو دەورییەکانم هەموو لە دەستی بەربنەوە. مامە بە چاوپێکەوتنێمی زەردێك هاتێ و بە میهرەبانیەکەوە وەڵامی دایەوە:

- سەلامەت بی کچەکەم، ئەدی کەنگێ قوربانی بووکێنیەش بۆ تۆ لە عەردی دەم.

بە شەرمێکەوە سەرم بەردایەوە و ویستم لێیان دوورکەومەوە کە دەنگێکی لە دڵان خۆشم دەگوێیدا زرنگایەوە:

- سڵاو رەها خاتوون...

بە دەستە پاچەییەوە وەڵامی سڵاوەکەیم دایەوە و کەوتمەوە رێ. بەڵام تیری سەرنجەکانیم لە پشتمەوە هەستدەکرد و هەرچی لەشم بوو یەکپارچە لەرزی. چوومە ئەنبارێوە و دەورییەکانم دانە دەست خەدیجە خانمێ. لە پەنجەرەی ئەنبارێوەمڕا لە سەرخۆ تەماشای نێو حەسارێ کرد. دڵم بۆی لێدەدا بەڵام هەر خەریکی خۆدزینەوێ و پەنهان کاریەش بووم.

- هەتیوە پیسە، سەیری چۆناوچۆن راوەستاوە و چاوی دە دەرکی ئەنبارێوە بریوە، شەیتان دەڵێ بچم و بە بابم بڵێم، بەڵام باشە چ بڵێم، سەیری قەڵافەتی چەند دزێوە... بەڵام پێ لە هەقێش نەنێین، خوا هەقە روخسارێکی جوان و دڵکێشی هەیە، با بڕوا خوای دەکرد ملی دەشکا و رانی ورد دەبوو...

دەو دەمیدا حەبیب ئاغای برا گەورەی مێردی پوورێ لەو سەری حەسارێوەی هاوار کرد:

- ئومێد، کوڕی خاڵی وەرە...

ئومێد گەڕایەوە بەڵام لە پڕ پێی لە سۆندەکە هەڵەنگوت و بەرەو پێشەوە لار بۆوە.

بێ ئاگایانە بە دەنگێکی بەرزەوە گوتم:

- ئای وای بمرم خوایە:

- خەدیجە خانمێ بەستەزمان بەرەو لای منی ئاوڕدایەوە گوتی:

- ڕەها خاتوون ئەوە چبوو؟

تازە زانیم چیم کردووە، بە دەستە پاچەییەوە گوتم:

- هیچ نییە پالّم وە دیواریەوەدا هەموو جلەکانم خۆلاّوی بوون

خەدیجە خانم بە گومانەوە سەیرێکی جلەکانی کردم کە هیچی بە جلەکانمەوە نەدیت دەنگی نەکرد. بە گوتنێ ئەو ڕستەی ئەوەی کە نەمدەویست باوەڕی پێ بکەم، باوەڕم هات.

* * * *

دەو ساتەیدا ڕەها سەیرێکی پیالّە سارد بووەوەکانی کرد و گوتی:

بەڕاستی دەبێ ببوری، وام دەقسان گرتی کە چایەکەتان سارد بۆوە. بانگی ڕەبابـە خـانمێی کرد تا چایەکان بگۆڕێ. دەو ساتەیدا ڕەها لە پڕ بابەتێکی وەبیر هاتەوە و پرسی:

- ڕاستیەکەی من هەر لەبیرم چۆوە ناوەکەشتان بپرسم؟

هەردوولا بە وەبیرهاتنەوێ ئـەو مەسـەلەی پێکـەنینمان هاتـێ، هێنـدێکم لـە جێیەکـەی خۆمەوە خۆ هێنا و برد و وەلاّمم دایەوە:

- من سپێدەم، سپێدە ڕەزایی، پەیامنێری گۆڤاری...

ڕەها هەر بە هەمان زەردەخەنە جوانەکەوە گوتی:

- دەبێ بمبووری، چونکە من لە لایەنی دەروونیـەوە زۆر تـەواونیم، ئێـوەش تـا زیـاتر لـە رابردووی من شارەزاتربن باشترم دەناسن و چاکترم هەست پێ دەکەن.

ڕەبابە خانم سـەرلەنوێ بەخۆو بە پیالّە چایەکانەوە هاتەوە هۆلێ و ئەمجارەیان ڕەهـا دەنگـی لێوە نەهات تا چایەکانمان خواردنەوە.

سەیرێکی کاتژمێرم کرد نزیکەی سێ سەعات بوو لە مالێ ڕەهای دانسشتبووم و گوێم لە بەسەر هاتەکەی گرتبوو. هەوا تا دەهات بەرەو تاریکیەوە دەچوو و چونکە هەستیشم دەکرد کە ڕەهاش هەر ماندووە داوام لێکرد تا پاشماوەی قسەکانی بـۆ کـاتێکی دیکـەی گونجـاوتر هەلگرێ بۆ نموونە بەیانی هەر دەوکات و ساتەیدا ئـەورۆ کـە هاتمـە مالێیـان و بەسـەرهاتە سامناکەکەی بنووسمەوە.

کاتێ کە هەستام تا بڕۆم ئەو پرسیارەی کە تەواوی بیر و هۆشی داگرتبووم کردم:

- ڕەها بە سـەرنجێکی میهرەبانانەوە سەیرێکی کردم و بـە زەردەخەیـەکی ئەرێیانـەوە وەلاّمی دایەوە:

- ببورن لەو پرسیارەی کە دەیکەم بەڵام خۆ تا ئێرەش بەسەرهاتەکەتان پڕە لە ڕێکەوتی خۆش و بەتام و چێژ ئەی باشە نارەحەتی چین؟

- ئێوە تازە لە سەرەتای بەسەرهاتەکەی منن، بە پشتیوانیە خودای لەمەودوا و ڕۆژەکانی دادێن تا زیاتر بەرەوپێش بچین بە دڵنیاییەوە لەو زووە داوەریەتان پەشیمان دەبنەوە. تەنیا ئەوەندەش بزانن کە:

ساقی بادەیەك مەیم بدەیە، وێنەکێشی غەیب

هیچ کەس نازانێ لە پەردەی رازا چ دەنەخشێنێ

فرمێسك بە چاوە جوانەکانیدا هاتەخوارێ، من لە پرسیارەکەم پەشێمان بوومەوە و لەوەش کە بە قسەکانم نارەحەتم کردبوو داوای لێبوردنم کرد. ڕەها هەروا کە دڵۆپە فرمێسکە مرواری ناساییەکانی بەسەر کوڵمەکانیدا دادەبارین لە رووی سۆزەوە زەردەیەکی کرد و گوتی:

- نا گوناهی ئێوە نییە کە من دەگریم، من ئیدی بەو فرمێسك رشتنانە راهاتووم، من تەنیا هاودەمێکم هەر ئەو ئاه و حەسرەت و دڵۆپە مروارییانەیە کە هەڵیان دەوەرێنم.

ماڵئاواییم لە ڕەهای کرد و لە ماڵ وەدەرکەوتم، هەوای ساردی مانگی (دەی) وای لێکردم زیاتر پاڵتۆکەم دەخۆوە پێچم. هەروا کە بەرەو ماڵ بەرێوە بووم بیرم لە قسەکانی ڕەهای دەکردەوە، کە چۆن بێ بەزەییە چەرخی گەردوون ئاوا فرمێسکان بەو ژنە جوانەی هەڵدەرێژێ.

زۆرم حەز دەکرد بە سەعات بە تەك ڕەها خاتوونێوە دانیشتبام و گوێم لە سکالاکانی بگرتبایە. سەرنجێکم دایەوە ئەو پەڕانەی کە قسەکانی ڕەهام تێدا نووسیبوونەوە و کەوتمە بیرو لێکدانەوان.

بۆ سەعات دووی دوای نیوەڕۆی سبەینێم هەروا دەقیقە ژماری دەکرد. بڕیارم دا سبەی سەر لە بەیانییەکەی بچمەوە نووسینگەی گۆڤارەکە و بەسەرهاتەکانی دەگەڵ بێنمە گۆڕێ و بە ڕێککەوتن دەگەڵ سەرنووسەری هەفتەی ڕۆژێکی داستانەکەی ڕەهای دە گۆڤارێدا چاپ و بڵاوکەینەوە.

# (٢)

شەوم بە خەیاڵی ڕەهاوە ڕۆژکردەوە. دوای چوونەوەم بـۆ بارەگـاو نووسـینگەی گۆڤارەکـە، ڕاسـت چوومە ژووری سەرنووسەر و ڕووداوو سەربردەی ڕۆژی ڕابوردوو و دیتنیّ ڕەها خاتوونیّم، هەموو بۆ گێڕایەوە. سەرنووسەر کە پیاوێکی بە ساڵداچـووی زۆر بـە ئەدەبـە زۆر بـە وردی و بەپشوویەکی درێژەوە گوێی بۆ قسەکانم شل کرد و کە لێشبوومەوە گوتی:

- ئەگەر دەزانی ئەم بابەتە بەلای تۆوە باشە و بۆچاپکردن پەسەنددەودەشـیّ، ئـەوە مـن هـیچ قسەیەکم نیە،بەلاّم تکا دەکەم پێش چاپ کردنی هەربەشـێکی، نووسـینەکانتم بدەیـەی تـا دوای سەیر کردن و پێداچوونەوەی ئەگەر بەلای منیشەوە پەسەند بوو ئەوە دەست بە چاپەکەی بکـەین، جا هەر لە مرۆ بەیانیش بەدواوە کە نووسینەکانی بەسەر هاتی ئەو خاتوونە، ئەریّ ناوی چی بوو؟

- ڕەها.

- بەڵیّ ڕەها خاتوون، دەنووسنەوە بیانخەنە بەردەستی من تا پێیاندا بچمەوەو بیانخوێنمەوە تا ئەگەر هات و باس و بابەتەکە جێی سەرنج ڕاکێشانیّ بوو ئەوە ڕێکیان خەین بۆ چاپکردنیّ.

زۆرم سـوپاس کـردن و نووسـینەکانی ڕۆژی پێـشووم خـستە بەردەسـتیان و گەڕامـەوە سەرمێزی کارەکەم.

تا سەعات دووی دوای نیوەڕۆیە خەریکی ئەنجامدان و تەواو کردنی ئـەو کارانـە بـووم کـە مابوونەوەو بەسەرمدا کەوتبوونەوەو بەتەواوی سـەعاتی سەردان و چاوپێکەوتنەکەم لە بیر چـوو بـۆوە کـە زەنگـی تەلـەفۆنێك بـەخۆی هێنامـەوە, گوشـیەکەم هـەڵگرت و دەنگـی ناغـای سەرنووسەرم بەرگوێ کەوت:

- خانمیّ ڕەزایی ئەوە هێشتا هەر لێرەی؟

بەسەر سامیەکەوە وەلاّمم دایەوە:

- بەڵیّ بۆ بڕیاربوو بچمە چ جێیان؟

- ئەوە هۆشت لە کوێیـە خـانم! ئـەدی ئێـوە بڕیـاری چـاوپێککەوتنێتان دەگـەڵ ڕەهـا خاتوونێدا نیە؟

بێ ئیختیار نوقورچێکم له روومەتم دا و سەیرێکی سەعاتەکەمم کرد، هێشتا چارەکی دەویست بۆ دوو. بەنیمچە زریکانێکەوە گوتم:

- هەر لەبیریشم نەبوو و بە تەواویشم لەبیر چوو بۆوە، خوابکا درەنگ پێ ڕانەگەم، پێم ناخۆشە هەروا لەیەکەم ڕۆژەوە بێ بەڵێن دەرچم.

دەنگی پێکەنینی ئاغای میرزایی بەرز بۆوە و هەروا بەدەم پێکەنینێشەوە گوتی:

- کەواتە کەمێك خێراکە تا لەوەی زیاتر دوا نەکەوتوویی، لەمەودوا هەموو ڕۆژێ سەعات یەك ونیو من خۆم بیرتان دەخەمەوە.

خوا حافیزیم لەو کرد و بەپەلە لەدەرکێ گۆڤارەکەی هاتمە دەرێ، بەخۆشیەوە شەقامەکان دەوکات و ساتەی ڕۆژێدا زۆر قەڵەباڵغ نەبوون ومن سەعات دوو و دە دەقیقە لە زەنگی دەرگای ماڵێ ڕەهام دا.

دوای چەند ساتێکان ڕەبابە خانم دەرگای کردەوە و فەرمووی چوونە ژووری حەسارێی لێ کردم. ڕەها لەبەر دەرکی نێوماڵێوە بەرەو پیرم هات و بە دەم سڵاو و چاك و چۆنیەکی گەرموو گوڕەوە فەرمووی ژوورێی لێ کردم، هەرکە چوومە ژووری نێو ماڵێوە گەرمییەکی خۆشی لە ئەندازە بە دەر خۆش لە دەموچاوی دام و هەستم بە خاو بوونەوەیەکی یەکجار بە تاموچێژ کرد.

ڕەها منی بردە هۆڵی میوانان، ئەمجارەیان ڕەبابە خانم هەر دوای چەند دەقیقێکان دوای چوونە ژوورەوێم بە خۆو سینییەکی زێڕلی پێچکەداری گەورەوە، دوو پیاڵەی زێڕلی و قەندانێك و دەورییە میوەیەك و شیرینی لەسەر هاتەوە هۆڵەکە لای ئێمە.

دوای پێشوازییەکی گەرموگوڕ و چاك و چۆنی و تۆخۆش و من خۆشی ڕەبابە خانێ تکام لە ڕەها خاتوونێ کرد دەست بە قسەکانی بکاتەوە.

ڕەها پیاڵەی چایەکەی خستەوە سەرسینییەکە و هەناسەیەکی هەڵکێشا، سەرنجێکی دووردرێژی تێ بڕیم و ئەوجا لەسەرخۆ و بە ئارامیەکەوە دەستی بە گێڕانەوە کردەوە:

❊ ❊ ❊

بەڵێ، ئەوەی کە نەمدەویست بڕوا بکەم، بڕوام کرد، خودایە من بۆ بەلای ئەوەوە وا هێندە هەستیار ببووم، باشە بۆ مەگەر ئەو کێ بوو؟ ڕاستیەکەی ئەوم بۆ هێندە بە لاوە گرینگ بوو؟ ئیدی ئاگام لە خۆم نەمابوو، دە تەواوی ئەو دانیشتن و میوانداریەیدا بە بیانووی جۆراوجۆرەوە دەچوومەوە حەسارێ تا بەڵکە ئێ ئەوە خوایە دووبارە چاوم پێی بکەوێت و ببینمەوە، تا

ـِـتریشم ئومێد دەدیت لە جارانی پێشووترێی زیاتر دڵتەنگ و شێواوتر دەکردم. مـن ئاگـام ـحۆم نەمابوو ئەوەشم دەزانی کە ئەویش حاڵی لە حاڵی من باشترنیە. هەر جارێکیش کـە بـە ـێکەوت تووشی یەك دەبووین وەك کارەبا گرتوویەك هەردووکمان لەو ناوە هەڵـدەهاتین، بـەڵام هێندەی واشی پێنەدەچوو کە پەشێمان دەبوومەوە. بۆیە زیاتر ڕانەوەستام و سەیرم نەکرد.

کاری هەردووکمان بووە سەیرکردنی یەکتر بە دزیەوە. چەند جارێکانم هەروا بە ڕێکەوت چاو تێ هەڵەنگوت زانیم ئومێدیش سەیری من دەکا. هەرکە چاویشمان تێـك هەڵەنـدەگوت خێـرا سەرنجەکەی دەدزیەوە و بەرەولایەکی دیکەیەوە دەڕوانـی. بـەڵام دیـاریش بـوو کـە تۆفـانێکی ـەدڵیدا هەڵـستاوە. هیچمان غیرەتی ئەوەمان نەبوو یەکتر بدوێنین و ئەوەشمان بۆ چاوەکانمان جـێ هێشتبوو و بە زمانی دڵ و چاو پێکترمان دەگوت کە خۆشمدەوێی.

ناهەنگی بووکێنیەکە تەواو بوو و بووك وزاوا دەگەڵ نزا و سەڵاواتاندا وەك دووکۆتری سپی بەرەو هێلانەی بەختەوەریانەوە هەنگاویان هەڵێنان.

وردە وردە میوانەکان ماڵئاوایییان کردو بەرەو ماڵ بوونەوە، ئومێد و پیاوەکانی دیش دەرو حەساریان کۆدەکردەوە و هەڵیاندەوێژارد. دایك و بابیشم وردە وردە خۆیان بۆ چوونەوەی مـاڵێ ئامادە دەکرد، دەدڵی خۆمدا نزام دەکرد بابە گەورە داوا لە بابم بکات ئـەو شـەوە لـەوێ بـێن، بەڵام لە بەدبەختیە من بابەگەورە هێندەی سەرقاڵ بوو نەپرژایەوە سـەرمە و ئاگـای لـە ئێمـە برابوو بۆیە هیچ پرکێشیەکی مانەوەی مەی نەکرد.

بە نابەدڵیەوە هاتینەوە ماڵێ، بەڵام ئەمجارەیان هەر لاشەکەم بوو هاتبۆوە ماڵێ دەنا گیـانم لە ماڵێ بابە گەورەی مایەوە. دەمی ماڵئاواییە تەواوی ئەوانەی لە مـاڵێ بابەگـەورەی بـوون هەموو لە بەردەرکی ماڵێ خڕببوونەوە تا ئێمە بەڕێ کەنەوە.

دەونێوەنیدا من تەنیا بە دوای ویدا دەگەڕام و لەپڕ دیتم ئەوە لە لایەکیەوە ڕاوەستاوە و بـە بێدەنگی سەیر دەکات و دەڕوانێ. ڕاست دەوساتەیدا کە سـەیری ویـم دەکـرد ئـەویش بـە لای منیدا ڕوانی و هەردووکمان وەك جارەکانی دی چاومان لێك هەڵبواردن.

بابم تەوقەی دەگـەڵ یەکەیەکـەی ئەوانـەدا دەکـرد کـە بـۆ بـەڕێ کردنێمـان ڕاوەسـتابوون و ماڵئاوایی لێ دەکردن تا گەیە سەر ئومێدی. ئەو زۆر خاکەڕایانە هاتە پێشێ و دەستی بەرەولای بابمەوە درێژکرد و ماڵئاوایی کرد. بابەش بە زەردەخەنەیەکەوە ڕووی تێکردو پێی گوت:

- خوا حافیز کوڕەکـەم، بەڕاسـتی سوپاسـت دەکـەم ئـەوڕۆ زۆرت زەحمـەت کێشا و زۆرماندوو بووی.

ئومێد بە ئەدەبانەوە زەردێکی هاتێ و گوتی:

- هەرچی کردوومە ئەرکی خۆم بووە، هەرچەندە هیچی واشم نەکردووە.

هەفتەیەك بێ باس و خواس و هەواڵی ئومێدی تێپەڕی. هەموو ڕۆژێکی هەر بە هیـوای ئەوەی کە بەیانی ئومێدی دەبینم، بەسەر دەبرد تا ئەو ساتە چاوەڕوانکراوە هات. ئـەو ڕۆژە عەسرێ تازە لە خەوی دوای نیوەڕۆیە رابیووم کە زەنگی دەرگای ماڵێ بلندبوو، سالار بەرەو حەسارێوەی راکرد تا دەرکێ بکاتەوە. بێ ئێختیار دڵم دەستی بە لێـدانێ کـرد. هەسـتێك پێی گوتم خۆیەتی، ئەوەی هەفتێکە چـاوەڕێی دەکـەی، لـە پـشت دەرکـێ راوەسـتاوە. بـە هەنگاوی لەرزۆکەوە بەرەو حەسارێوە چووم. سالار دەرکەی کـردەوە و دەگـەڵ ئـەوەی پـشت دەرکێوەی دەست بە قسان کرد، خودایە دەنگەکەی خۆی بوو، هەمان ئەو دەنگە پڕ ئاوازە لە دڵان، خۆشەکە.

بۆ ساتەوەختێك دوو دڵ مام کە دەبێ چ بکەم، بەرەو لای دەرکێوە بچم یا راکەمەوە ژووری و بچم خۆم بشارمەوە؟ لەوەی دەترسام کە نەکا ئەویش پـەی بـە نهێنـی نـاخم بـەرێت و چـیم دەدڵێدایە بیخوێنێتەوە. رووم وەرگێڕایەوە تا بەرەو نێو ماڵێوە بچمەوە کە دەنگی سـالاری لـە جێی خۆمی چەقاندمەوە:

- رەها ئەو ئاغایە هاتووە ئیشی هەیە دەڵێ با یەکێکی گەورەترت بێتە بەردەرکێ. ناچـار بەرەو لای دەرکی حەسارێوە چووم دەرگاکەم بە تەواوی خستە سەر پشتێ، لـە جـارانم جـوان و دلکێشتر هاتە بەرچاوان. هەر جارێکیش کە دەمدیتەوە بەلای منەوە لە جاری پێشترێ جوان و دلکێشتر بوو و زیاتریشی شێت و شەیدا و شێواوی خـۆی دەکـردم. بـە دەنگێکـی لەرزۆکـەوە سلاوم کرد و ئەویش دەستوبرد و خێرا سەلاوی کردەوە و بەبێ راوەستان درێژەی دایە:

- ببوورن کە موزاحیم بووم، خاڵە رەزا رایسپاردووە کـە ڕۆژی سـێ شـەممە ئەگـەر پێتـان دەکرێ و چ بەرنامەیەکتان نییە هەموو لە هەموو تەشریف بێننە بـاغی شـەمیرانات و خـاڵ و خاڵۆژنم لەوێ دەخزمەتتان دان.

بە سەرسامیەکەوە گوتم:

- سێ شەممە نابێ ئێمە دەبێ بچینە قوتابخانە.

- ئومێد زەردەیەکی هاتێ و وەلامی دایەوە:

- دەڵێی سەیری ڕۆژ ژمێرێت نەکردووە ڕۆژی سێ شەممە پشووە. بێ ئیختیـار زەردەیـەکم هاتە سەر لێوان. سەرم بەردایەوە و گوتم:

- بەڵێ، ڕاستدەکەن من ئاگام لێ نەبووە، بە دڵنیاییەوە من ڕاسپاردەکەتان بە دایکم و بە دەڵێم بەڵام بەر لەوە تکا دەکەم فەرموونە ژووری، ئێرە چ نییە. ئومێد سوپاسی کرد و منیش دوای خواحافیزی و بەڕێ کردنیی هاتمەوە حەساری، لە خۆشیان دەکەوڵی خۆمدا جێ نەدەبووە، من قسەم دەگەڵەویدا کرد بوو و ئەویش چەند جوان دەدوا.

دەنگی دایکم بەخۆی هێنامەوە:

- ئەوە کێ بوو ڕەها؟ چ ئیشێکی هەبوو؟

هەر بە ڕاکردنەوە بەسەر پلیکانەکاندا سەرکەوتم و گوتم:

- ئومێد بوو خوشکە زایەکەی کاك ڕەزا.

دایکم سەیرێکی رووە خۆش و دەمە بە پێکەنینەکەی کردم و گوتی:

- دیارە هەواڵێکی خۆشی پێ بوو کە وا هێندە شاد و دڵخۆشی.

پێکەنیم و گوتم:

- بەڵێ، لەلایەن کاك ڕەزاوە هاتبوو تا بۆ سێ شەممەمان داوەتی باغی شەمیرانات کەن.

دایکم گوتی:

- دەی تۆ چ وەڵامێکت دایەوە؟

- من هیچم نەگوت، تەنیا دڵنیام کردەوە کە ڕاسپاردەکەی کاك ڕەزای بە ئێوە و بە بابم رادەگەیەنم.

دایکم لە رووی رازیبوو نێوە زەردەیەکی هاتێ و گوتی:

- چاکت کرد با بزانم بابیشت دەڵێ چی، لەوانەیە سەرقاڵی ئیش و کاران نەیەڵێ داوەتەکەی کاك ڕەزای قبوڵ کا.

بە نیگەرانیەوە چاوم دە دەمی داکێوە بڕین و گوێشم لە قسەکانی راگرتبوو بە دڵەڕاوکێیەکەوە پرسیم:

- یانی لەوانەیە بابە وا بکا؟ بەڵام بە لای منەوە ئەوە شتێکی ناشرینە داوەتەکەیان ڕەتکەینەوە.

دایکم کە پێدەکەنی بە توندی کێشای بە پشتمدا و گوتی:

ڕەتکردنەوەی پێشنیار و داوەتەکەی کاك ڕەزای ناشیرینە یان تۆ نارەحەت دەکا؟

سەرم بەردایەوە و گوتم:

- ئاخر من حەز دەکەم باغی شەمیراناتی کاك ڕەزای ببینم.

دایکم بەرەو لای مەتبەخێوە چۆوە و هەروا بەو حاڵەوە پرسی:

- ئومێد نەیگوت بێجگە لە ئێمە کێی دیش داوەت کراوە؟

سەرم بە نیشانەی نەرێوە بادا و گوتم:

- نەخێر نە ئەو هیچی گوت و نە منیش پرسیم.

لە دایکم جودا بوومەوە و چوومەوە ژوورەکەی خۆم، خوێندنـەوەم کـردە بیـانوو تـا چـەند سەعاتە وەختێك بە تەنێی بە سەربەرم. لە خۆشیان دەپێستی خۆمدا نەدەحەجمیم، ئەمڕۆ من و ئەو پێکەوەمان قسەکرد بوون و دەنگە دڵ نەوازەکەی گیانێکی تازەی بە بەر داکردبوومەوە.

لەسەر جێیەکەم راکشام و دەبن ساپیتەیەوە رامام. ساتەکانی روو بەروویـە مـانم دەگەڵـە ویدا دووبارە وسێ بارە هێنانەوە بەر چاوی خـۆم و ئـەو سـاتە شـیرینانەم هـەموو بەرجەسـتە کردنەوە. دەو ساتانەدا حەزم دەکرد زەمان لە جیاتی ئەوەی بەرەوپێش بچێ بۆ دواوە بگەڕێتەوە تا دووبارە ئەو چەند دەقیقانە دووبارە ببنەوە، بەڵام دەشمزانی کە هەرگیز شتی وانابێت، ئـەوجا دەستم بەنزاوە پان کردەوە تاهەم بابم داوەتەکەی کاك رەزای قبوڵ کات و هەم سێ شەممەش کاك رەزا ئومێد و ماڵەوەشیان هەموو داوەت کات.

نازانم بۆ کاك رەزا هەر بۆ خۆی ئێمەی داوەت نەکرد بوو، یا هەر تەلـەفۆنێکی نـەکردبوو، بەڵام هەرچی بوو لەبەر هەر هۆیەك بوو هەرگیز بەلامەوە گرینگ نەبوو، گرینگ دیتنی ئومێد و بیستنی دەنگی بوو کە ئەوانەش بوون.

لەسەر جێیەکەم هەستامەوە و بەرەو لای رۆژ ژمێرە سەرمێزیەکەمەوە چووم و کەوتمە پەڕە هەڵدانەوێی، سێ شەممە بە بۆنەیەکەوە پشوو بوو، چۆن لە پشووی رۆژی سێ شەممە بێ ئاگابووم بۆ خۆشم نازانم، منێك کە هەمێشە بەسەر بەرواری پشووەکاندا دەهاتم و پـشووی مانگـەکانی دواترێشم هەموو دەردێنان چونکە بۆ هاتنێ رۆژە پشووەکانم دەقیقە ژمێری دەکردن، دەو تاکـە هەفتەیەیدا هێندە بـە تاسـەی دیتنـێ ئومێدیـەوە دەسـووتام کـە لـەو بـاس و بابەتـەی بـەو گرینگیەیەوە بێ ئاگا ببووم.

هێشتا دوو رۆژی مابوون بۆ سێ شەممەی. نەمدەزانی ئەو رۆژانە چۆن بەسەر بەرم. لەوانەش گرینگتر هەر دەپاڕامەوە بابم داوەتەکەی کـاك رەزای قبـوڵ کـا و هـیچ بیـانووێکی بـۆ داوای لێبووردنێ نەدۆزێتەوە.

لەسەر مێزی نووسینەکەم دانیشتم و کتێبەکـەم لێـك کـردەوە، ماوەیـەك چـاوم دە پـەڕەو هێڵەکانیەوە برین بەڵام وەك بڵێی هەر نایانبینم و وشەکانی هەموو بێ مانا بوون.

دەنگی دەرکی حەساریٚ لەو دنیای خەیاڵانەی هێنامەوە دەرێ. لە پەنجەرەی ژوورەکەمڕا سەیرێکی حەساریٚ کرد، بابە بوو کە بە باوەشێك میوەوە هاتە حەسارێ. لەبەروەی هەردوو دەستەکانی گیرابوون بانگی سالاری کرد تا هێندێك لەو شتانە بەو بسپێرێ. دەستبەجێ لە ژوورەکەمەوە دەرپەڕیم و بە ڕاکردنەوە بەرەو حەسارێوە چووم بە دەنگێکی بەرزەوەم بەخێرهاتنەوە کرد:

- بابە بەخێرێیەوە و ماندوو نەبی، کۆمەکت ناوێ؟

بابە زەردەخەنەیەکی کرد و بە میهرەبانییەکەوە وەڵامی بەخێرهێنانەوەکەی دامەوە:

- سوپاس کچەکەم ئەگەر خۆبەخشێك هەبێت دەفریام کەوێ دیارە پڕ بەدڵ حەزدەکەم، بەتایبەتیش ئەگەر ئەو خۆبەخشە کچێکی جوانی وەك تۆ بێت.

بە پەلە هەردوو پلیکانەم بە یەکێکی دەبڕی و هاتمە خوارێ و زەرفە نایلۆنەکانم لە دەست بابەی وەرگرتن. بابە بەرەو لای دەرکی حەسارێوە گەڕایەوە و هەردوو لادەرکەکانی خستنە سەر گازەرای پشتێ تا بتوانێ ئوتومبێلەکە بێنێتە نێو حەسارێوە. زەرفە نایلۆنە پڕمیوەکانم بردنە مەتبەخێ و لەسەر مێزێم دانان. دایکم بەدیتنێ میوەکان هاوارێکی نارەحەتیەی کێشاو گوتی:

- دیسانەوە بابت میوەی کڕیوەتەوە من نازانم ئەو پیاوە بۆ هێندە دەست بڵاو وپەرتە؟ هێشتا میوەی پێشوومان هەرماوە و من نازانم چ لەو هەموو میوەی بکەم و لە کوێی دانێم؟

دەو ساتەیدا بابە هاتە ژووری مەتبەخێ و بە زەردەخەنەوە گوتی:

- چ جێیەك لە سندووقچەی زگمان چاتر، ئەگەر ئێوە میوەکان لەبەردەمی من و منداڵەکان دادەنێن دڵنیابن هەرگیز نیگەرانی جێی میوە لێ دانانێ نابن.

دایکم بەرەو لای بابەیەوە ئاوڕدایەوەو بەدەم زەردەخەنەوە گوتی:

- سڵاو، دڵنیام کە زۆر ماندووی دانیشە با بەچایەکت بەخێرهاتنەوە بکەم.

بابە هەروا کە کورسییەکی بەرەو لای خۆیەوە رادەکێشا گوتی:

- ڕاستیەکەی ئەوڕۆ کاك ڕەزام دیت.

من و دایە هەردووکمان پێکەوە بەلای بابەیدا ئاوڕمان دایەوەو یەك دەنگ گوتمان:

- کاك ڕەزات دیت؟

بابە بەسەر سامیەکەوە سەیرێکی کردین و گوتی:

- هیچ بووە؟ من قسەیەکی نابەجێم کردووە؟

دایە پێکەنی و وەڵامی دایەوە:

- ئا بۆ واتزانی؟

بابە گوتی:

- ئاخر هەردووکتان پێکەوە یەك جێ ئاوڕتان لێدامەوە و من وامزانی قسەکەم نابەجێ بووە؟

من و دایە هەردووکمان پێکەنین و مەسەلەی هاتنی ئومێدمان بۆ بابەی گێڕایەوە و دوای تەواوبوونی قسەکانی دایەی بابە زەردەیەکی هاتێ و گوتی:

- بەڵێ کاك رەزا رۆژی سێ شەممە ماڵەکانی فەرزادو براو خوشکەکانی هەموو داوەت کردوون، ئەلبەتە دایە و بابەشی هەر داوەت کردوون، بەڵام دایە داوەتەکەی رەت کردۆتەوە و ئەساغی کردۆتە بیانوو و ئەم باسەش بۆتە رەنجانی فرانك و رەزای.

دایە بە ئاوازێکی نارەزاییانەوە گوتی:

- دایە گەورە هەر وایە ئەگەر داوەتی کەن بیانووان دێنێتەوە و ئەگەر پێشی نەڵێن گلەییان دەکا...

من هاتمە نێو قسەکانی دایکمەوە و گوتم:

- ئەدی ئێوە چتان بەکاك رەزا گوتۆتەوە؟

بابە کەپیالە چایەکەی هەڵدەگرت گوتی:

راستیەکەی منیش نیازم بوو داوەتەکەیان رەتکەمەوە بەڵام کە زانیم دایە گەورەش داوەتەکەی رەتکردوونەوە و بۆتە هۆی رەنجانی دڵی رەزای وام بە باش زانی منیش نەبمە سەرباری نارەحەتییەیان و داوەتەکەیانم قبوڵ کرد و گفتم دا کە رۆژی سێ شەممە هەر بچینە باغەکەیان.

راحیلە و رەیحانەش بەو هەواڵەی زۆر دڵخۆش بوون بەڵام هیچ کەسێك هێندەی منی پێ خۆش نەبوو چونکە ئیدی دڵنیابووم کە ئومێدیش هەر دێ و منیش دەیبینم.

تا رۆژی سێ شەممە ئیدی ئەوە بەردەوام نەخشەم دەکێشا و ساتەکانم دەژماردن. مامە فەرزاد دەگەڵ یەکتریاندا بڕیاردابوو تا هەموو پێکەوە سەعات حەوتی رۆژی سێ شەممە لە جێیەکی دیاریکراوەوە بڕۆین و هەموو پێکەوە بچینە باغیەوە.

سالار تۆپە فوتبۆڵەکەی خۆی هێنابوو و راحیلە و رەیحانەش هەر راکێتی تێنسەکەی خۆیان پێبوو، من هیچم بۆ گەمەو یاری و رابواردنێ رەبەرچاو نەگرتبوو چونکە دەمزانی کە مەلیحە هێندەی قسەپێن ئیدی هیچ بۆ گەمەو گاڵتە و رابواردنێ نامێنێتەوە. جگە لەوەش حەزم نەدەکرد ئەو سەعاتەی کە دەمتوانی بەدزیەوە ئومێدی تێدا سەیرکەم بە گەمەو گاڵتەو رابواردنێوەی بەسەربەرم و کاتەکە بەفیڕۆدەم.

ئەو دوو رۆژانەم رێك بە دوو سالآن لێ رۆیشتن تا ئاخیرەکەی رۆژی سێ شەممەکە هات، سەعات شەشی بەیانی بەدەنگی بابمەوە هەموو لەخەو رابوون.

بەبێ راوەستان یەکسەرە قاوەلتی ئامادەکرد و هەموو لەسەر مێزی نانخواردنێ بەیانی ئامادەبووین بەلآم کەس ئیشتیایەکی وای نانخواردنێی نەبوو.بەلآم بە پرکێشیە باب ودایان هەریەکەو چەند پارووە نان و پەنیرێکمان بەناچاریەوە گلاندو مێزەکەمان بەجێهێشت. هەریەکەو بە ئیشی خۆیەوە خەریك بوو و خۆیان بۆ رۆینێ ئامادە دەکرد.

سالار بە شەیتانیەوە هەروا ئەو رۆژەی لە پێشمان بوو دەدوا و جاروبارەش بە شەیتانیەکانیەوە راحیلە و رەیحانەی وەهاوار و زالە دێنان. دوای ئامادەبوونێ هەموو لە هەموو سواری ئوتومبێلێ بووین و وەرێ کەوتین.

گەیشتینە ئەو جێیەی کە بابە و مامە فەرزاد دایاننابوو بەلآم ئەوان هیچیان دیارنەبوون. دایە رووی دە بابەی کرد و پرسی:

- دلنیای کە مەبەستی ئاغا فەرزادی ئێرە بووە؟

بابە بە دلنیاییەوە سەرێکی لەقاندو تەماشایەکی دەورو بەرێی کرد.

- هێشتا هەر زووە، بۆ خۆشت عادەتی براژنێم شارەزای ئەو کاتەی پەلەیەتی نیو سەعات درەنگتر دوای هەمووان ئەوجا لە مالێ وەدەر دەکەوێ.

لە ئوتۆمبێلێ دابەزیم و لەو ناوە کەوتمە راوێچکان، هەروا بە دوای منیشدا راحیلە ورەیحانە و رازییە و سالاریش دابەزین و کە چارەکە سەعاتێکیش رابردو هەر دەرنەکەوتن سالار چوو تۆپەکەی لە ناو ئوتۆمبێلەکەوە هێناو وردە وردە کەوتینە گەمان. یارییەکە گەیبووە ئەو پەرێ گەرمبوونێ کە ئوتومبێلەکەی مامە فەرزادی لە دوورەوە دەرکەوت و بەهات و هاوارەوە هات لەلای ئێمەوە راوەستا.

بابە و دایە دەگەل مالێ مامەی کەوتنە چاك و چۆنی و ئەحوالپرسیە. مەلیحە و مەنسورە حەزیان لیبوو دابەزن بەلآم مامۆ نەیهێشت و داوای لێکردن یارییەکە بەرنە نێو باغی. بابەش بانگی کردینەوە و هەموومان سوار بووینەوە و رۆیشتین.

سەعاتێکی نەبرد کە دە باغی کاك رەزایدا دەست و مستی یەکتر بووین و دەگەل پوورە فرانك و خاوخێزانەکانی دیشدا کەوتنە ماچ و موچ و ئەحوالپرسیە. خێزانی برا و خوشکەکانی کاك رەزا لە پێشەمەدا گەیبوونە وێ، من دەنێو ئامادەبووەکاندا بە چاوی مشتەریەوە لە ئومێدی دەگەرام بەلآم نەمدیتەوە. پوورە فرانك هەمووی بانگ کردنە سەر سفرەی قاوەلتیە،

هەریەکە و جێیەکی هەڵدەبژارد و لەبەر سفرەکەوە دادەنیشت، هێشتا یەك دوو دەقیقەی نەبردبوو بوونە دووبەش پیاوەکان لەلایەك و ژنەکانیش لە خوار سفرەکەوە دانیشتن و هەریەکەیان سەرقاڵی کارێك بوون. کاتێ کە پوورە فرانك فەرمووی سەر سفرەی لە هەمووان کرد بە خۆشحاڵیەوە بەو هیوایەی کە ئومێدیش دێتەوە بەدەم فەرمووەکەیەوە چوومە سەر سفرە و لە تەك مەلیحەوە دانیشتم بەڵام ئومێد سووسەیەکی هەرنەبوو. سەیرێکی دەوروبەرەکەم کرد بەڵام ئومێد هەر نەبوو و جێیە چۆڵەکەی ئازاری دەدام.

لە پرسی بابمەوە لە ئاغای موحسینی دەربارەی ئومێدی بە یەکجارەکی تەواوی خۆشی و شادییەکەم بە ناکامی گەڕا، ئەو دەمی زانیم کە ئومێد دوو ڕۆژ پێش ئێستا بۆ ئیشێکی چۆتە مەشهەدێ. بۆیە ئەو ئەوڕۆ نایەتە باغی، دەگەڵ ئەوەشدا کە زگم خۆی دەخواردەوە لە برسان بەڵام ئیشتیام نەما و ئارەزووم لەسەر قاوەڵتیەکەی لاچوو.

هێندە نارەحەت ببووم گریانم لە ئەوکێدا مابۆوە، ئەو دوو ڕۆژەشم بە خۆڕایی چاوەڕوانی کێشابوو. ئیدی هۆی ڕۆیشتنی ئومێدیم لە قسەکانی بابیەوە کە بۆچی چووە نەدەبیست. چەند پاروویێکم نان و کەرە خوارد و لە جێوە هەستام، پرکێشیەکانی پوورێش نەیانتوانی دامنیشێننەوە، بێ ئامانج کەوتمە گەڕانێ دەباغیدا. مەلیحەش هاتە لای منەوە و پێکەوە دەباغیدا کەوتینە گەڕانێ. ئەو بە شۆڕو شەوق و تاسەوە دەربارەی دەزگیرانەکەی دەدوا و یەکرێزو بێ پسانەوە باسی دەکرد و ئەو ساتە خۆشانەی پێکەوەیانی دەگێڕانەوە کە بەسەریان بردووە و ڕایانبواردووە بەڵام من هەرگیز حەزم لە قسەکانی ئەو نەبوو و سەر نێشەم کردە بیانوو و هاتمەوە لای گەورەکان.

دایکم دەگەڵ پوورێ و خانمەکانی دیدا سەرقاڵی ئامادەکرن و لێنانی چێشت و نانی نیوەڕۆیە بوون. بابە و ئاغای موحسینی سەر گەرمی یاریی شەترەنج بوون و مامە وکاك ڕەزاش خەریکی قلیان (نێرگەلە) کێشانێ. برایەکەی کاك ڕەزای سەیری یارییەکەی بابە و ئاغای موحسینی دەکرد و پێی دەگوتنەوە. ماوەیەکم تەماشای ئەوان کرد بەڵام حەوسەڵەی وانیشم نەبوو. چوونەوە ناو ژن و خانمەکانیشم لە گوێ گرتنێ قسەکانی مەلیحەی پێ چاکتر نەبوو. چوونەوەشم بەرەو ئەولایەی کە مەلیحەو کچەکانی لێبوون، دیسانەوە وەك مریشکی سەربڕاو ئوقرەو ئارامم نەبوو و حەزم لەوێش نەدەکرد. تا وەختی هاتنی ناخواردنی نیوەڕۆیە گویم بۆ زۆر بلێیەکانی مەلیحەی شل کرد. بە دەنگی کاك ڕەزای کەهەمووی بۆ ناخواردنێ نیوەڕۆیە بانگ دەکردنەوە بەرەولای گەورەکان و خانووە جوانەکەی باغیەوە کەوتینە ڕێ. بەبێ

تاقەتیەوە هەنگاوم داویشتن و شەقم لە بەردەکانی بەرپێم هەڵدەدا و بەولاولایانمدا بڵاو دەکردنەوە کە لەپڕنەوم دیت. بەڵێ، ئومێد بوو کە دەهاتە نێو باغیەوە و بەدەم پێکەنینەوەی بەرەولای مە هەنگاوداویشتن، بێ ئیختیار زەردەخەنەم کەوتەوە سەر لێوان وبە هەنگاوی خێرا و هەراو ترەوەم بەرەو خانووەکەی باغیەوە هەلینگ دان و رۆیشتم. لەیەك کاتدا و پێکەوە دەگەڵ ئومێدی گەیشتینە بەر دەمی خانووەکەوە، ئەوانیدیش بە دیتنی ئومێدیەوە هەر شادو خۆشحاڵ بوون. ئومێد بە ئەدەبەوە دەگەڵ تەواوی ئامادەبووانی چاك و چۆنی و ئەحوالپرسی دەکرد دوایەش زۆر لە سەرخۆو بە هێوری وەڵامی پرسیارەکانی دایك و باب و خاڵ و خالۆژنێی دەدایەوە. ئومێد لە وەڵامی ئاغای موحسینیدا کە دەربارەی زوو هاتنەوێی پرسیار دەکرد وەڵامی دایەوە:

- چونکە دەمزانی بەبێ من خۆشتان لێ ناگوزەرێ هەر دوای تەواو بوونی کارەکانیشم یەکسەر دەگەڵ یەکەم هەستانی فرۆکەی تارانێ گەڕامەوە تا لە خۆشیە ئێوە بێ بەش نەبم. ئاغای موحسینی بەدەم پێکەنینەوە ئومێدی بانگ کردە ناخواردنێ نیوەڕۆیە. ئەوجا هەموو دەگەڵ ئومێدیەوە دەورەمان لەسفرەی دا و ئەمجارەیان بە پێچەوانەی قاوەڵتی بەیانیەوە زۆرم ئیشتیای خواردنێ کرایەوە

چەندین جارمان چاوتێك هەڵەنگوتن بەڵام هەموو جارێش یەکسەر رێچکەی سەرنجەکانمان بەرەو لایەکی دیپەوە دەگۆڕی. لە دڵەوە جنێوم بە خۆم دەدان ((ئەدی چاوەڕێی نەبووی، ئەدی بۆ لە سەرنجەکانی هەڵدێی؟)) بە پێچەوانەی کاتێ هاتنێمان بۆ باغی کە وەخت زۆر بەسستی دەڕۆیی دوای ناخواردنێ دەقیقەکان پێشبڕکێیان بوو دەگەڵ یەکتریداو کات بەو پەڕی خێراییەوە تێدەپەڕی. هەوا کەم کەمە بەرەو تاریکیەوە دەچوو کە بابە داوای لە دایە کرد تا ئامادەی رۆینێ بێ.دوای سەعاتێك ماڵئاواییمان لە تەواوی میوانەکان کرد و من بە هیوای دووبارە دیتنەوەی وی باغی شەمیراناتم بەجێ هێشت و بەرەو ماڵەوە بوومەوە و بیرەوەری ئەو چەند ساتانەشم لە کەلێنێکی دڵی خۆمدا هەڵگرت و شاردمەوە.

دوو مانگ تێپەڕی دە و دوو مانگانەمدا دووجاری دیش ئومێد دیبۆوە. بە بیانووی زۆر جیاجیاوە دەهاتە بەردەرکێ ماڵێمان، جارێکیان سەڵاوی پوورێی دێنا و جارێکی دیکە دەیگوت:

- بە تەمام بچمە ماڵێ خاڵە رەزای ئاغا فەرهاد کارێك پەیام و راسپاردەیەکتان هەیە...

و بابە پێدەکەنی و دەیگوت:

- هەروا دوو رۆژ پێش ئێستا فرانك و رەزام دیون، نەءسوپاس هیچ ئیشێکمان نیە کوڕەکەم.

کۆتایی مانگی نوردیبە هەشت بوو و تاقیکردنەوەکانی کۆتایی ساڵ تا دەهات نزیك دەبوونەوە من کە دەو دوا دواییانەدا حاڵ و باڵێکی لە بارم نەبوو و هۆشم لە هەموو جێیەکی بوو تەنیا لەوانە و خوێندن و قوتابخانە نەبێ، لە وانەی ئینگلیزی لە جاران لاوازتر ببووم هەر بۆیە داوام لە بابم کرد مامۆستای تایبەتیم بۆ بگرێ تا بەڵکە ئەو دواکەوتنانەم قەرەبوو و پڕکەمەوە.

بابم قبوڵی کرد و بڕیار بوو لە مامۆستا تایبەتییەکەی سالاری داواکا تا ئەگەر کەسێکی پێ شك دێ بۆ وانە گوتنەوەی بەمن دەگەڵە خۆی بێنێتەوە ماڵێ.

زۆر خۆشحاڵ بووم بەجۆرە دەمتوانی دواکەوتنەکانم قەرەبوو کەمەوە. داوام لە دەستە خوشکە زۆر خۆشەویستەکەشم شیرین کرد کە ئەگەر حەزی لێیە بێ دەگەڵە مندا گوێ لە مامۆستای وانەی تایبەتی بگرێ. شیرین ئەو پێشنیارەی منی زۆر پێخۆش بوو و پێکەوە بڕیارمان دا ئەویش بێتە ماڵی ئێمە و پێکەوە سوود مەند بین.

مامۆستایەکی کە ئاغای رەزایی مامۆستای تایبەتی سالار دۆزیبوویەوە ناوی حەمید سادیقی بوو، حەمید لاوێکی زانکۆیی بوو کەلە هونەرە جوانەکاندا دەیخوێند و بۆ دابین کردنی خەرجی خوێندنی خۆی وانەی تایبەتیش بڵێتەوە. ئاغای سادیقی قبوڵی کردبووکە هەفتەی سێ وانە بە من و شیرین بڵێتەوە. ئاغای رەزایی و ئاغای سادیقی هەموو جارێ پێکەوە دەهاتنە ماڵێ مە. سەرەتا هەردووکیان پێکەوە لە ژووری کارەکەی بابم و ئاغای رەزایی مەشقی بە سالار دەکرد و دەگەڵیدا بەوانەکاندا دەهاتەوە و دوای سەعاتێکیش ئاغای رەزایی و سالار لە ژوورێ دەهاتنە دەرێ و دەچوونە هۆڵی میوانان و ئەوجار من و شیرین دەچووینە ژوورەکەی بابم و بەخێر هاتنی ئاغای سادقیمان دەکرد. هەمیشە کاتی وانە خوێندنێ رووبەرووی سەر و چاوە وشك و زبرەکەی ئاغای سادیقی دەبووینەوە. ئاغای سادقی جگە لە مەسەلەی وانە و خوێندن رێی هیچ جۆرە قسەو گفتوگۆیەکی نەدەدا و دەبوو تا کۆتایی وانەکە تەنیا دەربارەی وانەو راهێنانەکان قسە کرابایە، دەنا لەوە ترازابایە رێگا بە هیچ قسەیەکی دی نەدەدرا.

هاتو چۆی ئاغای سادیقی و ئاغای رەزایی بۆ ماڵێ مە هەروا بەردەوام بوو. هەم من و هەم شیرینیش پێشکەوتنێکی بەرچاومان دەوانەی ئینگلیزیدا دەخۆماندا هەستدەکرد. بە شێوەیەکی وا کە دەقوتابخانەدا زۆر بەسانایییەوە گیروگرفتی قوتابییەکانمان چارەسەر دەکردن و هەردووکیشمان لەم بارەیەوە زۆر ئاسوودە بووین.

دوو سێ رۆژی زیاتر نەمابوو بۆ تاقیکردنەوەی ئینگلیزی و ئەو رۆژەش ئاغای سادیقی هاتنەوە ماڵێ مە تا وانە بەمن و شیرین بڵێتەوە. ئاغای سادیقی دەیگوت لە شێوە و جۆری

تنەکەی تۆ و شیرین رازی نیم و بە دڵم نیە، من چاوەڕێی ئەوە بووم ئێوە زۆر لەوە
ـ ـ بەرەو پێشتر چووبان.
ئەو رۆژە ئاغای سادیقی داوای لە شیرینێ کرد تا لاپەڕەکە بە دەنگێکی بەرزەوە بخوێنێتەوە
و لەکاتی خوێندنەوەشدا هەوڵ بدا هیچ هەڵەیەکی نەبێ، شیرین سەرقاڵی خوێندنەوێ بوو و
منیش هەموو هەست و هۆشێکم خستبووە سەر ئەو لاپەڕەیەی کە شیرین دەیخوێندەوە. هەموو
ـشـ هەر گوێ بوو. شیرین وشەیەکی بەهەڵە بە زمانیدا هات بەلام ئاغای سادیقی گوێی
ـەدایە و بۆی راست نەدەکردەوە سەرم هەڵێنایەوە تا هەڵەکەی شیرینێ بە ئاغای سادیقی
بڵێمەوە، کەچی کە دیتم ئاغای سادیقی ئەو سەیری من دەکا. بە پەلە سەرم بەردایەوە، بەلام
ئەو رۆژە تا کۆتایی وانەکە نەوێرام سەرم هەڵێنمەوە.
ئەو سێ رۆژەی کە بۆ تاقیکردنەوەی زمانیش مابوو وابریاربوو کە ئاغای سادیقی هەموو
رۆژێ بێتەوە ماڵێ مە و لە وانەی ئینگلیزیماندا دەگەڵ خەریك بێ.
بەیانی ئەو رۆژە ئیدی سەرنجەکەی رۆژی پێشووی ئاغای سادقیم لەبیرچوو بۆوە و زۆر سادە
و ساکارانە و هەروەك جاران کەوتینە مەشق و راهێنان حەل کردنێ. لە کۆتایی ولێبوونەوەی
سەعاتی وانەکەماندا بووین وئیدی زۆریش ماندوو بووم. سەرم بەرزکردەوە سەیری سەعاتەکەی
سەردیواری کەم تا بزانم وانەکە چەندی ماوەکە سەرنجەکانی ئاغای سادیقی لەجێی خۆیان وشك
کردم، یەکسەر سەرنجەکانم دزینەوە بەلام تا کۆتایی وانەکە ئیدی هیچ تێ نەگەیشتمەوە...
دوایین رۆژی تەواو بوونێ وانەکان بابم بۆ سوپاسکردن و پاککردنەوێ حیسابان هاتە ژوورێ
و ئاغای سادیقیش هەر لەلای بابم داوای لێکردم تا دوای تاقیکردنەوەکان لە ئەنجامی
تاقیکردنەوەکانی ئاگادارکەمەوە وپێی بڵێمەوە. من و شیرینیش هەر سوپاسی ئاغای
سادیقیمان کرد و هەردووك پێکەوە هاتینە دەرێ. ئاغای سادیقیش دوای میوانداریییەکی باش
لە ماڵێ مە چووە دەرێ.
رۆژی تاقیکردنەوێم پرسیارەکان بە سانایی وەلام دانەوە و بەسەر و دڵێکی خۆشەوە
تاقیکردنەوەم بەجێ هێشت. و هەروا بە دڵخۆشیە تاقیکردنەوەکە وە دەگەڵ شیرینێ چووینە
ئەو نووسینگە و شوێنەی کە ئاغای سادیقی وانەی لێ بە منداڵان دەگوتەوە. لە دەرگام دا،
دەنگیم ناسییەوە.
هەدووکمان چووینە ژوورێ، لە پشت مێزێوە دانیشتبوو و کتێبێکی کە دیار بوو کتێبی
وانەکانی خۆیەتی، پەرپەڕ هەڵدەدایەوە. هەر هێندە چاوی بەمە کەوت لەجێوە بڵند بوو،
سلاومان کرد و بەفەرمووەکانی وی دانیشتین. پرسیارەکانمان هەموو بۆ شرۆڤە کرد و

هەریەکەمان دەربارەی وەڵامی پرسیارەکان دواین و دوایەش رەزامەندییە خۆمـان لـە وەڵامـی پرسیارەکان پێشان دا.

ئاغای سادیقی بە وردیەوە گوێی دابووە قسەکانمان و لە دواییشدا بە خۆشحاڵی ئەوەی کـە دەتاقیکردنەوەکەدا سەرکەوتوو بووین ئافەرینی کردین.

ئەوجا هێندێك بێدەنگ بوو و لە پڕ داوای لە شیرینێ کرد تا ئەو خانووەی بەرامبەرمانەوە بچێ ولای ئاغا رەزایی چەند بەشێك لەوانەی کە پەیوەندی بەخوێندن و وانەکـەی سـالاریەوەیە بێنێ. دڵم وە خورپە کەوت سالار برای من بوو باشە بۆ داوای لە شیرینێ کرد بچێ ئەو کـارەی بکا؟ منیش هەستام تا لەگەڵ شیرینێ بچمە خانووەکەی ئەو بەرێ ئاغای سادیقی گوتی:

- رەها خاتوون تۆ بەیارمەتی خۆت دانیشەوە، حەزدەکەم هێندێکت قسە دەگەڵدا بکەم.

شیرین بەناچاری هەستا. کاتی هەستانێ کەلە دەرکێ دەچووە دەرێ راوەسـتاو زەردەیـەکی ماناداری بە روودا کردم و چووە دەرێ. کە تاك بووینەوە، ئاغای سـادیقی کـەمێکی منـە مـن کرد و گوتی:

- رەها خاتوون وەك بۆ خۆت دەزانی و ئاگاداری مـن قوتـابی زانکـۆم وبـۆ دابـین کردنـی پێویستیەکانم وانەش دەڵێمەوە. من داك و بـابێکی پیرەکـەم هـەن کەلەشـاری دەژیـن ولـەبێ دەرامەتی و نەبوونیەیان ناتوانن هیچ یارمەتییـەکم بـدەن و جـاری واشـە ناچـاریش دەبم مـن هێندێکیان پارە بۆ بنێرمەوە. ئەوەش بزانە کەمن خوشکێکی لـەخۆم بچووکتریـشم هەیـە کـە ئەویش لە قوتابخانەیە...

ئاغای سادیقی تـەواوێکی باسـی ژیـانی خـۆی و کەسـوکارەکەی بـۆ کـردم و دوایـەش پـاش پێشەکیەکی دوور و درێژیش مۆڵەتی خواست ئەگەر من رازی بم کەسوکارەکەی بنێرێتە خوازبێنیـەم بۆ ماڵێ تا دەگەڵ دایك و بابمدا قـسەبکەن. زۆر چـاکم دەزانـی کـە دەودەمیـدا رەنگـم بەرووانـەوە نەماوەو بە ئاشکرا دەستەکانم دەلەرزین کە شیرین چەند جارێکی لە دەرکەی دا و هاتە ژوورێ.

* * *

رەها لە پڕ بێدەنگ بوو وهێندێکی ئاو خواردەوە. منیش هەر هەستی ماندووەتیەم دەکرد، لە پەنجەرەمرا سەیرێکی حەسارێ کرد هەوا بە تەواوی تاریك ببوو. ئەو سـەعاتەی کەلـەماڵێ رەهای بووم کات هێندە خێرا دەرۆیی کەهەستم بە بەسەرچوونی تەمەنێ نـەدەکرد. سـەیرێکی رەهام کردو گوتم:

- ئەگەر بفەرمووی پاشماوەی قسەکانمان سبەینێ درێژە پێ بدەین، چونکە بەمجۆرە ئێوە ماندوو و بێ تاقەت دەبن.

رەها هەمان زەردەخەنە جوان و دڵگرەکەی بەروو دادامەوە و قبوڵی کرد. بە ئاوازێکی میهرەبانانەوە گوتی:

- ئەگەر ئەو هاتوچۆیە بەردەوامە ئێوە ماندوو نەکا من قەیدێ ناکەم.

- نا، دڵنیابن کەمن هەرگیز ماندوو نابم من هەر کارەکەم ئەوەی دەخوازێ کە بۆ کۆکردنەوەی باس و بابەتە جۆراو جۆرەکان هەمیشە لە هاتوچۆ دابم.

بۆ ساتێك بێدەنگ بووم بەڵام دووبارە کە پرسیارێکم لەلا سەری هەڵدایەوە بەزارمدا هات:

- ببورن کە ئەو پرسیارەی دەکەم بەڵام زۆر حەزدەکەم بزانم مەبەستتان لە گێرانەوەو باسکردنی ئەو بەسەرهاتەتان چیە؟ ئەگەر دەکرێ هێندێکم بۆ روون کەنەوە.

رەها سەرنجێکی پرسیاراویانەی دامێ و پرسی:

- لەمەبەستەکەتان ناگەم، تکایە روونتر قسەبکەن.

کەمێکم بیرکردەوە و گوتم:

- پێم خۆشە بزانم مەبەستتان لەوەی کەبەسەرهاتەکەتان دەگۆڤارێدا بڵاودەکەنەوە چیە؟ زۆربەی خەڵکی حەزناکەن کەس بەنهێنی ژیانیان بزانێ کەچی ئێوە...

رەها سەرێکی لەقاندو تێیگەیاندم کەلە پرسیارەکەم گەیشتووە ئەوجا هەناسێکی هەڵکێشاو گوتی:

- لەبەر ئەوەی حەزناکەم دایك و باوکەکان لەجێی کچەکانیان بڕیار بدەن و بیروباوەڕو بۆچوونی خۆیانیان بەسەردا بسەپێنن، رەنگە ئەگەر دایك و بابی من و هەروەها گەورەترەکانی بنەماڵە رێگای بڕیاردانی ژیان و چارەنووسی خۆمیان بەمن دابایە ئێستا زۆر خۆشحاڵ و شاد و شەنگوڵتر ژیابام و لە ئێستا زۆر چاکتر بامایە، دەمهەوێ بەم شێوەیە بەهەموو دایك و بابێکان بڵێم ئەگەر بڕیاری شووکردنێ کچەکانیان بدەنە دەست خۆیان ئەوەدەمی دەیانتوانی رووبەڕوو بەرەنگاری سەختترین و دژوارترین گیروگرفتەکانی ژیان ببنەوە نەك دایك وباب بێن و مەرجەکانی خۆیانیان بەسەردابسەپێنن بۆیەش وا بە راشکاوی ئەوانە دەڵێم چونکە من بۆخۆم ئەم ژیانەم تاقی کردۆتەوە.

سەیرکە بزانم داخوا ئێوە کە ئێستا لە بەرامبەر منەوە دانیشتوون مێرد (شوو)تان کردووە؟ چونکە ئەگەر مێردتان کردبێت ئاسانتر لە قسەکانی من دەگەن.

قسەکانی رەها منی دەبیرو خەیاڵانەوە برد، وهەر بەڕاستیش جێی بیرو لێکدانەوانە. ئەوەی ئەو باسی دەکرد هەرچەندە بەرِوواڵـەت سـادە و سـاکار بووبـەڵام لـە دەروونـدا ئاریـشەیەکی گەورەبوو. زۆرینەی ئەو دایـك و بابانـەی کەدەسـتیان خـستۆتە ژیـان و ئاینـدەو چارەنووسـی جگەرگۆشەکانیان و لەجیاتی ئەوانیان بڕیار داوە سەرەنجام و زۆربەی جـاران منداڵـەکانیان تـێ شکاون و لـەژیانی هاوبەشـیدا سـەرنەکەوتوون و گیـانێکی شـەکەت و مانـدوو و بەپەیکـەرو پشتێکی چەماوەوە هاتوونەوە ماڵە باوانیان. و هەر ئەو دایك و بابانەش زۆرتر ئەفسوس وغەم و حەسـرەتان دەخـۆن کەنەدەبایـە ئـەو هەڵەیـەیان بکردبایـە و ئـەورۆژ رەشـیەیان بەسـەر منداڵەکانیاندا هێنابایە و ئاوا منداڵەکانیان تووشی ئەو کوێرەوەریانە بکردبایە کەکردیان.

لەجێی خۆم هەستام تابڕۆم و بەجێی بێلم، رەها، بـانگی رەبابـە خـانمێی کـرد تـا دووبـارە سەروچایەکی تازە دەممان بۆ بێنێتەوە. بە پڕکێشیە و بە زۆرییە رەهایـە سـەعاتێکی دیکـەش لەوێ مامەوە و ئەوجا چوومەوە ئەوێم بەجێهێشت.

باران بەسپایی و لەسەر خۆو نەرم دەباری وەك بڵێی ئاسمانیش ئاگای لە چارەنووسی رەهـای بێت و بۆ بەخت رەشیە ئەو ژنە جوانەی واداباریێ. سەرم بڵند کرد و رووی دەمم کردە ئاسمانێ و گوتم:

- لەوانەیە گریانەکەت هەر تەنیا بۆ رەها و بەخت و چـارەنووس رەشـیەکەی وی نـەبێت و زۆری دیکەی وەك رەهاش هەبن کەکەس ئاگای لە سووتان و کلۆڵی و کوێرەوەرییەکانیان نیە.

باش دەزانم کەتۆ تەنیا شاهیدوبینەری رۆژو بەخت رەشیە زۆر ژنان بـوو وی و هـەر دەبـی. کەواتە هەر ببارە تا غەمەکانی دەروونت سووك بێن.

ئەو شەوە تا درەنگانێك بـەرێك خـستنەوەی نووسـینەکانمەوە خـەریك بـووم تـا دەشـهات کونجکاوییەکەم زیاتر دەبوو بۆ زانینی پاشماوەی قسەکانی.

## (٣)

سبەی ڕۆژی دوایی تازە لەخەوێ هەستا بووم کەزەنگی تەلەفۆنێ لێیدا.

گوشیەکەم هەلگرت:

- ئەلۆ فەرموون.

سلاو ببوورە کە بەم ناوەختە نارەحەتم کردن بۆیەم زەنگ لێ دا تا وەبیرتان بێنمەوە بەسەر هاتەکەی ڕەها خاتوونێ دەگەلە خۆتاندا بێننە نووسینگەی گۆڤارێ.

دەنگی سەرنووسەری گۆڤارەکەم ناسیەوە، دیاربوو کە ئەویش کونجکاوانە بە دوای بەسەر هاتەکەی ڕەها خاتوونێوەیە و حەز دەکا هەرچی زووترە پاشماوەو سەرەنجامی بەسەرهاتەکەی وی بزانێ.

دلنیام کردەوە کە نووسینەکانی هەر بۆ دەبەم. دوای خودا حافیزیە تەلەفۆنەکەم دانایەوە و لە خۆشیانیشم زەردە خەنەیەك هاتە سەر لێوان. بەدلنیاییەوە باسی ژیانەکەی ڕەهای جێی سەرنجی بووە و بەلانی هەرە زۆریشەوە ڕێی چاپ و بلاوکردنەوەی دەدا.

بە خۆشی و بە ڕوویەکی گەشەوە بەرەو لای گۆڤارێوە کەوتمە ڕێ هەر کە چوومە ژووری ساختمانی گۆڤارەکەوە چەندین کەس دەربارەی بابەتە تازەکەمیان پرسیارکردو هەولیان دا بزانن داخوا ئەوە ئەو بابەتەیە کە سەرنووسەر باسی لێوەدەکا.

هەروا بەکورتی وەلامم دانەوە و چوومە نووسینگەی سەرنووسەری و نووسینەکانم لە پێش دانان. سەرنووسەریش بەلێنی دا ئەگەر هەروا کە خۆی مەزەندە دەکا بەسەر هاتەکەی ڕەها خاتوونێ جێی سەرنج بێت ئەوا بە زوویی کاری لە چاپدانێی دەست پێدەکاو بەزنجیرە داستانەکە چاپ دەکا.

ئەو ڕۆژە هەر زوو کارەکانم تەواو کردن و دوای تەواو بوونێش چوومەوە نووسینگەی سەرنووسەری و مۆلەتم خواست تا بچمەوە سەردان و دیدەنییە ڕەهای و بچم پاشماوەی قسەکانی بنووسمەوە.

دوای مۆلەت وەرگرتنێ لە ساختمانی گۆڤارێ چوومە دەرێ. پێش هەموو شتێکی چوومە ڕێستۆرانێوە و نانی نیوەڕۆیەم خوارد و بۆ چاو پێکەوتنێ سەعات دوو خۆم ئامادەکرد.

سەعات دووی دوای نیوەڕۆیە چوومەوە ماڵێ ڕەهای و دوای چاکو چۆنیە باسی گرینگیدانێ سەر نووسەریم بە بەسەرهاتەکە بۆ ڕەها کرد و داواشم لێکرد تا زووە پاشماوەی بەسەرهاتەکەی بگێڕێتەوە. زەردەخەنەیەکی ڕەزامەندییەی هاتە سەر لێوان و درێژەی دایەوە:

* * *

شیرین چەند جارێکانی لە دەرکەی دا و هاتە ژوورێ. بەو سەرنجەی کە لێیدام زانیم کەتا ئەو سەری ڕووداوەکەی زانیوەو تێیگەیشتووە. دەو دەمەیدا ئاغای سادیقی هەستا، لە تەك مێزەکەوە ڕاوەستاو لەشیرینی پرسی:

- ئاغای ڕەزایی هەموو ئەو بەشانەی دایەی کە داوام کردبوون و پێویستم پێیان بوو؟

شیرین زەردەیەکی شەیتانانەی کرد و وەڵامی دایەوە:

- ڕاستیەکەی نازانم، ئەوە پەیوەندی بەقسەکانی ئێوەو ڕەها خاتوونەوەیە، ئەگەر هێندێکی دیتان قسە ماون و هاتنەوەی من بەنیوە چڵی هێشتوونیەوە ئەوە دیارە کە هەموو بەشەکانی بە تەواوەتی نەداومەتێ، ئەگەر بوونی منیش لێرە ڕێی قسانتان لێ دەگرێ ئەوە من دەتوانم...

ئاغای سادیقی قسەکانی شیرینی بڕی و گوتی:

- نەخێر، بۆ وای بۆچووی؟

من سەرم بەردابۆوە و نەمدەزانی چبکەم. دەنگی ئاغای سادیقی بە خۆی هێنامەوە:

- خاتوو مولکی ئێوە ئەم کتێبەتان خوێندۆتەوە؟

هەستم کرد بەو پرسیارەی دەیهەوێ سەرنجی من بەلای خۆیدا ڕاکێشێ.

هەرکە من سەرم بڵند کردەوە و سەیری ئەوم کرد هەستا و بەرەولای کۆمەدییەکەی لای دەرکی ژوورێوە چوو. ئەو لەرزەی کە هەموو لەشی داگرتبووم بەئاشکرا دەپێیەکانمدا هەست پێدەکرد. خودایە! ئاغای سادیقی دەشەلێ. شیرین بە دەنگێکی لە سەرخۆوە پێدەکەنی بەلام سەرنجە گرژەکەی ئاغای سادیقی ناچاری بێدەنگیەی کرد. هیچ کاتێ ئاگام لە هاموشۆی ئاغای سادیقی نەبووە بۆ ماڵێ و نەشمدیوە یا باشترە بڵێم هیچ کاتێ بەلای ئەوەوەم کونجکاوی نەبووە و نەکردووە. هەمیشە ئەوم هەر لەو دیو مێزەوە بەرواڵەتێکی فەرمییەوە دیوە. تا ئەو ساتەش هەرگیز بە خەیاڵمدا نەهاتبوو کە لەوانەبێ ئاغای سادیقی کەم ئەندام بێ، ئەویش بەو کارەی هەردەویوست ئەو شتەم تێ بگەیەنێ. بە سەختی ددانم بەخۆمدا گرت و بە زەحمەت لە جێوە هەستام و بەدەنگێکی بە ئەدەبانەوە گوتی:

- بەیارمەتی خۆتان بیرێك لە قسەکانم بکەنەوە.

سەرم کە وەك کێوێکی قورسی لێ هاتبوو بەردایەوە و بەدەنگێکی کزەڵە وە کە وەك دەبیرێکیرا بێتە دەرێ گوتم:

- بێگومان.

خوا حافیزیمان کرد و هاتینە دەرێ. کاتێ کە دەرگامان بەدوای خۆماندا داخستەوە شیرین بە دەم پێکەنینەوە دەستی بەگوتنێ کرد:

- بێ، بێ، پیرۆزبێ، ئیشاڵلا... پیرۆزبێ.

بەسەرنجێکی توندەوە نارەزاییە خۆم پێ راگەیاند و ئەویش ساتێك بێدەنگ بوو و لە ماڵەکەی وە دەر کەوتین.

لەرێیە شیرین بەردەوام لە بارەی ئاغای سادیقیەوە دەدواو بەگاڵتەوە شتگەلێکی دەتگوتن و پێشدەکەنی:

بەراستی کچەکە، خەڵکی کارەبا دەیگرێ تۆ بەرمیلە نەوت، دەنێو ئەو هەموو کچانەدا ئاغای سادیقی بە خۆو بە لاقێکیەوە هاتووە بەتۆوە نووساوە؟ دەتۆ وەرە بیری لێ بکەوە کەباب و دایکت بەوەی بزانن کێ داوای تۆی کردووە خۆ هەر راست بەلا دادێن و هەر خواش دەزانێ چیان بەسەر دێ، حەتمەن تاو دەداتە تەوەرزینێکی و دەچێتە سەر ئاغای رەزایی کە ئەوەی هێناوەتە ماڵی ئێوە.

شیرین هەروا پرێشکی داویشتن و منیش بەدەم رێوە بێ هەست و چرپە و بێدەنگ بووم و هەر بیرم دەکردنەوە. شیرین کە خۆشەویسترین دەستە خوشك و هاودەمە ئاوا خەریکی بەیت و باڵۆرانە ئەدی ئەگەر ئەوانیدی بزانن دەڵێن چی، ئەوە مامۆژن، پوورە سەڵتەنەت، پوورە فرەنك ئەدی خالۆژنێ دەڵێن چی، ئیدی ئەوە پاشەملە هەر باس باسی من و دایکمە، لەلایەکی دیشەوە بە ئومێدی نەبێ ناتوانم بیر لە هیچ کەسێکی دیکە بکەمەوە، دەڵێم نا، و تەواو.

بەرێوە بە شیرینێم گوت باسی ئەم خوازبێنی و داوایە بە هیچ کەسێك نەڵێ و شیرینیش گفتی دا باسەکە لێرەوە ببڕێتەوە و هەر لە بەینی خۆماندا بێت و بمێنێتەوە.

دوای جودا بوونەوەم لە شیرینێ کە گەیمەوە ماڵێ بڕیارم دابوو کە ئەو باسە دەگەڵ هیچ کەسێکدا باس ناکەم و کە هاتیشمەوە ماڵێ دایکم بە نیگەرانیەوە هاتە پێشێ و پرسی:

- رەها: هیچ بووە؟

سەرم بە نیشانەی نەرێوە لەقاند.

- نەخێر، ئەو پرسیارە بۆ دەکەن؟
دایکە بەسەرنجێکەوە کە هەر نیگەرانی تێدا شەپۆل ئەدا گوتی:
- لە تاقیکردنەوەدا خراپ بووی؟
نا، لە راستیدا تاقیکردنەوەکەم یەکجار ئاسوودە بوو.
دایکە بە شلەژاوییەوە پرسی:
- بەڵام سەروچاوت شتێکی دیکە دەڵێ؟
بەبێ حەوسەڵەییەوە بۆ هەڵاتنێ لە دەست پرسیارە یەك بەدوای یەکەکانی دایکەدا بەرەو ژوورەکەم بورمەوە و هەر بەو حاڵەشەوە گوتم:
هێندێکم دەگەڵ شیرینێدا دەمەوەری بوو هێشتاش هەر لێی توورەم.
دایکم سەرنجێکی ناباوەڕانەی دامێ و پێش ئەوەی هەلی پرسیارێکی تازەشی دەستکەوێ چوومە ژوورەوەو دەرگاکەم لە دواوە داخست. چونکە درۆشم دەگەڵ دایکمدا کردبوو زۆر نارەحەت بووم بەڵام هیچ چارەیەکی دیکەم نەبوو.سەعاتێکیم لە ژوورێ بیر لە ئاغای سادیقی و پێشنیارەکەی کردەوە بەڵام هەر جارێکم کە پێیە شەلەکەی وەبیردەهاتەوە بێ ئیختیار ((نا)) م بەسەر زمانی دادەهات.
ئەو دوای نیوەڕۆیە هەوا هەور بوو وەك بڵێی ئاسمانیش دڵگیر بووبێ بەڵام رێی گریانی بەخۆی هەر نەدەدا. تەلەفۆن وە دەنگ هات گوشییەکەم هەڵگرت:
- ئەلۆ فەرموون.
- ئەلۆ، رەها، سلاو.
- سلاو بابە گەورە حاڵتان چۆنە؟ دایە گەورە چۆنە؟ هیوادارم هەرباش بن. دەنگی پێکەنینی بابە گەورەی لەو سەری تەلە فۆنەکەوە دەگوشییەکەیرا بەرز بۆوە.
- ئەوە چیەکچەکەم، دەڵێی منی پیرەمیردتان لە بیرچۆتەوە کە ناتوانم یەك پشوو وەلامی پرسیارەکانت هەموو بدەمەوە، بەو ساڵ و تەمەنەوە هەناسەم لێ بڕاوە لە وەلامەکەی بابەگەورەیدا منیش بە دەنگێکی بەرزەوە پێکەنیم. دووبارە دەنگی بابە گەورەی کە هەر پێدەکەنی بەرز بووەوە:
- ئێستا یەکە یەکە پرسیارەکان بپرسە تا وەلامت بدەمەوە. سەرەتا لە حاڵی خۆمت پرسیبوو، دەبێ بڵێم حاڵم باش بوو بەڵام کە گوێشم لە دەنگی ئەوە جوانەکەم بوو هێندەی دیش باشتر بووم، دایە گەورەش هەر چاکە دەشزانی چۆن دەزانم کە حاڵی باشە یان نا؟

بەسەر سامیەوە پرسیم:

- نەء، چۆن دەزانن؟

بابە گەورە بە پێکەنینەوە گوتی:

- ها، بەوەیرا دەزانم کە هەرکاتێ حاڵی باش بێت ئیدی ئەوە بەسەر سەری مندا دەبۆڵێنێ و پرتە پرتیەتی. ئەورۆش هەر لە بەیانیەوە تا ئێستا بەردەوام هەر بۆڵاندوویەتی و پەلپی گرتوون. پێکەنیم و لە وەڵامی بابە گەورەیدا گوتم:

- کەواتە ئەورۆ دایە گەورە دیارە زۆر باشە و سوپاس بۆ خوا کە نەساغ نیە. بابەگەورەم بەقاقا پێکەنی:

- دادەی کچەکەم، بابت لە ماڵەوەیە؟

لەوەڵامی بابەگەورەمدا گوتم:

- نەخێر، هێشتا نەهاتۆتەوە.

بابە گەورە پرسییەوە:

- ئەدی دایکت؟ ئەوان لەوێن؟

گوتم:

- بەڵێ هەر ئێستا بانگی دەکەم

دوای خوا حافیزی لە بابە گەورەی بانگی دایکم کرد. دایکم دوای قسان دەگەڵ بابە گەورە یدا بانگی منی کرد و گوتی:

- رەها، ئەگەر دەزانی ئیشت نیە وەرە یارمەتیم دە تا ماڵەکەی رێك خەین، بابە گەورە دەیهەوێ دەگەڵ میوانێکی بێگانەدا بێنە ماڵێ مە.

لەدایکم پرسی:

میوانەکەیان کێیە؟ بۆ دێنە ماڵێ مە؟

دایکە کە هەروا بە پەلە بەرەو لای هۆڵی میوانانەوە دەچوو گوتی:

- دەگەڵە ئەو لاوەی کە موغازەی بەرگدروونەکەی لەبابت بەکرێ گرتووە ئەوشۆ دەگەڵ بابە گەورەیدا دێنە ئێرە تا دەگەڵ بابت قسان بکەن.

بەسەرسامییەکەوە پرسیم:

- دەیانهەوێ لە بارەی چیەوە بدوێن؟

دایکە بەبێ حەوسەڵەییەکەوە گوتی:

- ئەتۆش ئێستا مەیلت بزووتووە و لە شێوازێ دینی دەپرسی؟ دەتۆ جارێ بجوولێوە، ئێستا دەگەنە سەرمان.

من ئیدی هیچیدیکەم نەپرسی و دەستم بەماڵ پاککرنەوێ کرد.

هەر ئەو شەوە کە بابە گەورە و ئەو لاوە هاتنە ماڵێ، من لە پشت پەردە تۆرپەکەی ژوورەکەمەوە ئەوم دیت بەڵام نازانم بۆ هەر لە یەکەم چاوپێکەوتنم پێی هەستی نەفرەتێکم لێ کرد و دە دڵی خۆمدا گوتم:

- وای، وای، خودا ئەوەی بەنسیبی گورگی بیابانێش نەکا، ژنە بێدەرەتان و کەسوکارەکانی چۆن دەگەڵ ئەو سەرو سەکوتەیدا هەڵدەکەن.

ئەو شەوە لاوەی ناوبراو کە ناوی محەممەد بوو دەگەڵ بابە گەورەیدا سەعاتێکی میوانی بابەی بوون و من ئاگام لە قسەکانی ئەوان نەبوو. سەعاتە و دوا ماڵیان بەجێهێشت وئەو هەموو پەلە و پێداگرتن و پرکێشیەی دایك و بابم بابە گەورەیان هەر نەگێڕایەوە بۆ نانی ئێوارێ.

دوای رۆیشتنێ وان بوو کە دایکم من و منداڵەکانی بانگ کرد بۆ شامێ. کاتی نانخواردنێ بابە هیچی دەربارەی قسەکانی دەگەڵ بابەگەورە و محەممەدیدا نەگوت. زۆرم حەز دەکرد بزانم داخوا چ مەسەلەیەك ئەوانی کێشاوەتە ماڵێ مە.

بەیانی ئەو رۆژە لەقسەکانی دایکمەوە تێگەیشتم کە محەممەد دەگەڵ بابە گەورەی هاتبوو تا داوا لە بابەی بکات کەمێکی بۆ لە کرێی موغازەکە داشکێنێ. ئەو گوتبووی کە ئەو کرێیەی موغازەکەی پێ نادرێ و بابەش هەرگیز نەیدەویست حەزی نەدەکرد کرێی موغازەکە داشکێنێ و کەمی بکاتەوە. بەڵام لەبەر قسەی بابەگەورە و هەروەهاش بۆ رێزلێنانێ کە دەگەڵ محەممەدی هاتبوو قبوڵی کرد و کرێی موغازەکەی کردە نیوەو بەو شێوەیە لوتفێکی گەورەی دەرهەقی محەممەدی کرد. ئەڵبەتە من ئەمە لە زمانی محەممەدیەوە دەڵێم کە کاتی خوا حافیزیە بە بابەی گوتبوو.

دوو سێ رۆژ بوو لە شیرینێ بێ ئاگا بووم و چونکە تاقیکردنەوەش بە کۆتا هاتبوو، چ کارنەبوون بیانکەم و حەوسەڵەم نەمابوو. بڕیارم دا سەرێك لە شیرین بدەم. کە باسەکەم بە دایکم گوت دایکم بەسەرسامیەوە پرسی:

- ئەدی لە شیرینێ تووڕە نیت؟

یەکسەر ئەو درۆیەم وەبیرهاتەوە کە دەگەڵ دایکممدا کردبوو، بەڵام چارەیەکم نەبوو هەردەبوو بەشێوەیەك دیزە بەدەرخۆنەی کەم تا باسەکە نەتەنێتەوە. بە زەردەخەنەیەکەوە بەدایەم گوت:

- جا خۆ تاهەتایە هەر لێك تووڕە نابین بەکورتییەکەی هەر دەبێ یەکێکمان پێش هەنگاو ودەست پێشخەر بێت و هەنگاو بنێ.

- بەڵێ، راستدەکەن، هەقی ئێوەیە، باشە تا زووە و قوتابخانە دانەخراوە بڕۆ بزانە ئەنجامێکی تاقیکردنەوەکانیشت دەست دەکەوێ یانە نا؟

روخسارە میهرەبانەکەی دایکمم ماچ کرد و خودا حافیزیم لێ کرد. لە ماڵێ هاتمە دەرێ و بەرەو ماڵێ شیرینێوە کەوتمە رێ. کاتێ کە گەیمە سەری کۆڵانێ ئەوم دیت پاڵی بە دیواریەوە داوە و وەك بڵێی چاوەڕێی یەکێك بێ. تەواوی لەشم یەکپارچە سڕ بوو ویستم رێ ورێ لە کوێوە هاتووم ئاواش بگەڕێمەوە بەڵام ئەو پێیزانیم و بەدەنگێکی بەرزەوە گوتی:

- سەڵاو خاتوونێ مولکی!

بەناچاری بەرەو لایەوە چووم و بە دەنگێکی لەرزۆکەوە سڵاوم کرد:

- سڵاو ئاغای سادیقی، چۆنن چاکن؟

ئاغای سادیقی هەنگاوێکی بەرەو پێشەوە نا و بەگەرمی لێی پرسیم. دوایەش داوای لێ کردم تا مەبەستی پێشنیارەکەی پێ بڵێمەوە.

دەگەڵ ئەوەشدا کە جارەهای جار لەبەر خۆمەوە بڕیارم دابوو کە بە روونی و بە ئاشکرا وەڵامی رەتکردنەوەی بدەمەوە بەڵام دەو ساتانەدا شەرمم کرد هیچ بڵێم، لە دڵەوە نەفرەتم لە خۆم دەکرد کە بۆ زیاد لە هەموو رۆژێکی ئەورۆ و ئەم سەعاتەشم بۆ لە ماڵ هاتنە دەرێ هەڵبژاردووە. لە پڕ بیرێکم بە مێشکی داهات ئینجا بە دەنگێکی لەرزۆکەوە گوتم:

- راستیەکەی من و کوڕە خاڵەکەم هەر لەمنداڵیەوە ناوی یەکتریان لێ هێناوین و ئێستاش ئەوە ماوەیەکە کە خاڵم داوا لە ماڵەوەمان دەکا تا رۆژێکی بۆ شەکراو خواردنەوێ دیاری بکەن. بەداخەوە من دەزگیرانم هەیە.

بە هەوتیەکەوە راوەستابوو و تەنیا هەر سەیری دەکردم تەنانەت یەك وشەشی بەسەر زمانیدا نەهات، بە تەواوەتی دیاربوو کە چاوەڕێی هەموو وەڵامێکی بوو تەنیا ئەوە نەبێ کەمن دەزگیرانم هەبێ. کە بێدەنگییەکەیم دیت ویستم خودا حافیزیە بکەم کە بە دەنگێکی وەك لەبنی بیرێکییەوە بێتە دەرێ پرسی:

- رەها خاتوون راستیەکەی بڵێ کە لەبەر گرفتی پێیەکەمە هەوڵ دەدەی بەهەر جۆرێك بووە خۆت لە شەڕی من لادەی؟

بە دەنگێکی لەرزۆکەوە وەڵامم دایەوە:

- باوەڕکە هەرگیز وانیە کە تۆ بۆی دەچی، بڕیارە من مێرد بە کوڕە خاڵەکەم بکەم و ئـەم مەسەلەیەش هەرگیز پەیوەندییەکی بە بارو دۆخی لەشی ئێوەوە نیە، تکادەکەم ببووری.

وەك بڵێی لەسەر پیادە ڕۆیەکە رابکەم و نەشمـدەوێرا ئاوڕدەمـەوە دوایـە چـونکە دەترسـام بەدوامەوەبێت. کاتێ کە گەیمە بەر دەرکی ماڵێ شیرینێ هەناسە بڕکێ بوو بووم. بەپەلە پەل و هەراسانیەکەوە لە دەرکێم دا وەك بڵێی یەکێکم بە دواوەبێ و ڕاومنـێ. بـێ وچـان لـێم دەدا و پەنجەشم بە دوگمەی زەنگەکەوە نابوو و پاڵم پێوە دەنا. دەوساتانەدا خۆم پێ زەوت نەکرا. خۆر بەخت دەو سەعاتیدا لە شیرینێ بەولاوە هیچ کەسێکی خێزانەکەیان لە ماڵەوە نەبوون. شیرین بە هەڵەداوانەوە دەرگاکەی کردەوەو بەسەرساميیەکەوە دە روخساریەوە ڕووانیم و گوتی:

- ئەوە چیە کچێ؟ خەریکە دەرکەکەی لە گرێژەنە بەری؟ ئەگەر بەزەییت بەدەستی خۆتـدا نایەتەوە زگت بە حاڵی بابم بسووتێ کە دەبێ هەرچی هەیەتی لەبری دەرکەکەی بدا.

بەهەڵەداوانەوەخۆم هاویشتە حەسارێوە، شیرین کونجکاوانە چاوێکی بەسـەر تاسەری کۆڵانێدا خشاند و کەکەسی نەدی پرسی:

- چبووە کەست وە دوا کەوتووە؟

بەبێ حەوسەڵەییەوە گوتم:

- ئەوڕۆ ئەوم دیت.

شیرین بەدەم بیرکردنێوە گوتی:

- ئەوە باسی کێ دەکەیت و لەبارەی کێوە دەدوێی؟ ڕوونتر قسە بکە بابزانم چبووە؟

بەبێ حەوسەڵییەوە گوتم:

- وای، چەند گێلی، مەبەستم ئاغای سادیقییە.

شیرین هەروا کە بۆنی لەپە دەستی خۆی دەکرد بەحیلە بازییەکەوە گوتی:

- ببوورە خاتوو ئارخمێدس، خۆ دەستی خۆمم بۆن نەکردووە تا لەمەبەستەکەتان بگەم.

- ئێستا وەرە بابچینە ژوورێ، پەرداغە شەربەتێکت دەمێ کەمێك بێیـەوە سـەرخۆت، ئـەوەی جندوکەشی دیوە ئاوای ڕەنـگ وروو نەپـەڕیوە وەك تـۆ کـە ئاغـای سـادیقیت دیـوە و وا ڕەنگـت پێنەماوە. تا ئێستاش کە رووخسار و سەرو سەکوتی ئەو کابرایەم لەبەر چاوێ و لەبیرم نەچووبێتەوە چ جێی بەجندووکان ناچێ. لەو گاڵتە وگەمەی شیرینێ پێکەنین گرتمی و دە وەڵامدا گوتم:

- دەکرێ بزانم جەنابعالی بفەرموون تا ئێستا چەند جارانتان سەرو سەکوتی جندووکان دیوە؟

شیرین بەخوین ساردیەوە گوتی:

- زۆریش، ئەوەتا هەر ئێستا یەکێکیانم بەرامبەر راوەستاوە.

هەردووکمان بەدەنگی بەرزەوە پێکەنین و شیرین دەستی گرتم و بەرەو ژوورەکەی خۆیەوە بردم.

بەگەمەو گاڵتە و گەپەکانی وی کەم کەمە هاتمەوە سەرخۆ. سەعاتێکمان دەگەڵ شیریندا
ـە قسەن بەریێ کرد. لە پڕ کەوتمەوە بیری دایکم و گوتم:

- ئەیەڕۆ، درەنگە.

شیرین بەسەرسامیەوە پرسی:

- دیسانەوە چبووە؟

گوتم:

- دایکم ویستی سەرێکیش لە قوتابخانە دەم.

شیرین هەناسەیەکی ئاسوودەییەی هەڵکێشا و گوتی:

- ئەو زەحمەتەی مەکێشە و لە خۆڕا مەچۆ، چونکە وەڵامت نادەنەوە، من پێش هاتنی تۆ
ـەرێ بووم، بە جۆرێکی وا نادەمیزادی دەدوێنن هەروەك هەرگیز نەتناسن و بەجۆرێکی واش
دەفتەری تاقیکردنەوەکان دەدەنەوە هەروەك بڵێی پەروەندەی تاوانکاریانیان بە دەستەوەبێ.

لەو پێك گرتنانەی شیرینێڕا قاقا پێکەنیم و گوتم:

- ئەدی ئێستا چ بکەین؟

شیرین شانەکانی هەڵتەکاندن و گوتی:

- هیچ تا رۆژی دەرچوونی ئەنجامەکان هەر دەبێ راوەستین ئەوجا دوای تاوتوێ کردنی
پەروەندەکان دەزانین داخوا حەبسی تاهەتایەین یا فەرمان بە لەسێدارە دانین.

داوام لە شیرینێ کرد تا رۆژی دەرچوونێ ئەنجامەکان پێکەوە بچینە قوتابخانە. شیرین
بەبیرکردنەوەوە پرسی:

- بەلای تۆوە تاقیکردنەوەکانمان چۆن داوە، پێتوایە بۆ خورداێ وەربگیرێین یا دەبێ
دیسانەوە تا شەهریوەرێ پێدا بێینەوە و سەعی بکەین؟

دەحاڵێکیدا کە هەڵدەستام تا وەدەرکەوم و ئەوێ بەجێ بێڵم وەڵامم دایەوە:

- وای خوانەکا ئیکمالیمان هەبێ، من هەرگیز حەوسەڵەی وانە و دەفتەروکتێبانم نەماوە،
هەر لە ئێستاوە چەند مۆمێکان نەزری ئیمامزادەی دەکەم دەرچووبم.

شیرین قیت بۆوە و گوتی:

کەواتە بەقوربانت بم ئێستا کە زەحمەتەکەی هەر دەکێشی، بۆ هەر دووکمان نەزر کە بەڵکە
ئێ دەروێکمان لێ بکرێتەوە و منیس دەرچم.

دوا خوا حافیزیە لە شیرینێ هاتمەوە ماڵێ، لە ڕێیــە وەك مرۆڤــە تاوانبــارو گوناهبارەکــان سەرم بەرەو خوار بەردا بۆوە و بە هــەنگاوی هــەراو بــەرەو ماڵــەوە دەچــووم. ترســی دووبــارە توشبوونەوەی ئاغای سادیقی وای لێدەکردم هەروەك هــەڵاتووان وەپەلــە پــڕووزە و هەڵــەداوانی خستبووم. کاتێ کە گەیمەوە بەردەرکی ماڵێ و زەنگم لێدا بە شڵەژاوییەوەم چــاوێك بــە دەورو بەراندا گێڕاو هەناسـەیەکی ئۆخەم هەڵکێشا و بە خۆشی و شادییەوە چوومەوە ماڵێ.

* * *

ئەو ڕۆژە و ڕۆژەکانی دیش یەك بە دوای یەکدا دەڕۆیشتن بێ ئەوەی هیچ شتێکی تازە روو بدا. چەند ڕۆژێك بەسەر ڕووداوەکەی ئاغای سادیقیدا تێپەڕی بوو و بە تەواوەتیم باسەکە لە بیر خۆم بردبۆوە. سەرەتای وەرزی هاوینێ بوو. ئەو ڕۆژە بەیانییەکەی دەگەڵ شیرینێ بڕیارمــان دا پێکەوە بچینە کتێبخانەی، هەر لە حەسارێم خودا خافیزی لە دایکم کرد و بەرەو دەرکێوە چووم تا لە ماڵێ وەدەرکەوم کە دەنگی زەنگی دەرکەی بەرز بۆوە، دەرگاکەم کردەوە خانمێکی پیرەڵە لە پشت دەرکێوە ڕاوەستابوو، بە دەنگێکی میهرەبانانــەوە ســڵاوی کــرد و بەشــێوە زمــانێکی شارستانیانەوە پرسی:

- ئەرێ کچە خاتوونەکە، ئێرە ماڵێ ئاغای مولکیە؟

بەسەرسامیەکەوە تێمڕوانی و وەڵامم دایەوە:

- بەڵێ، ئەدی ئێوە؟

بێ ئەوەی وەڵامم داتەوە گوتی:

- دایکتان تەشریفیان لە ماڵەوەن؟

هەر لەبەر دەرکێوەمڕا بانگی دایکم کرد:

- دایە، خانمێك لەبەر دەرکێ ئیشیان بە ئێوەیە.

دەنگی هەنگاوەکانی دایکم کە بەرەو دەرکێوە دەهات بەرز بۆوە. خودا حــافیزیم لــە خانمــە پیرەڵەکەی کرد و بە دوای شیرینێدا چووم.

شیرین هەروەك پیشەی خۆی شاد و شەنگوڵ و ڕووگەش بوو و گەمەو گاڵتەو جەفەنگەکانی منیشیان گەرم داهێنابوو. دوای سەعاتێك کەلە کتێبخانە هاتمەوە ماڵێ ڕووبەڕووی مرچومۆنی و گرژیە ڕوخساری دایکم بوومەوە. دایکم هەر چاوی بە من کەوت وەك ئەسپەندی سەر ئــاوری لە جێوە دەرپەڕی و بە تووڕەییەوە گوتی:

- تۆ ئەو ڕۆ ئابرووی مەت برد، حەزم دەکرد زەوی قڵیشابایەوە و قووتی دابام من کە سەرم لەو ڕەفتارە گۆڕاوەی دایکم سوڕمابوو بەسەر سامیەکەوە پرسیم:

- بۆ؟ مەگەر چمکردووە؟

دایکم بە تووڕەییەوە قیژاندی:

- جا چ ماوە نەیکەی؟ تۆ لە خۆت گەورەترت نیە کە بۆ خۆت وەڵام دەدەیتە خوازیارت؟ ئەوەش لە کوێ؟ لەسەر جادەی! بەڕاستی کە! نازانم چ بڵێم؟ تا دەهات وردە وردە لە مەبەستەکەی دایکم دەگەیشتم بەڵام لەوەی سەرسام بووم کە دایکم ئەوەی لە کوێ زانیوە. ئاکا ئاغای سادیقی هاتبێتە ئێرە و یا هەر بە تەلەفۆن ئەو باسەی بە دایکم گوتبێ. دە دڵی خۆمدا هەروا جنێوم دەدان کە دایکم دووبارە بە تووڕەییەوە گوتی:

- دەزانی ئەو خانمەی ئەوڕۆ هاتبوو کێ بوو؟ یەکسەر ئەو ژنەم وەبیرهاتەوەو دڵم خەبەری دا و زانیم کەسەری ئەو گلۆڵەی لە کوێوەیە. بەڵام خۆم بێ ئاگا نیشان دا و پرسیم:

- نەخێر، بۆ مەگەر ئەو ژنە کێ بوو؟

دایکم بە گرچییەکەوە وەڵامی دایەوە:

- ئەوە داکێ ئاغای سادیقی بوو کە تەشریفیان هێنابوو و هات منی سەنگەو بەرد کرد و لێیدا ڕۆیی، وەرە بزانم تۆ لە کەیەوە دەگەڵ کوڕەخالت بوونەتە دەزگیران و ئێمە ئاگامان لێ نەبووە! ئەوە ئەتۆ شەرمێ ناکەی هەروا بەسانایی درۆیان دەکەی؟ لەوەی تەریق نابیەوە کە بۆ خۆت بە دەستی خۆت، خۆت دێنیە سەر زار و زمانان؟

زەردەیەکم کرد و گوتم:

- ئۆی، جا ئەوە ئێستا چ قەوماوە کەوا بەمجۆرەتان مەسەلەکە گەورەکردووە؟ بۆ خۆشتان چاك دەزانن کە هەر بۆ ئەوەی لە یەخەی خۆمی کەمەوە ناچاربووم ئەو درۆیانە تێك کەمەوە و هەر ئەوەندە و هیچیدی.

دایکم ئەمجارەیان بە هێوریەوە گوتی:

- ئاخر ئازیزەکەم هەر کارەو ڕێی خۆی هەیە، هەر ئیشەو ڕەسمێکی هەیە، تۆ کە دەتهەویست خواستەکەی ڕەت کەیەوە دەبوو لێ گەڕابای بێنە ماڵێ ئەوجا زۆر بەرێزەوە وەڵامی ڕەتکردنەوەت دابانەوە نەك بچی درۆیان بکەی. ئەوە بۆ پێتخۆشە هەموو ئیشەکانت هەر بۆ خۆت بەتەنێ ئەنجام بدەی؟ بۆ بۆ ئەنجامدانی ئیشەکانت داوای یارمەتی لە وانەی لە خۆت گەورەتر ناکەی و دەگەڵ من و بابتدا ڕاوێژان ناکەی؟

دەستی دایکمم گرت و لەسەر قەنەفەکە لە تەنیشت خۆمەوەم دانا و داوام لێ کرد تا زۆر لەسەر خۆو زۆر بە نەرمیم مەسەلەکە بۆ بگێڕێتەوە.

دایکم سەیرێکی بە ڕکەوەی کردم و گوتی:

- کاتێ کە تۆ رۆیشتی، داکێ ئاغای سادیقی هاتە ماڵێ و خۆی ناساند، دوای شێرو ڕێوی هێنانەوەیەکی زۆر و پێشەکییەکی دوور و درێژ مەبەستی هاتنەکەی هێنایە گۆڕێ. منیش دە وەڵامی ویدا گوتم، ئەگەر مۆڵەت بفەرموون هەرکە رەها هاتەوە ماڵێ ئەوە ئەو باسەی دەگەڵدا دەکەمەوە و بۆچوونی و یش وەردەگرم.

دوایەش داکێ ئاغای سادیقی پرسی:

- رەها خاتوون بە دەزگیرانە؟

منیش کە هەرگیز چاوەڕوانی قسەیەکی وا نەبووم بێ وردبوونەوە و بێ ڕامان وەڵامم دایەوە، نا چۆن؟

داکێ ئاغای سادیقی سەرێکی باداو و گوتی:

- حەمید هەقی بوو تێگەیشتبوو کە خاتوونێ کچتان درۆی کردووە کە دەزگیرانی کوڕی خاڵیەتی منیش هەر بۆ ئەوەی تۆ بە درۆزن دەرنەیەی دەستبەجێ وەڵامم دایەوە، نا رەها خاتوون درۆی نەکردووە، خاڵەکەی داوای کردووە بەڵام رەها هێشتا وەڵامی تەواوی نە داونەوە، بەڵام بەگوێرەی فەرمایشاتەکانی ئێوە، دیارە رەها کوڕە خاڵەکەی بە دڵە و پەسەندی کردووە و بە تەماشە وەڵامی راستەکێیان بە ئەرێ بداتەوە.

ئەوجا داکێ ئاغای سادیقی هەستا و پێش رۆیشتنێ داوای لێکردم تا بەتۆ بڵێم و تۆش دەربارەی کوڕەکەی زیاتر بیربکەیتەوە.

* * *

رەها وە کۆکە هات. رەبابە خانیش کە دەگەڵ مندا گوێ گری قسەکانی رەهابوو دەستبەجێ بە راکردنەوە بەرەو مەتبەخەوە چوو و پەرداغە ئاوێکی بۆ رەهای هێنا. رەها قومە ئاوێکی خواردەوە و پەرداغەکەی لەسەر میزە زەردباوەکەوە لای دەستیەوە دانا و هەناسێکی قوڵی هەڵکێشا.

بە ئاشکرا فرمێسکی بە چاوانەوە دیار بوو و چاوەکانی هێندەی دی گەش کردبوونەوە. هەروەك مرۆڤێکی پەرێشان و تێماو و ئاڵۆز دەچوو کە داخێکی زۆر بۆ رابوردووی خۆی بخوا. پڕی گەرووی گریان بوو و دەنگی لێ بڕیبوو. رەبابە خانم سەرنجێکی

ری دامێ وەك ئەوەی پێم بڵێ کەلە قسەکان گەڕێین و بۆ ڕۆژی دواییان هەڵگرین.
ڕەهاشم بەو حاڵەوە دیت گوتم:
- ئەگەر بیر هێنانەوەی یادەوەرییەکانی رابردوو ئازارت دەدەن و نارەحەتت دەکەن و ـتوانی بیانگێڕیەوە قەیناکا. ئەو لایەنەیان لێ لابە و ئەوەی دەمێنێتەوە ئەوان وەگێڕە.
ڕەها سەرێکی لەقاند وگوتی:
- نا هەر چۆنێکی بێ هەر دەبێ بیانگێڕمەوە و باسیانکەم هەر بۆ ئەوەی سەروبەندی ـەدبەختی و ناخۆشییەکانی من بزانن، ئەوەش بزانن کە بۆ وچۆناوچۆن ئەو ژیانە سەرانسەر شادی و خۆشیەی من بووە دۆزەخی گیان پڕووکێن و لەتوانا بەدەر. ڕەها بێدەنگ بوو و چەند هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشان و خۆی ئامادەکردەوە تا بە کاوە خۆ دەستکاتەوە بەگێڕانەوەی پاشماوەی مەسەلەو بەسەرهات و ڕووداوەکان، دوای بێدەنگییەکی مەیلەو درێژخایەن دەستی پێ کردەوە:
- سەرنجێکی میهرەبانانە و پڕسۆزم دایە دایکم و گوتم:
- ئەوە هەر پێویستی بە بیرکردنەوێ نەبوو ئێوەش دەتانتوانی بڵێین نا، ئێمە هەرگیز کچی خۆمان نادەینە پیاوێکی وەك کوڕی ئێوە، و تەواو. بۆ پیاو براون تا کچێ بدەینە پیاوێکی وەك کوڕە نەخۆشەکەی ئێوە؟
دایکم بەدەست ڕوومەتی خۆی ڕنیەوە و گوتی:
- ئەوەیان نەدەبوو من ئاوا ئەو بەندەیەی خودای سەنگەو بەردنێم، بێدەرەتانە بەهەزار حەزو ئارەزوو و هیواو ئومێدەوە هاتۆتە دەرکێ مە، ئێستاش من بێم و بەبێ گویدانە ئەو هەموو هەست و ئەستانەی ئاخی دایکێکی ڕەنج کێش وەڵامێکی ئاوای بدەمەوە؟
بەهاتنەوەی بابم بۆ ماڵێ بۆ ئانخواردنی نیوەڕۆژەی قسەکانی من و دایکم برانەوە. دوای نانی ئاگام لەفسکەفکی دایك و بابم بوو و زانیم کە بەسەرهاتی هاتنێ داکێ ئاغای سادیقی بۆ بابم دەگێڕێتەوە.بۆ ئەوەی قسەکانیشیان لێ تێك نەدەم چوومە ژوورەکەی خۆم و بەکتێبێکیەوە سەرقاڵ بووم و خۆم پێوە خافڵاند.
دوای چەند ڕۆژێکان قوتابخانە بڵاوی کردەوە کە ئەنجامی تاقیکردنەوەکان ڕۆژی دواترێ رادەگەیەنرێ. من و شیرین بە تەلەفۆن بڕیارمان دا و ڕێککەوتین تا پێکەوە بچینە قوتابخانە. ئەمجارەیان شیرین زووتر هاتبووە بەردەرکی ماڵێ مە و ڕاوەستا تا منیش ئامادە بووم.
دەگەڵ شیرینێ پێکەوە کەوتینە ڕێ. هەریەکەمان دەردە دڵی خۆمان باس دەکرد و بیرو بۆ چوونی خۆمان دەربارەی ئەنجامی تاقیکردنەوەکان دەردەبڕی کەلە ناوەڕاستی کۆڵانێم چاو بە

لاوێکی کەوت کە پاڵی وەدیواریەوە دابوو. کوڕە لاوەکە دوای دیتنی ئێمە بەرەو لای ئەوە هات و سڵاوی کرد و پرسی:

- ببوورن ئێوە رەها مولکین؟

بەترسێکەوە سەیرێکی ئەو و دوایەش سەیرێکی شیرینم کرد. شیرینیش بەسەرسامیەکەوە دە لاوەکەوە رامابوو. لاوەکە دووبارە پرسیارەکەی کردەوە و من بە دەنگێکی لەرزۆکەوە وەڵامم دایەوە:

- بەڵێ، ئەی ئێوە؟

لاوە سەیرێکی وردی دەموچاوی کردم و گوتی:

- من برادەری حەمیدم، هاتووم داواتان لێ بکەم ئەگەر مەسەلەی دەزگیرانیەکەی کوڕە خاڵەکەتان درۆیە زیاتر بیر لە پێشنیارەکەی حەمید بکەنەوە، راستیەکەی باری دەروونی حەمید زۆر باش نیە و باری مێشکی هەموو کەسوکارو ناشناو دۆست و برادەرەکانی نیگەران کردووە.

بە بیستنی ناوی حەمیدی خوێن دە دەمارەکانی هەموو لەشمدا وەجۆش هات و زۆر بە رەقیەوە رووی دەمم کردە لاوەکەو گوتم:

- نەخێر، من راستیەکەیم گوتووە، لەمنیشەوە بەئاغای سادیقی بڵێن دەگەڵ هەموو ئەو رێزەش کەبۆیانم هەیە بەڵام لەو هەموو موزاحەمەتەیان ماندوو بووم وحەزیشم لێ نیە ئیدی نە ئەوان و نە تەتەرەکانیشیان موزاحیمم بن.

- دڵنیابن نەحەمید و نەتەتەرەکانیشیان مەبەستیان ئازارو نارەحەتیە ئێوە نیە بەڵام ئەگەر دەربارەی دەزگیرانەتیەکەتان درۆت دەگەڵ حەمیدی کردبێت ئەوا گفتت دەدەمێ هیچ کاتێ خۆشی لەژیانی خۆتان نابینن و هەرگیز بەختەوەر نابن دەزانی بۆ؟ لەبەر ئەوەی کە بەڕاستی دڵی حەمیدت شکاندووە و حەمیدیش هەمیشە و تاهەتایە چاوی لە دواتە.

بەبێزاریەکەوە گوتم:

- وەی بابە گیان چەند دڵگیرە، تو خوا بەسە وەی گریانم هاتێ.

کوڕە لاوەکە سەرنجێکی تووڕەییەی تێبڕیم و سەرێکی بادا و رۆیی بەڵام قسەکانی هەر هەموو تا ئەمرۆش هەر بەدوامەوەن و دەگەڵمدا دەژین و چۆنی گوت وا دەرچوو و لەو رۆژە بە دواوە ئیدی من بەختەوەریم لێ ونبووە و دوای ئەوەش رێڕەوی راستەقینەی من گۆڕا و هێڵێکی رەشی بەسەردا کێشرا.

# (٤)

چەند مانگێك رابردن چەند جارێکانم ئومێد دیتەوە، ئومێد تاکە ئەوینی مـن بـوو، هـەموو جوانیە دنیایە دەبوونی ویدا کۆببۆوە بەڵام هیچ جارێکیشیانم نەوێرا نهێنی شاراوەی ناو دڵی خـۆم بـە ئومێد بڵێم کە شەو و رۆژیشم هەر بەیادی ئەوەوە بەسەر دەبردن. رەنگـە ئومێـدیش هـەروەك من نەیوێرابێ قسەی دڵی خۆی بە زماندا بێنێ و بڵێ; بەڵام هەر جارێکی کـە یـەکترمان دەدیـت گڕی ئاگری سـەرەنجەکانمان هێندەی دی پڕ تاو وتینترو گەرموگوڕتر دەبـوو.تـەواوی خوازیارەکـانم بەهیوای ئومێدیەوە رەت کردنەوە. هـاوین دوویـارە گەرماییەکـەی خـۆی لـە دەسـت دایـەوە و سـروەبای ساردیش وردە وردە کەوتەوە شنەشنێ. قوتابخانەکان کرابوونەوە و سروشت جـل و بەرگـە سـەوزەکەی خـۆی هێنـابۆوە دەرێ و کراسـە رەنگینەکـەی دەبـەر کردبـۆوە. چـێژم لەخشەخشی گەڵاکانی ژێرپێی هەنگاوەکانم وەردەگرت. بەتەواوەتی شەیداو سەوداسەری جوانیە تایبەتییەکـەی خودی پایزێ ببووم. دنیاو ئاوازی مەلەکانم شەیدایانەتر لـە سـاڵەکانی دیکـە دەدیتـەوە، دەدڵـی خۆمدا، لە بەرامبەر ئاوێنەوە دەگەڵ ئومێدیدا دەدوام، هەروەك مەلەکانیش ئاوازی عاشقانەم بـۆ دەچڕی. چەند رۆژێك بوو ئاغاو خانمێ گـەورە لـە ماڵـێ مـەبوون. سـینییە چـام هـەڵگرت ولـە مەتبەخێوە بەرەو لای هۆڵی میوانانەوە چووم. داك و بابیشم هەروا دەگـەڵ ئاغـاو خانمـێ گـەورە نەوێ دانیشتبوون و دایکم داوای لێکردبووم چای تازە دەمیان بۆ ببەم. هەرکە گەیە پشت دەرکێ سالۆنی میوانان دەنگی بابە گەورەی لە جێی خۆمی وشك کردم.

- فەرهاد ئەوە تاکەی هەروا دەتەوێ دەسـتی دەسـتیەبکەی؟ ئـەی دوایـە چـی هـەر دەبـێ بەمێردی بدەی تا هەر نەبێ رێیە شووکردنێ بۆ کچەکانی دی ببێتەوە، خۆتۆ هـەر تـەنیا ئـەو کچەت نیە، بیرێکیش لەوانیدی بکەوە، خۆ محەمەدی چاك دەناسی کوڕێکی گەلێك چاکە ئیـدی ئەو خۆهێنان و بردن و دەسـتی دەسـتیەت لەچی؟

سینییە چام بە دەستانەوە دەلەرزی دەنگی وێك کەوتنەوەی پیاڵەکان وایان لێکـردم بـەرەو مەتبەخەکە بادەمەوە وشل و پل لەسەر عەردی مەتبەخەکە دانیشم. دایکم چـەند جارێکـانی بابگ کرد:

- ڕەها، ڕەها، ئەوە بۆ چای بۆ خانم و ئاغای گەورە ناهێنی؟

و کە وەڵامی منی نەبیستەوە بۆ خۆی هاتە مەتبەخێ تا چایان بۆ بەرێ. هەرکە هاتە مەتبەخێوە و منی ئاوا بەڕەنگی پەڕیوەوە و دانیشتووی سەرعەردی مەتبەخێ دیت بەنیگەرانیەوە پرسی:

- ڕەها چبووە؟

بەدەنگێکی کیناویەوە پرسیم:

- ئەوە ئاغای گەورە چی بەبابەی دەگوت؟ باشە بۆ بابە هەروەك منداڵان گوێ لەمشتی بابە گەورەیە و هەموو شتێکی بەقسە دەکا و ناوێرێ قسەیەك لەقسەی بابە گەورەدا بکاتەوە.

دایکم کەمێکی منە من کرد وگوتی:

- ئیدی ئێستا تۆ لە تەمەنێك دای کە خوازیارانی زۆرت هەن ئێستاش یەکێك پەیدابووە کە زۆر بەدڵی بابە گەورەیە و بابەگەورەش زۆری پێخۆشە ئەو کارە سەربگرێ، دڵنیاشم لەوەی کە تا ئێستا زانیوتە بابە گەورە دەنێو بنەماڵەیدا خاوەن قسەی یەکەمەو کەس بۆی نیە قسە دەقسەیدا بکا.

دەبارێکدا کە فرمێسکم دەچاواندا قەتیس مابوو گوتم:

- دڵی گرتوویەتی یان دەیهەوێ بەقسەی خۆی ڕێ بۆ ئەوانیدیش خۆش کا؟

دایکم بە تەنیشتمەوە دانیشت و گوتی:

- ڕاستیەکەی هەر ئەو محەممەدەی کە موغازەی بەرگدروونەکەی بەکرێ گرتووە تۆی لەبابەگەورەی خواستووە و بابە گەورەشت بۆ ئەو کارەی زۆر پێخۆشە. ئەوە ئێستاش دەربارەی ئەو بابەتە دەگەڵ بابتدا دەدوێ و هەوڵیش دەدا سەرنجی بابیشت بەرەو ئەم باسەوە ڕاکێشێ.

دەبارێکیدا کە کوڵی گریانم هەستابوو گوتم:

- ئەو چۆنی من خواستووە کەمنی هەر نەدیوە و خۆ ئەگەر ئێستا ڕوو بەڕووی یەکتری ببینەوە نازانێ من ئەوەم کە داوای کردووە باشە ئەدی چۆن کەکەسێکی نەدیوەو نەناسیوە و تەنانەت کورتە دیتنێکیشیان دەگەڵەویدا نەبووە چۆن دەتوانێ داوای بکات و بیخوازێ.

دایکم بەدەم بیرکردنەوێوە شانێکی هەڵتەکاند و گوتی:

- منیش نازانم، کێ دەڵێ تۆی نەدیوە، لە وانەیە لە قوتابخانە تۆی دیبێ و بەدڵی بووبی و دوای لێکۆڵینەوەیەکی تەواویش ئەوجا کە زانیویشیەتی تۆ نەوەی بابەگەورەی جا خوازبێنی کردووە... دەبێ ڕاشودستی و بزانی چۆن دەبێ.

دایکم چایە ساردبووەوەکانی رشت و سەر لەنوێ پیاڵەکانی پڕ لە چاکردنەوەو سینییەکەی بەدەستەوە گرت تا لە مەتبەخێ وەدەرکەوێ رووی لەمن کردەوەو گوتی:

- هەموو کچێك دەها خوازبێنی دێت تا یەکێکی هەڵدەبژێرێ و بەدڵی دەبێ، محەممەدیش هەروەکو هەموو خوازیارانت، لێگەڕێ بابێن بەڵکە دڵت گۆڕا، ئەگەر بە دڵیشت نەبوو ئەوە رەتی دەکەیتەوە، ئەوە غەمی بۆ چیەو دەست دەنەژنۆ وەرێنانیشی ئاوێ، هەستە دەی هەستە ئاوێکی بە دەموچاوت داکە دەڵێی کارەبا لێی داوی. دایکم لە مەتبەخێ چووە دەرێ و مـن کەوتمە بیرو خەیاڵ و لێکدانەوان، دەمزانی کاتێ بابەگەورە حەزی لەشتێکی بێ ئیدی تەواوە.

رەها تاوێك بێدەنگ بوو. دڵۆپە فرمێسکی وەك دەنکە مرواریـیان بـە روومەتیـدا هاتنـە خوارێ، دەستەکانی بە ئاشکرا دەلەرزین ددانی دەچیرەوە دەبردن و بەگەرووی پـڕ لـە گریانـەوە درێژەی دایە:

- ئەگەر دەمزانی خوازبێنیەکی نا ئاوام دێت خوا دەزانێ کە حەمیدم رەت نەدەکردەوەتەنیا عەیبێکی کە هەیبوو کەم ئەندامەتیە ئەو لاقەی بوو خۆ هەر نەبێ هەرگیز نەفرەتم لێی نەبوو بەڵام لە محەممەدیم هەر لە یەکەم سەرنجەوە نەفرەتێکی تایبەتیم لە دڵەوە لێکردووە.

❋ ❋ ❋

رەها بەنەفرەتەوەی قسەدەکردن و بـە تووڕەییـیەوەی دەسـت رادەوەشـاندن. دەوسـاتانەدا دەمزانی کە ئەو تووشی بارێکی دەروونی بووە. ئاشکراکردن و گێڕانەوەی رووداوەکانی رابوردوو تا دەهات زیاتری گرژو نارەحەت و ئاڵۆزتر دەکرد. دەستم خستە سەر شـانی و بەئارامیەکـەوە رامتەکاندو لە دونیای رابوردووم دەرێنایەوە. رەها بە چاوی فرمێسکاوییەوە تێیڕوانیم و گوتی:

- سپێدە نازانی ئەو رۆژە نەفرەتیانە چەند نا هەموارو سەخت و گیانپڕووکێن بوون، نازانی چەندم رەنج کێشاوە. تەنیا هەر خودا بـۆ خـۆی دەزانـێ ئـەو رۆژانـەم چـۆن لێ بەسەرچـووە. چەندەها جارانم مەرگ لە خودای خۆم بە ئاوات خواستووە و هەموجارێکیـشم خۆسەرزەنـشت کردووە کە ئەوە هەموو ئاهو هەناسە و تووك و نەفرینی حەمیدە لێت گیرابووە و گرتووتی و بە قوڕێی دابردوویە خوارێ، ئەگەر لەترسی ئابڕوو چوون و شەرمەزاریە نەبوایە خۆم داویشتە سەر پێیەکانی تا بمبەخشێ و لە گوناهو لەو سوکایەتییانەم گەردن ئازادکا کەپێم کردبـوو و چـاویان لێ بپۆشێ، بەڵام شانازی و شەرمو شکۆم نەیاندەهێشت و لەو کارەیان دەگێڕامەوە.

رەها زۆر بە تووڕەییەوە و خێراخێراش دەدواو دەنگی دەلەرزی. داوام لێ کرد تا هێندێك وەحەسێ و پشوویەك بداو هەر گیـز بیرلـە ڕابـوردوو نەکاتـەوە. رەهـاش هـەروەك منـداڵان

بەقسەی کردم، پالّی بەقەنەفەکەوەدا و چاوەکانی نووقاندن. لەجێی خۆم هەستام و نووسینەکانم ڕێك و پێك کردنەوەو بەرەولایەوە چووم. چاوەکانی هەڵێنانەوە و سەیرێکی کردم و بەئارامییەکەوە گوتی:

- بەتەمای بڕۆی؟

زەردەیەکم بەڕووە جوانەکەیدا کردو گوتم:

- بەڵێ، پێموایە ئەوەندە بۆ ئەوڕۆ بەسە، ئەوڕۆ بەبیرەوەریە رۆژەکانی رابوردوو تا ئەندازەیەکی زۆر گرژو نارەحەت بووی و منیش نامهەوێ وپێم خۆش نیە لەوەی زیاتر نارەحەت ببی.

رەهاش هەر لە جێی خۆیەوە قیت بۆوە و بەرامبەرم راوەستاو گوتی:

- مەترسن من بەو رەنج و ئازار کێشانانەوە راهاتووم ئێستاش رۆژێك نیە کە بە وەبیر هێنانەوەی بیرەوەییە تاڵەکانی رابوردوو فرمێسکان نەرێژم. دنیای من هەمووی پڕە لە لەو ئاهوهەناسەو حەسرەت خواردنانەی رۆژانی رابوردوو، هەمووی هەر ئێش و ئازارو فرمێسك رشتنی بەردەوامە. من ژنێکی نەفرەت لێکراوم و هەرگیزیش لە خۆم نابوورم.

چونکە من هێندە بەرزەفڕیووم و هێندەشم بە خۆم دەنازی کە گاڵتەم بەهەموو کەسێك و بەهەموو شتێك دەهات. ئەوە من بووم کە لە ئومێدی بەولاوە نەکەس و نەهیچ شتێکم دەدی و نەهیچیشم بەلاوە شت بوو. جارەهای جار دەگەڵ شیرینێدا لاساییە سادیقیمان کردۆتەوە و گاڵتەمان پێ کردووە.

رەها هەر قسەی دەکردو فرمێسکی دادەباراند، فرمێسکی پەشێمانی بەلام هیچ رێیەکی قەرەبووکردنەوەی ئەو پەشێمانی و هەڵانەشی نەبوو. نێوچەوانیم ماچ کردو گوتم:

- هەرچی بوو رۆیی وتێپەڕی ئێستاش پێویست بە خۆسەرزەنشت کردنێ نیە، هەوڵدە دنیایە بە چاوێکی دیکەوە سەیرکەی و خۆت لە تراویلکەی ماڵ کاولیە ئارەزوو و حەزەکان بێنیە دەرێ، ئاهو هەناسەو حەسرەتەکانیش بە زەردەخەنە و قاقای پێکەنین و شادییەکان بگۆڕیەوە.

رەها سەرنجە غەماوییەکەی تێوەبڕیم و گوتی:

- تازە ئیدی من ناتوانم و هەموو شتێکیش تەواوبووە و ئیدی ناتوانم...دەستم خستە سەر لێوەکانی و گوتم:

- هەرگیز نامهەوێ جارێکی دیم گوێ لەو جۆرە قسانەی تۆبێ، من ئیدی دەبێ بڕۆم بەلام حەزدەکەم بەیانی کە دێمەوە سەردان و دیدەنیەت نائومێدییەکانت هەموو بەلاوەنابن، بەڵێن دەدەی وابکەی؟

ڕەها سەرنجەکەی لەسەر من وەلاناو دە وەڵامی مندا گوتی:

- هەرچەندە دەشزانم کە بێسوودە بەڵام بەڵێنیش هەر دەدەم.

لە ڕەهای جیابوومەوە و بە ئارامیەوە بەسەر شۆستەکەیدا کەوتمەڕێ. دەبارێکیدا کەبیرم دەکردەوە ئەو ڕۆژەم وەبیرهاتەوە کە بۆیەکەمجار دیبووم. لەو بۆچوونەی ئەو ڕۆژەی خۆم زۆر تەریق بوومەوە و وەڵامەکەی ویم وەبیرهاتەوە کە گوتی:

ساقی پیاڵەیەك مەیم بدەیە، نەخشە کێشی غەیب
هیچ کەس نازانێ، لەپەردەی رازا،چی دەنەخشێنێ

ئەوە ئێستا وردە وردە تێدەگەم کە ڕەها ئەو ڕۆژانە چی پێ گوتووم، ئێستا دەزانم کە بۆ هەر دەیگوت خوا بکا مرۆڤ هەر ئاخری خێربێ دەنا جوانیە دەموچاوان نابێتە مایەی بەختەوەریە. ئەورۆش وەڵامی زۆربەی پرسیارەکانم وەرگرتبوونەوەودەمزانی ڕۆژانی داهاتووش وەڵامی پرسیارەکانی دیکەم کەماون هەر دەداتەوە.

کاتێ کە گەیمەوە ماڵێ دە ئاوێنەمدا سەیرێکی خۆم کرد. دەموچاوم لەسەرمان سوور هەڵگەڕابوو، بەبێ ئەوەی بەخۆم بزانم تەواوی ڕێیەکەم بە پێیان بڕیبوو. بێ حەوسەڵانە نووسینەکانم هەڵدانە سەر مێزەکەم و خۆم بەسەر قەنەفەکەیدادا. کەوتمە بیرو خەیاڵانەوە. تا دەهات زیاترم حەزدەکرد درێژەی قسەکانی ڕەهایە زیاترببیسم. دەمزانی هەرچی هەیە پەیوەندی بە خوازبێنی محەممەدیەوەیە لە ڕەهایە بەڵام نەمدەزانی چۆن بووە ڕەها دەگەڵ ئەو هەموو نەفرەتەی کەلە محەممەدی بووە چۆنی پێ ڕازی بووە مێردی پێ بکا؟ تا دەهات لافاوی پرسیارە یەك بەدوای یەکەکاندا کە وەڵامێکیانم نەبوو زیاتریان چنگ و نینۆك لە دڵم گیر دەکرد و منیان زیاتر تینووی زانینێ دەکرد.

لە جێی خۆم هەستام و خواردنێکی هاکەزاییم ئامادەکردو ئەوجا دوای نانخواردنێ چوومە ناوجێی، بەو جۆرە دەمهەویست خۆ لە و پرسیارە یەك بە دوای یەکانەی بەمێشکمدا دەهاتن بدزمەوە. بەڵام بیرم هێندە جەنجاڵ بوو کە تا درەنگانێکی شەوێم خەو لێ نەکەوت.

بەیانی ڕۆژی دواتر لە هەموو جاران درەنگتر لە خەوێ ڕابووم. سەیرێکی سەعاتێم کرد. دەگەڵ تەماشای سەعات کردنێدا وەك کارەبا گرتووان لەجێی خۆم دەرپەڕیم و دوای ئامادەکردنێ دەستنووسەکانم بەرەو نووسینگەی گۆڤارێوە چووم. هەرکە چوومە ناو

ساختمانەکەوە سەرنووسەری گۆڤارێم دیت چاوەڕێیە. بەڕێوەبەر چەند هەنگاوێکان بەرەوپێشترەوە هات بە روویەکی گرژەوە گوتی:

- خانمی رەزایی نامەوێ ئەو گرینگیدانەی من بەو کارەتان ببێتە هۆی خراپ سوود لێ وەرگرتنتان و خوانەخواستە وا تێبگەن کە هەر کاتێکی حەزتان لێبوو دەتوانن بێنە نووسینگەو هەرکاتێکیش ئارەزووتان کرد نووسینگە بەجێ بێڵن.

داوای لێبووردنم لەئاغای میرزایی کردو بەڵێنم دا کە ئیدی ئەوە دووبارە نەبێتەوە. ئاغای میرزاییش کە ئەو پۆزشەی منی دیت کەمێ هێورتر بووەوە وهەر بەو دەنگە هەمیشەییەی کەپڕبوولە سۆزو میهرەبانی و رێزپرسی:

- هەواڵی بەسەرهاتەکەی خانمی ئەحمەدی گەیوەتە کوێ؟ کارەکان باش بەرەوپێش دەچن؟ ئایا بابەتێکی سەرنج راکێشە یا هەرکات بەسەر بردنە، ئاخۆ ئەوە دەهێنێ کە ئەوقسانەیان بنووسین؟

نووسینەکانی رۆژی پێشترێم دایە دەستی و گوتم:

- واباشترە بڕیاری داستانە پڕ لە رووداو و بەسەرهاتەکانی رەهای هەربخەمەوە بەردەستی خۆتان بڕیاری لەسەربدەن.

ئاغای میرزایی دەستنووسەکەی وەرگرت و هەروا کەبەرەولای نووسینگەی کارەکەیەوە دەچوو گوتی:

- بەزووترین کات بۆ چوونی خۆمتان پێ دەڵێمەوە بەلام ئەگەر ئەوەم پێشاندا کە بەدواداچوونی ئەم بابەتە کارێکی بێسوودە ئێوەش بەڵێن بدەن کەئیدی بۆ نووسینی بیرەوەرییەکانی ئەو خاتوونەی کات بەفیڕۆ نەدەن.

من کەبەتەواوی دڵنیابووم بەسەرهاتی رەهای چۆن هەتا بەرەو پێشتربچێ مـن زیاتر رادەکێشێ، ئاواش سەرنجی ئەو بۆلای خۆی رادەکێشێ، وەڵامم دایەوە:

- هەرچی ئێوە بفەرموون ئەوەی دەکەم، ئیدی من چاوەڕێی بیستنی وەڵامتانم. ئاغای میرزایی سەرێکی رەزامەندیەی باداوچۆوە نووسینگەی کارەکەی. منیش سەرقاڵی کاری رۆژانە بوومەوە.

چەندین سەعاتی پێ چوو کەچی ئاغای میرزایی تەلەفۆنی هەر بۆ نەکردمەوە. وردە وردە تا دەهات نیگەران دەبووم و بیرو خەیاڵم دەکردنەوە، دیارە ئاغای میرزایی بابەت و داستانە تازەکەی بەلاوە خۆش نەبووە بۆیە تا ئێستا هیچ دەنگێکی لێوەنەهاتووە بەلام نا ئەو هەرگیز

ـمتێکی بەلاوە باش و پەسند نەبێ لێی بێدەنگ نابێ. سەعاتێکی دیکەش چوو ئیدی هەر ـتەوێ بۆ خۆم بچمە نووسینگەی سەر نووسەری وبزانم چیە و چ نیە کە تەلەفۆنی سەر مێزەکەم ـییە و ئاغای میرزایی داوای کردمە نووسینگەکەی. ئیدی لەوەی دڵنیابووم کە بەرەو رووی ـ ـڕێ بوونێ ئاغای میرزایی روو بەرووەدەبمەوە، ماوەیەکیش دوودڵ بوومەوە. هەروا ـتەوەختێکیش بیری جیاوازییە بۆ چوونی ئاغای میرزایی و راگرتنی کارەکە نیگەرانی کردم. ـمروەاش کە بەرەولای نووسینگەی سەرنووسەریشەوە دەچووم دەدڵی خۆمدا بیرم دەکردەوە ـەگەر ئاغای میرزایی بلاو کردنەوەی بەسەرهاتەکەی رەهای قبوڵ نەکرد دەتوانم دوای دەوام و ـمر بۆ راگرتنی هەستی کونجکاوییە خۆم سەرێکی لە رەهای هەڵێنم و بکەومەوە سەر ـووسینی پاشماوەی بەسەرهاتەکەی. دەشترسام بە رەهای بڵێم کە بیرەوەرییەکانی جێی پەسەند ـمبووەو بلاو ناکرێتەوە ببمە مایەی دڵ رەنجانی. یەك دوو جارانم لە دەرکەی دا و دوای مۆڵەتێ چوومە نووسینگەوە.

ئاغای میرزایی چاویلکە زەرەبینییەکەی لەچاوی کردەوە و لەسەر مێزی کارەکەی دانا.

نووسینەکانم کەلەلایەکیەوە بوون تاودایە و بۆی راداشتمەوە وگوتی:

- خانمی رەزایی دەبێ پێتان بڵێم نووسینەکانتانم خوێندنەوەو بە بۆچوونی من هەرگیز...ئاغای میرزایی بێدەنگ بوو و سەرنجێکی وردتری دامێ و درێژەی دایە:

- بەلای منەوە هیچ گرفتێك بۆ چاپی داستانی ئەو خاتوونەی نیە و ئێوەش دەتوانن هەموو رۆژێ بچنە لای ئەو خاتوونە و گوێی بۆ رادێرن و هەوڵدەن تا دەکرێ زووتر و خێراتر نووسینەکانتان تەواوکەن و تا کاری پێویستی چاپکردنی بۆ بکرێ.

لە خۆشیان لە پێستی خۆمدا جێ نەدەبۆوە و نەدەحەجمیم، سوپاسی ئاغای میرزاییم کردو لە نووسینگەکەی وەدەرکەوتم، هەر زوو هەموو کارەکانم تەواوکردن و رێك سەعات دووی تەواو زەنگی دەرگای ماڵێ رەهام لێدا. رەبابە خانم دەرگای لێ کردمەوەو بەمیهرەبانیەوە فەرمووی چوونە ژوورێی لێکردم. ئیدی ئەو ماڵە بۆ من نا ئاشنانەبوو زۆر بەچاکی شارەزای هەموو جێیەکی بووم. رەها بەهەڵە داوانەوە بەرەو پیلم هات و هەردووکمان وەك دوو دۆستی دێرین یەکترمان دەئامێزگرت و یەکترمان ماچ کرد.

دوای چەند دەقیقێکان کە رەها ئەو هەموو شۆڕوشەوق و تاسەیەی لەمن دیت پێکەنی و گوتی:

- کاتێ کە ئەوهەموو شۆڕو شەوق و تاسەو شادییەی دەئێوەدا دەبینم فەرامۆشیم دێ و دڵم فێنك دەبێتەوە و گێڕانەوەی بابەتەکەشم خۆشترو ساناتر بۆ دێ.

کەمێك بێدەنگ بوو قژەکانی کە بەسەر شانەکانیدا هاتبوونە خواریَ رێکی خستنەوە و ئەوجا بە ئارامیەکەوە دەستی بە گێڕانەوێ کردەوە.

* * *

ئاغای گەورە لەنێو بازاڕی ژوورێکی خۆی هەبوو. بابیشم هەر بەتەنیشتەوییەوە موغازەیەکی هەبوو بەناوی دوکانی بەرگدرووی پیاوانە، کەبەکرێ دابوویە کۆنە دۆستێکی خۆی و محەممەدیش شاگردی ئەو موغازەی بەرگدروونە بوو. لەبەر چەند هۆیەك برادەرەکەی بابم نەدەیتوانی دەو موغازەیدا کاربکات و محەممەدیش داوای لە بابم کردبوو موغازەکە بەکرێ نەداتەوە بەکەسی دیکە و ئەو بۆ خۆی کرێی مانگانەکەی چەندە دەیدا. بابیشم بەهۆی سەرقاڵی و پڕکاریەوە ئەو موغازەیەی دابۆوە محەممەدی.

محەممەد بەرواڵەت گەنجێکی ئاراستە ورێك و پێك و بە ئەدەب بوو و هەر لەبەر بەدەنگەوە چوون و خۆش خزمەتیە بابە گەورەش بە تەواوەتی ئەوی (بابە گەورە) بەلای خۆیدا راکێشابوو و بەوەش کە دەیزانی لەلای بابە گەورەی خۆشەویستەو قسەی دەڕوا بابە گەورەی دەکاتە پێناوی مەبەستە عیشقیەکانی خۆی و تا ئێستا بابەگەورە چەند جارێکانی داوا لە بابەی کردووە تا وەڵامێکی ئەرێی محەممەدی بدەینەوە.

دەگەڵ ئەو هەموو نارەزایەتیەی منیشدا بەو دەسەڵات و نفوزە گەورەییەی کە دەنێو بنەماڵەیدا هەیبوو ماڵێ محەممەدی مۆڵەت داوە شەوی هەینی بۆ خوازبێنیە بێنە ماڵێ مە. لەو رۆژە بە دواوە من دەگەڵ دایك و بابم تێکدا تا بەڵکە ئێ ئەوە خوایە نەیەڵن ئەو هات و باتی خوازبێنیە شوومە سەربگرێ بەڵام هێزو تواناو نفوزی بابە گەورەی بەسەر دایك و بابمدا ئەوەندە زۆر و بەجۆرێکی ئەوتۆ بوو کە ئەوان کەمترین لایەکیان بەلای مندا نەکردەوەو هەر گوێشیان نەدامێ. دوو رۆژی تەواو لە ژوورەکەی خۆم نەهاتمە دەرێ و خۆم دەژوورێدا زیندانی کرد و هەر گریام. بەڵام دیسانەوەش کەس گوێی نەدایە گریان و فرمێسکەکانم. شەوی هەینی هات و میوانەکانیش هەرهاتن، دایکم هەرچی کردی و کراندی نەیتوانی لە ژوورێم بێنێتە دەرێ و رازیم کا بچمە هۆڵی میوانان و چۆن داب و دەستوورە ئاوا بچم چای بۆ میوانان بگێرم. دوای سەعاتێکی بەبێ ئەوەی میوانەکان من ببینن ماڵێ مەیان بەجێ هێشت و رۆیشتنەوە لەپشت شووشەی پەنجەرەوە چەمبۆڵەو نەفرەتێکی خەستم لە حەشیمەتی خوازبێنیکەران کردو بە دەنگێکی بەرزەوە گوتم:

- ئەگەر بۆ خوازبێنیە ئەوەندە بێن دەبێ بۆ شەڕێ چەند کەس وە ڕێ کەون، سـەیریان کـە هەر دەڵێی لەشکری شکاو وبەزیون. ئەوانە کە ئەوەکەس وکارو خاو خێزانیان بێ ئـەدی دەبـێ تیرە وهۆزو عێل و تەباریان چەندبن؟

دوای ڕۆیـشتنێیان دووبـارە چـوومەوە سـەرجێیەکەی خـۆم و درێژبوومـەوە و دوای چـەند دەقیقێکانیش دایکم هاتە ژوورەکەم و لەپشت سەرمەوە دانیشت و گوتی:

- رەها هەستە دانیشە باهێندێك قسان بکەین.

بەناچاریەوە هەستام و لەسەر جێیەکەی خۆم دانیشتم. دایکم لەسەر لێوی جێیەکەمی جێی خۆی خۆش کرد. زەردەیەکی سۆزدارانەی بە روخسارە غەماویەکەمدا کرد و گوتی:

- دەتوانین وەك دوو ئاواڵی یەکتری پێکەوە دەردە دڵێکی بکەین.

سەرم بەردایەوە و هیچم نەگوت یانی نـەموێرا کـە راسـتی بەسـەرهات و ڕووداوەکـەبڵێم. دەترسام ئەگەر دایکم ئەوە ببیسێ بیکاتە هات و هاوار بەڵام ئەو بەمنی گوت وەك دوو ئـاواڵ پێکەوە بدوێین و قسان بکەین. بۆیە گوتم:

بەڵێ، تەنیا بەناوی دوو ئاواڵەوە.

دایکم پێکەنی و گوتی:

- حەز دەکەم راستیەکان بەمن بڵێی، گیرو گرفت چین؟

گوتم:

- دەمەوێ خوێندنەکەم تەواوکەم.

دایکم دەستێکی بەقژیدا هێنام و گوتی:

- ئەوان گوتیان هاوینێ دەیگوازینەوە تا تۆ خوێندنەکەت تەواوکـەی ئـەوە غـەمی نـاوێ ئازیزم. بێ ئیختیار قیژاندم:

- من ئەوم خۆش ناوێ و ئەویشم هەر ناوێ، دایە من ڕقم لێی دەبێتەوە دەشـیزانی ڕقم لێیەتی.

دایکم لەسەرخۆ پرسی:

- بۆ؟ خۆتۆ هەرگیز ئەوت هەرنەدیوەو ناشیناسی کەواتە چـۆنت ڕق لەیـەکێکی دەبێتـەوە قەتت نەدیبێ و نەناسیبێ؟

سەرم بەردایەوەو وەڵامم دایەوە:

- من زۆرم باوەڕ بەیەکەمین سـەرنجە، مـن هـەر لەیەکـەم سـەرنجەوە ئـەوم دەدزێ و ڕقـم لێیەتی، دەزانی کەی دەڵێم، مەبەستم هەمان ئەو شەوەیە کە هاتبوو دەگەڵ بابمدا بدوێ.

دایکە زەردەیەکی هاتێ و گوتی:

- ئەوانە هەموو نیشانەی شتێکن.

سەرم بڵندکرد و بەسەرسامیەوە پرسیم:

- نیشانەی چین؟

دایکە تاوێکی بێدەنگ بوو و بەوردی دە روخسارمەوە راما، چاوی دەچاویەوە بڕیم و پرسی:

- نیشانەی ئەوەن کەیەکێکی دیکەت خۆش دەوێ؟ مەزەندەکەم راستە؟

بێ دەربەستانە گوتم:

- بەڵێ، چاکی بۆ چوو وی من یەکێکی دیکەم خۆش دەوێ.

دایکە بە ئارامیەکەوە پرسی:

- کێت خۆش دەوێ؟

- ئومێدم...

دایکە بەهەوتیەکەوە دەستی بەدەمیەوە نا تا هاوارەکەی کەهەموو سەرسامی بوو بەرزنەبێتەوە.بەنیگەرانیەوە پرسی:

- ئومێد کێیە؟

قسەیەك بوو کردبووم و تازە نەدەکرا بیگێڕمەوە بۆیە بەناچاری باسی هەموو شتێکم کرد.

دایکە بەئارامیەوە گوێی بۆ قسەکانم گرت و ئەوجا بەنیگەرانیەوە پرسی:

- ئایا قسەتان پێکەوە هەن یانە نا؟

هەروا بەدەم گرانیەوە گوتم:

- نا هەرگیز، سوێندێ دەخۆم.

دایکە هەناسێکی ئاسوودەییەی هەلکێشا و گوتی:

- باشە تۆ چووزانی کە ئەویش تۆی خۆش دەوێ. خۆ ئێوە قسەیەکتان دەگەڵ یەکتردا نەکردووە ئەدی چۆن ئاوا بەڕاشکاوانە وەڵام دەدەیتەوە؟

بەتێماوی و شەکەتی و ماندووەتیەوە وەڵامم دایەوە:

هەروا لەچاوو شێوەی سەرنجەکانیەوە زانیم کە ئەویش منی خۆش دەوێت، وبەوهاتوچۆیانەشی کەبەبیانووی جۆراوجۆرەوە دێتە ماڵێ و بەزۆرشتی دیکەشڕا.

دایکە سەیرێکی تێکەڵ بە بەزەییانەی کردم و گوتی:

- ئەگەر تۆ راست دەکەی و یا ئەگەر وایە خۆ دەبوو تا ئێستا هەر نەبایە قسێکی دەگەڵ
ـ. هەرکردبایە کە ئاگاداری ئەو خۆشەویستیەی خۆی بۆ تۆ کردبایە، تۆ چووزانی کە ئەو
ـخهێنێ، لەوانەیە...

ـیمی گوێم لەقسەکانی دایکم نەگرتەوە، وەك ئەوەی جامە بەفراوێکم بەسەریداکەن، هەموو
ـتـ دڵەرزی، قسەکانی دایکم هەمووی راست بوون، ئومێد هیچ کاتێ قسێکی بەسەرزمانیدا
ـحـتبور یا شتێکی وای نەکردبوو کە سەرنجی من بەلای ئەو عیشقەی خۆیدا بەرامبەر من
ـ ێنێ وەك دەمیان بەستبم، دەخۆم نەدەگەیشتم، هەرچەندەم خۆ رادەنا زیاترم پەی
ـقسەکانی دایکم دەبرد. دایکیشم کە زانی حاڵم تێکچوو وازی لێ هێنام. کاتێ کە
ـیهەویست لە ژووری بچتە دەرێ گوتی:

- باشە، بیر لە قسەکانی من بکەوە، حەز ناکەم لەقە لەبەختی خۆتدەی و بەهیوای
عیشقێکی یەك لایەنە و لاواز، دەست بەسینگی هەموو ئەو خوازیارانەتەوە بنێی بەڵکە ئەوە
حوایە ئومێد رۆژێکی بێتە خوازبێنیە.

ئەو شەوە دوای ئەوەی دایکم ژوورەکەی بەجێ هێشتم تا بەیانی وەك گیانێکی وەیلان و
سەرگەردان دەماڵێدا هەر دەهاتم و دەچووم وبیرم دەکردەوە، جاری وابوو بڕیارم دەدا کە رێك و
راست بچم و هەرچی دەدڵمدایە بۆ ئومێدی هەڵڕێژم بەڵام هێشتا چەند دەقیقەیەکی پێنەچوو
بوو کە بە خۆنازینەکەم لەو جۆرەکارەی دەگێڕامەوە و نەیدەهێشت.

بەیانی زوو بە مۆڵەتی دایکم چوومە ماڵی خاڵم. حەزم لێبوو خاڵۆژنم قاوەیەکم لەو قاوانە
بۆ بگرێتەوە کەجێ متمانەو باوەڕی هەموو بنەماڵەکە بوو. هەرکە گەیە ماڵێ خاڵم خاڵۆژنم
بەدیتنێم دەوکات و ساتەی رۆژێدا سەری سوڕما بەڵام بەسەر خۆی نەهێنا و بەسەرنجە
پرسیاراوییەکانیەوە فەرمووی ژوورێی لێ کردم. دوای چەند دەقیقەیەك خۆ هێنان و بردن
مەبەستی هاتنێ ماڵێیانم پێگوت.خاڵۆژنم بەمیهرەبانیەوە گوێی بۆ قسەکانم گرتبوو و
هیچیشی نەدەگوت. دوای تەواو بوونێ قسەکانم بێ ئەوەی یەك وشە بڵێ چووە مەتبەخێ و
قاوەی لێنا.

دوای ئەوەی قاوەی ناو فنجانەکەم خواردەوە خاڵۆژن داوای لێکردم تا نییەتێ بگرمەوەو
فنجانی قاوەکەم بەسەر ژێر پیاڵەکەیدا نخوون کەمەوە. منیش بەبێ هیچ پرسیارێك وامکردو
دوای چەند دەقیقێکان خاڵۆژن فنجانە قاوەکەی هەڵگرت و سەیرێکی ناو فنجانەکەی کرد و لە
رووی داخەوە سەرێکی باداو گوتی:

- ڕەها گیان، ئازیزەکەم تۆ بەو قسانەی من باوەڕمەکە و قبوڵت نەبێ کەمن دەیانکەم چونکە هەروەك بۆ خۆشت دەزانی ئەو قاوە گرتنەوەی من هەر تەنیا بۆ خۆشی وسەرقاڵیە خۆمەو بەس بۆیە نابێ کارێك بکاتە سەرناخ و دڵ و دەروونت. بۆیە من وای بەچاکتر دەزانم کە ئێستا دەربارەی بارودۆخی گیانی و ناخ و دەروونی تۆ هیچ نەڵێم یا هەر حەزیش ناکەم جێ پەنجەم بەسەر هیچ یەك لە بڕیارەکانی تۆوە دیاربێت.

من دەستبەجێ قسەکانی خالۆژنێم بڕی و گوتم:

- تکا دەکەم خالۆژن، بۆ خۆت چاك دەزانی کەتا ئێستا قاوەت بۆ هەر یەکێك لە خزم و خوێش وناسیاوان گرتۆتەوە هەمووی وەڕاست گەڕاوەو وابووە بۆیە منیش هەر لەو پێ و دانگەوە زۆر لە قاوە گرتنەوەکەی ئێوە دڵنیام دەزانم هەرچی کە دەیڵێی ڕاستە و هەر بۆیەش هاتوومە ئێرە تا ڕێنماییەکم بکەن.

خالۆژن هەروا کە بەوردیەکەوە سەیری قاوەکەی دەکرد هەناسێکی هەڵکێشاو گوتی:

- بەڵام ڕەها گیان من تا ئێستا قاوەم بۆ هیچ کچێکی کەلەسەر مێردکردنێیە نەگرتۆتەوەو ئەوەشم بەلاوە چاکترە کە هیچ نەڵێم. ئەو ئامۆژگاری و ڕاسپاردەیەشم بۆ تۆ هەیە کە بەچاوێکی کراوەو هزرو مێشکێکی ڕۆشن و گەشن و گەشەوە بڕیار بدەی‌و ئومێدەواریشم خۆشبەخت و بەختەوەر و کامەران بێت.

لەسەیرکردنەکانی خالۆژنێوە لە فنجانی قاوەکە بەتەواوی دیاربوو لەشتێکی دەترسی کە دەیبینێ. بەڵام حەزی نەدەکرد منیش بەقسەکانی خۆی نارەحەت کا، هەرچیەکم دەکرد و دەکراند مۆری بێدەنگییەکەی توندو تۆڵتردەبوو. بە نائومێدییەوە لەقسەنەکردنێ خالۆژنێوە ماڵئاواییم کرد و هاتمە دەرێ. زۆرم حەز دەکرد بزانم خالۆژن بۆ قاوەکەی بۆ گرتمەوە بەڵام هیچیشی پێ نەگوتم و چیشی دیت کە بەو جورە سەر و رووی تێکنا و گرژیەوە، هەرچەندەکە ئەو دەشیگوت کە ئەو کارەی هەر بۆ خۆشی و سەرقاڵیە خۆی دەکات بەڵام دەشمزانی کەقسەکانی زۆربەیان ڕاستن و ئاگاداری ئایندەی خۆمی دەکردم وپێی دەگوتم... دەبیرو خەیاڵەکانی خۆمدا خولم دەخوارد کە هۆڕنی نەپساوەی مۆتۆرێك کە بەو پەڕی خێراییەوە بەرەو لای منەوە دەهات وریای دەوروبەرمی کردمەوە بەڵام تازە درەنگ ببوو و ئازارێکی کوشندەم لە تەواوی لەشی خۆمدا هەست کرد و ئیدی ئاگام لە هیچ نەما.

❊ ❊ ❊

کاتێ که چاوم کردەوە دەموچاوی گریاناوی دایکمم دیت کە بە چاوێکی نیگەرانەوە تێیدەڕوانیم. کاتێ کە چاوە نیوەکراوەکانی منی دیت بە توندی دەباوەشێی وەرێنام و بەدەنگێکی بەرزەوە بەکوڵ گریا. گوێم لە دەنگی بابیشم بوو کە داوای لە دایکم دەکرد تا خۆی ڕ گرێ و بەسەر مێشکی خۆیدا زاڵ بێ و منیش کەمتر ڕاتەکێنێ. بەدیتنێ دایك و بابم بەکوڵ گریام و ئەو ئازارەی قاچیشم هێندەی دیکەی گریاندم. دوای سەعاتێك کە تۆزێك هێور بوومەوە زانیم کە ئێسکی گۆزەنگی پێم شکاوە و مۆتۆڕ سوارەکەش هەڵاتووە. خەڵکی منیان گەیاندبووە نەخۆشخانەو ژمارەی تەلەفۆنی ماڵێشیان دەجانتایەکەمدا دۆزیبۆوەو ماڵێیان ئاگادار کردبۆوە.

ئازاری پێیەکەم واکلافە کردبووم کە پەرەستارەکە دەرزی ئازارێی بۆ کردم نەمزانی کەنگێم خەو لێ کەوت. دوای سەعاتێکی لە دەنگی ژاوەژاوێکی وەئاگا هاتمەوە کە ئەو ناوەی داگرتبوو چاوم کردنەوەو ئەو دیمەنەم باوەڕ نەدەکرد کە دەمدیت دەتگوت دەنێو باغی گوڵانیاندا درێژکردووم، تەواوی ژوورەکە پڕبوو لە کەسوکارو خزم و خوێش و ئاشنا و ڕۆشنایان کە هاتبوونە سەردانێم. بە چاوپێکەوتنێیانم گری هاتێ و فرمێسکی تاسەم دەچاواندا قەتیس ما و دوای ئەحواڵپرسییە یەکە یەکە یان سوپاسی هەمووانم کرد. دەنگی ئومێدی لە جێی خۆم وشك کردم کە لە وەڵامی مندا گوتی:

- تکا دەکەم ڕەها خانم، ئەوەندە چیە شایانی باس بێ، هیچمان نەکردووە. بەدیتنێ ئومێدی هێندە خۆشحاڵبووم ئازاری پێیەکەم لە بیرچۆوە. خۆشحاڵ و سەرمەستی دووبارە دیتنەوەی ئومێدی بووم کە ئاغای سادیقی دەگەڵ داکیدا هاتنە ژوورێ. بە دیتنی ئەوان تێکڕابووم و بە خۆمم گوت:

ئەوان لە کوێیان زانیوە؟

بەناچاری زەردەخەنەیەکم هاتە سەرلێوان و چاك و چۆنیەکم دەگەڵدا کردن. هەوڵم دەدا خۆم لە سەرنجە تیژەکانی ئاغای سادیقی بدزمەوە. ئەوە ئاغای سادیقی هەروا بەسەرنجە کرپارییەکانیەوە دە سەرتاپای ئومێدیەوە دەڕوانی و چاوی لەسەر هەڵ نەدەگرت هێشتاش ئەو حاڵەتە دەستە پاچەییەی لە هاتنە ژوورێ ئاغای سادیقیەوە تووشم ببوو نەڕەویبۆوە کە یەکسەرە سەرو سەکوتی محەممەدیش بەخۆو بەچەپکە گوڵێکی گەورەوە دەگەڵ دووخوشکانی پەیدا بوو. هێندەیان لە دیتنێ تووڕەبووم کە بەزەحمەت خۆم ڕاگرت تا وەڵامی چاك و چۆنیەیان بدەمەوە. یەکێك لە خوشکەکانی کە ناوی مەنیژە بوو بەناز و نووز و لەنجەولارێکەوە چاوێکی لەداکی کردو گوتی:

- ئا ئەوە رەها خاتوونە ئێمە ئومێدەوار بووین ئەوی بەسینییە چایەوە ببینین نەك بەقاچی شکاوەوە لەسەر تەختی نەخۆشخانە.

محەممەد کە گوایە منی بەئی خۆی دەزانی هاتە پێشێ وبێ پەروا لە بەرامبەر هەموانەوە گوتی:

- سوپاس بۆ خوا کە سەرە وخێرە و بە خێرگەڕا، بەخودای کەزانیم مۆتۆر لێیداوی دنیام لە پێش چاوان تاریك بوو و ڕەش داگەڕا، حەزم دەکرد هەر دەومیدا لەوێ بام و ملی مۆتۆڕ سواری بێ ئاگام ورد کردبایە کە ئاوای لە تۆی هیوای لە ژیاندا کردووە.

- لەپڕ بێدەنگییەکی قورس ژوورەکەی داگرت و منیش لە تووڕەییان دەستەکانم دەستیان بەلەرزینێ کرد. دەو ساتەیدا حەزم دەکرد زەوی قلێشابایەوەو قووتی دابام، ئای کە ئەو پیاوە هیچ و پووچ و بێ شەرم بوو کە ڕێی بە خۆیدا ئاوا لە بەردەمی هەموو ئەو ئامادە بووانەو لەبەردەمی دایك و بابمدا ئەو قسانەی کرد. بە تووڕەییەوە رووم لێ وەرگێڕاو بە نارەحەتیەوە گوتم:

- باشتر کە مۆتۆڕ سوارەکە هەڵات و ئەوەش بزانە کەمن هیواو ئاواتی ژیانی ئێوەش نیم، ئاغا خراپی تێگەیشتوون، دیارە خەونتان دیوە!

بابە دەستبەجێ هاتە پێشێ و سوپاسی هاتنی محەممەدی کرد بۆ نەخۆشخانە. دەنێو ئامادەبوواندا بەدوای ئومێددا گەڕام بەڵام ئومێد رۆیشتبوو. دڵنیا بووم کەلە قسەکانی محەممەدی تووڕە و نارەحەت ببوو و چونکە خۆشی پێ نەگیرابوو لە ژوورەکە چووبووە دەرێ. ئیدی توانای مانەوەی میوانەکانی دیم نەمابوو. ئازاری پێیەکەم کردە بیانوو و دەستم بە گریانێ کرد. دەمزانی ئومێد لە خەفەتان منی بەجێ هێشتووە.دایك و بابم کە نارەحەتیەمنیان ئاوا دیت یەکسەر پەرستاری بەشەکەیان ئاگادار کردەوە و داوایان لێ کرد ئەگەر دەکرێ دەرزییەکم لێدا تا ئازاری پێیەکەم بشکێ. بەڵام بە داخەوە کە ئەوان نەیاندەزانی کە ئازاری من بە دەرزی ئازارشکێن ناشکێ.

وردە وردە میوانەکان ژوورەکەیان بەجێ هێشت و رۆیشتن بەڵام محەممەد هەروا بەتەك بابەوە راوەستابوو و قسەی دەکرد تەنانەت دەگەڵ خوشکەکانیشی نەچۆوە و بەڕێی نەکردنەوە. ئاغای سادیقی لەبەر پەنجەرەکەوە وەستابوو و سەیری دەرەوەی دەکرد, دایکیشی سەرگەرمی قسان بوو دەگەڵ دایکمدا. هەرجارێکی چاوم بە محەممەدی دەکەوت پێم خۆش بوو هاوارکەم:

- ئەو هەتیوە زۆر بڵێیە باوێنە دەرێ و دەریکەن. بەڵام چبکەم کە ناچاربووم بێدەنگ بم، بێدەنگییەکی قورس و کوشندە کە گەرووی دەگوشیم. حاڵی حەمیدیش لە حاڵی من

ر نەبوو و هەر جارێکی کەسەیری محەممەدی دەکرد نیشانەی تووڕەییەی بەتەواوی
د:سەرنجەکاندا دیاربوو و ئاگری ئیرەییەی دەچاوەکانیدا زمانەی دەکێشا. هەروا بۆ ساتێکم
ڕوو وەرگێڕا و بەنا ئومێدیەوەم سەیری دەرکێ کرد، خودایە چیم دەدی، ئومێد لە ناو
دەرکێ ڕاوەستابوو و سەیری منی دەکرد. هەروا بۆ چرکەیەك سەرنجەکانمان تێك ئالقان بەلام
ئەو هەر خێرا سەرنجەکەی لەمن دزیەوە. دەمم کردەوە هاوارکەم نا نەکەی توبی و خوا
دریغی ئەو سەرنجەتم لێ مەکەو بەسەعات سەیرم کە، هەر جارێکی کە سەرنجەکانت بەرەو
خۆمەوە دەبینم تین و توانا و وزەیەکی تازەم دێتەوەبەر، تکا دەکەم تۆش هاوارکە و بلێ کە
خۆشم دەوێی دەهاوارکە با هەموو گوێیان لێ بێ تا ئیدی کەس گومانی لە عیشقی مە
نەکا. بەلام ئەفسوس کە لەبەر ئەوانەی کە لە ژووری مابوونەوە نەیانهێشت و هاوارەکەم دە
ئەوکێدا خنکا.

ئاگام لێ بوو کە دایکم دەگەڵ خانمی سادیقیدا قسان دەکات بەلام هەموو هەست و
ئەستیشی بەلای من و ئومێدەوەیە. ئومێد سەرنجێکی لە محەممەد و دوایەش سەرنجێکی لە
ئاغای سادیقی دا و بەرەو لای بابەوە چوو و ڕاست بەتەنیشت محەممەدیەوە ڕاوەستا. ئێستا
هەرسێ ناحەزی یەك، بە تەنیشت یەکتریەوە وەستاون و هەر یەکەیان هەولی ئەوەیەتی بەهەر
جۆرێك بووە مەیدان بەناحەزەکەی چۆڵ کا.

ئومێد بە دەنگێکی پیاوانە و بەناوازێکی بە ئەدەبانەوە ڕووی کردە بابە و گوتی:

- ئاغای مولکی تکادەکەم ئێمەش هەروەك کوڕی خۆتان دانێن و ئەگەر هیچم لەدەست
دێ بفەرموون تا هەر ئێستا ئەنجامی بدەم. دلنیابن دەیخەمە سەرچاوم.

بابەش بە میهرەبانیەکەوە دەستی خستە سەرشانی ئومێد و دە وەلامی ویدا گوتی:

-زۆر سوپاس کوڕەکەم، هەروەکو گوتتان ئێوە و سالار هەر دووکتان وەك یەك ئازیزن، هیچ
ئیشێك نیە هەر کاتێکیش ئیشێك بوو دلنیابن پێتان دەلێینەوە.

محەممەد هاتە نێو قسەکانی بابەوە و گوتی:

- نەخێر ئاغا، زۆر سوپاس، ئێوە زەحمەت مەکێشن، من بۆ خۆم بەهەموو کارەکان
ڕادەگەم، هەرچی بێ ئاغای مولکی و هەموو بنەماڵەکەیان هەقیان بەسەرمنەوە هەیە دلنیابن
ئەگەر بۆ ساتەوەختێك چیە ئاغای مولکی و بنەماڵەکەیان بەتەنیا جێ ناهێڵم، زۆر سوپاسی
ئێوەش دەکەم ئەگەر ئێوەش ئەو ئەرکەی بەمن بسپێرنەوە.

ئومێد سەرنجێکی کینە تۆزانەی گرتە محەممەدی و هیچی نەگوت، حەزم دەکرد دەو ساتەیدا لەجیاتی ئومێدی بە محەممەدم گوتبایە، تۆ هەر لە خۆوە لە هەموو شتێکی هەڵدەدەیەی. بەڵام بە داخەوە کە لەترسێ سەرزەنشتێ دایك و بابانم نەوێرا و پاشگەزبوومەوە.

سەرنجێکم لە ئومێد و دوایەش سەرنجێکم لە ئاغـای سـادیقی و محەممـەدی دا کـە هـەرگیز نەدەکرا ئومێدی دەگەڵە واندا راگری. هەر چۆنێکم تەماشای ئومێدی دەکرد دلّم پێی دەسـووتا و لەرزێکی شیرین دلّی دادەگرتم. ئەوم لە تەواوی پیاوی دنیایە پێ جـوانتر و خـۆش پەیکـەرتر دەهاتە بەرچاوان. ئومێد ئەوکەسە بووکە بەتەنیا خۆشمدەویست و حەزم لێی بوو. ئومێد تاکـە کەسـی هەموو خەونەکانی من بوو کە حەزم دەکرد دەست لەناو دەسـتی ئـەو هـەنگاوم بـەرەو هێلانەی بەختەوەریەوە نابایە، بەڵام ئەفـسوس کە هەموو لە هەمووی ئەو خۆزگانە تەنیا یـەك ئارەزوو و خەیاڵێکی باریك و لاواز بوو. ئومێد بەرەولای منەوە هات و بە زەردەخەنەیـەك کـە هەموو گیانی ئاگردام گوتی:

- هیوادارم هەروا بەو زووانە لە ماڵوەتانم چاو پێ بکەویەوە و ئیدی ئێوە لەو جۆرە جـێ و بانە و...

محەممەد هاتە نێو قسەکانی ویـەوە و چاپووکانە گوتی:

- رەها خاتوون پێویـستیان بە حەسانەوێیە بە یارمەتی قـسەکان کـورت کەنـەوە. ئومێـد سەرنجێکی تووڕەییانەی دایە محەممەدی وەلێ بەتەواوی ئـەو نەجابەتـەوەی کـە هـەیبوو خـۆی راگرت و گوتی:

- زۆر چاکە نارەحەتیان ناکەم.

تەواوی جومگەکانی بەدەنم و هەموو خانـەکانی لەشـم دە ئـاگری نـەفرەت لـە محەممەدیـدا دەسووتا بێ ئیختیار ددانەکانم دەچیڕەوە بـردن. ئیـدی بـێ ئەدبیـەکانی ئـەو پیـاوە چـاپووکە کلافەیان کرد بووم. پێش ئەوەی کە بشتوانم هیچ بلێـیم ئومێـد بـەخودا حافیزیـەکی کورتـەوە ژوورەکەی بەجێ هێشت. منیش چاپووکانە بە بابم گوت:

- ئیدی ماندوو بووم ئەگەر دەکرێ دەمەوێ هێندێك وەحەسێم، دەنگی قـسەکردنی ئێـوەو ئەو ئاغایە حەسانەوەیان لێ بڕیوم و هەراسانیان کردووم، تکایە داوایان لێ بکەن بـا پاشمـاوەی قسەکانیان جگە لێرە ببەن لەجێیەکی دیکە تەواوکەن.

دایك و بابم هەردووکیان بە هەوتیەکەوە لەو قسە بێ ئەدەبانەیەی منەوە سـەیرێکی یـەکتر یان کرد و چونکە دایکیشم ئاگـای لـە بەسـەرهاتەکەبوو پـێش ئـەوەی بابـە نارەزایەتیـە لـە ڕەفتارەکەی من دەر ببڕێ گوتی:

- باشه ئازیزەکەم، هەقتە بەڕاستی ئێمە لەبیرمان چوو بۆوە کە تۆ پێویستیت بە حەسانەوەیە، هەر ئێستا ژوورەکە چۆڵ دەکەین تا بتوانی کەمێك بحەسێیەوە.

دایکم هاتە لامەوە تا روومەتم ماچکا، بەسپایی بەگوێیمدا چرپاند:

- تکات لێ دەکەم کارێکی وابکە باچیدی ئەو هەسای گیانە نەیەتە ئێرە. دایکم لەسەرەخۆ قۆڵی گوشیم و گوتی:

- زۆر دزێوە دەتوانم چی پێ بڵێم.

ئامادەبووان یەك بەدوای یەکدا هیوای سەلامەتی و چاکبوونەوەیان بۆ خواستم و ژوورەکەیان بەجێ هێشت.

محەممەدیش هاتە پێشێ و گوتی:

- ئومێدەوارم بەو زووانە...

چوومە نێو قسەکانیەوەو گوتم:

- سوپاس، تکایە قسەکان کورت کەنەوە، دەمەوێ کەمێك بحەسێمەوە. محەممەد تێکڕا بوو بەلام دەستبەجێ بەسەر خۆیدا زاڵ بۆوە و گوتی:

- زۆر چاکە خودا حافیز.

ماوەی هەفتێکی لە نەخۆشخانەی مامەوەو دەو ماوەیەشدا محەممەد بەخۆش خزمەتیەکانی جێی خۆی دەدڵی دایك و بابمدا کردبۆوەو خۆی کردبووە هەنارە شیرینە، بەلام هەر جارێکی کە دەمدیت هەستی نەفرینم لێی زیاتر و زیاتر دەبوو و نەفرەتەکەم لێی چنگی لە دڵی دەدام.

دوای دوومانگان دووبارە تا دەهات بە تەواوی هاتبوومەوە سەرخۆو چاك ببوومەوە، بەلام دیسانەوەش کاتی رێ کردنێ ئێشێکی کەمم لە گۆزەنگێ پێمەوە هەست دەکرد. لەیەکێك لەشەوە گەرمەکانی مانگی موردادێ بەئارامیەکەوە چاوم دە ئاسمانی پڕ لە ئەستێرەوە بڕیبوو کە دووبارە محەممەد دایکی و هەردوو خوشکەکانی بۆ خوازبێنیە ناردبوونەوە مالێ مە. دوای ئەو کەمە هێوریەی کە دەو ماوەیەمدا هەبوو دووبارە تۆفانێکم دەمێشکیدا هەستایەوە. بەردەوام لە خۆمم دەپرسی:

- باشە ئەو لەعنەتیانە بۆ دەست لەیەخەی من ناکەنەوە؟ ئەدی نالێن دڵ ئاوێنەی دڵە ئەدی بۆ دەگەڵ ئەو هەموو نەفرینەی کەمن لە محەممەدیم هەیە و هەمیشە تێ دەکۆشم تا بەهەرچی رێگایەکەوەیە تێی بگەیەنم کەچی ئەو هەمدیس سوورە لەسەرهێنانی من؟

دووبارە هاتن و چوونەوەی دایکم بۆ ژوورەکەم دەستی پێ کردەوە بەلام هەرجارێکی کە دایکم داوای لێ دەکردم کە بچمە هۆڵی میوانان و هەرنەبێ چاك و چۆنیەکی دەگەڵ میوانانـدا

بکەم بەگریانەوە بەرپەرچم دەدایەوە و نەدەچووم. ئەو شەوەش هەر بەو کەللە رەقیەوەی پێشانم دا نەچوومە لای میوانان.

بەیانی رۆژی دوایی ئاغای گەورە هاتە مالیّ مە و منی بانگ کردە لای خۆیەوە. منیش بەکۆڵێك غەم و خەفەتەوە چوومە ژووری میوانان. دایك و باب لە تەنیشت بابە گەورەوە دانیشتبوون، لەسەرخۆ سلاوم کرد. بابە گەورە جیا لە جاران بە وشکی وەلام دامەوە و بە ئاماژەی دەست تێیگەیاندم تا لەسەر موبێلەکە دانیشم.منیش پەیڕەویم کرد و دانیشتم. بابە گەورە سەرنجێکی دایە دایك و بابەی ئەوجا بەدەنگێکی کەشوێنەواری تووڕەییەی پێوە دیاربوو گوتی:

من ئەمرۆ بۆیە هاتوومە ئێرە تا هۆی ئەو کەللە ڕەقیەی تۆ بزانم، خۆ ئەو خەلکە گالتەجاری من و ئێوە نین و نۆکەری بابی ئێمەش نین! من هەرگیز پیم وانەبوو و هەرگیزیش چاوەڕێی ئەوە نەبووم لە فەرهاد و نەسرینێ منداڵی واخیرە سەر وبەرەللا پەروەردەکەن، ئێوە ئاگاتان لێیە چۆنتان ئابڕووی ئێمە لای محەممەدو کەسوکارەکانیان بردووە؟

من خۆم بەلێنی رەهام بەمحەممەدی داوە و هەروەك چۆنیش لەپێشدا گوتبووم من بۆ خۆم رەهای بەمێرد دەدەم ئێستاش دەلێم ئەو مێردەی کە بۆم دیاری کردووە هەمان ئەو لاوەیە و ئێستاش هاتووم بلێم رۆژی پێنج شەممەی هەر ئەم هەفتەیە شەکراوخواردنەوەی دەزگیرانەتیە بەرپا دەکرێ، و دەربارەی جیاز و مارەییەشم هەمووی بڕیوەتەوە و قسەم لێوەکردووە... هەر بۆیەش داوات لێ دەکەم کە باش گوێت بکەیتەوەو بزانی چ دەلێم ئەوەتا لێرە لە بەردەمی دایك و بابت پێتدەلێم کە دەست لەو خۆ بەناز کردنەی هەلگری، باشە من نازانم ئەو گەنجە چ عەیبێکی هەیە کە تۆ واهێندە نازان دەکەی؟ هەروەك چۆن کە بابت ودایکت هەموو شتان دەزانن من محەممەدی زۆر باش دەناسم بۆیە بەراستی حەیفە کە ئەو کوڕەی لەدەست خۆماندەین. بەڕاستی لەو دەور وزەمانەی زۆر بەدەگمەن دەتوانرێ گەنجێکی ئاوا باش و لێوەشاوەی وەك محەممەدی بدۆزیتەوە.

نیدی قسەکانی بابە گەورەم هیچیان بەلاوە ماناو مەبەستێکیان نەما بە یەکجاریم تەواوی دنیا بەسەر دا کاول و وێران بوو و ژیانم لە بەرچاوان تاریك و نووتەك بوو.

بابە گەورە دەگەلّ هەموو نارەزایەتیەکانی من و ئاگاداریشی کەمن هەرچی حەزە لە محەممەدیم نیە بەلێنی منی بە محەممەدی دابوو تا بەقسەی خۆی رێ بۆ کچەکانی دیکەش خۆش بێ و ئەمەش مانای کۆتایی تەواوی سەر ئێشەو جەنجالییەکانە و دە نێو بنەماڵەیدا کەس بۆی

ـب قسـه دەقسەی بابە گەورەو ویست و ئارەزووە کانیدا بکات و بە پێچەوانەی وی بجوولێتەوە.
جـ کیشم دەزانی کە ئیدی نارەزایەتییەکانی منیش هەمووی نەزۆکن و کاتێ کە بابەگەورە گوتی
ـتێ شووبکەی ئیدی هیچ چارەیەك نیە. تووڕەیی هەموو گیانی داگرتبووم بێ ئاگایانە سـەرم
ـــ کردو بە ئاغای گەورەم گوت:

- با بزانم داخوا ئێوە مێرد دەکەن کە لەجیاتی مـن و بـەبێ پرسـی مـن قـسـەتان دەگـەڵ محەمەدیدا بڕیوەتەوە؟ من هەرگیز نیازی مێرد کردنێم نیە و هیچ کەسێکیش ناتوانـێ ناچـاری شووکردنێم بکات.

بابە بە دەنگێکی بەرزەوە بەسەریدا شیڕاندم:

- بێدەنگ بە رەها، ئەوە تۆ شەرمێ ناکەی بەرووی بابە گەورەتدا دێیەوە؟

من خۆم بەکچێکی وەکو تۆوە هەڵدەنا بەڵام ئێستا ئەوە تۆ منت شەرمەزار کردەوە. هەروا کە لافاوی فرمێسکانم بە چاویدا دەهاتە خوارێ سەیرێکی بابم کرد و گوتم:

- منیش تا ئێستا شانازیم بە ئێوەوە دەکرد بەڵام ئەفسووس کـە نەمـدەزانی ئێـوە هـیچ کـاتێ منداڵەکانتان هەرگیز وەك مرۆڤ سەیر نەکردووە بەڵکە بە کاڵایەکی بێ نرخ و بێ بەهاتان سەیر کردوون و هەر کارێکی کە حەزتان لێی بێ بەو کاڵایانەتان ئەنجام داون و ئـەنجامی دەدەن و هەر بڕیارێکیش بدەن زۆر بە ئاسانی بەجێی دەگەیەنن، باشە بابە بـۆ ئـەوەی نەبـە مایـەی شەرمەزاری ئێوە و دایکم من هیچ قسەیەکم نیە و رازیم و قبوڵمە، ئێـوە چـۆنتان پـێ چـاکە وابکەن. دوایەش دە بارێکدا کە گریان هیچ دەرفەتێکی قسە کردنێی نەدەدام لە هۆڵی میوانان چوومە دەرێ و پەنام بردەوە ژوورەکەی خۆم و تا پاسێکی شەوێ هەروا دەگریام.

ئەو رۆژە و رۆژەکەی دیش هیچم نەخوارد و تەنیا داوای مەرگم لە خودا دەکرد بە زۆریـە و گریانێ دایکم بەیانی رۆژەکەی دی هێندێکم خواردن خواردو بڕیاریشم دا لەوە زیاتر ئەو دایکە ستەمدیدە و ماندوو و رەنج کێشە زەحمەت نەدەم. خۆم دایە دەست چارەنووس، هەموو شتەکان بە خێرایی تەواو بوون و بە نابەدڵیەوە بوومـە دەزگیرانـێ محەمـەدی. و ئەمـە بـوو سـەرەتا و دەستپێکی ناخۆشی و بەدبەختیەکانم...

# (٥)

ڕەها کە تا ئەو ساتە بە ئارامی و لەسەرە خۆییەوە دەگریا و پەڕ بە پەڕی کتێبی ...ەکەی بۆ دەخوێندمەوە ئیدی لێرەوە خۆی ڕانەگرت و بەدەنگێکی بەرزەوە لە پرمەی ...یی دا و کەوتە جنێودانی چەرخی چەپگەردی گەردوون و بەختەڕەشەکەی خۆی. ئەو ...یەکجارەکی ورەی بەردابوو و دەو دەمیدا لەهەموو شتێك و لە هەموو کەسێك بە دبین و ...گومان بوو. ویستم واز لە ڕەهای بێنم و بەجێی بهێڵم بەلاّم ڕەها نەیهێشت، هێندێکی حو... گرت و بەسەر خۆیدا هاتەوە و داوای لێ بوردنی لێ کردم لەوەی کە نارەحەتی کردووم.

...ەجێوە هەستا و ماوەیەك لە هۆڵی میوانانی دەست بە ڕاوێچکان کرد و ئەو فرمێسکانەش کە بێ ئیختیار بە ڕوومەتەکانیدا دەهاتنە خوارێ بە دەستەسڕە ئاوریشمینەکەی خۆی ...یسڕینەوە. کە هێندێکی فەرامۆشی بەبەرداهاتەوە بانگی گوێ ڕاگرتنی داستانی ژیانەکەی کردەوە. هەناسێکی هەلکێشا و بە پەنجە باریکەڵە و جوانەکانی فرمێسکەکانی سڕینەوەو ...ەدەنگێکی لەرزۆکەوە دەستی بە قسان کردەوە:

* * *

من و محەممەد دەناهەنگێکی خەست و خۆڵ و چڕو پڕدا بە فەرمی بووینە دەزگیران. دەرۆژی ئاهەنگەکەیدا دەموچاوە گرژ و مرج و مۆنەکەی من بووە مایەی سەرسوڕمانی هەموو لایەکی. میوانەکان بە ئاشکرا فسکەفسکیان بوو و بە ئاماژەی چاو و برۆیانیان من بەیەکتری پێشان دەدا و بەسەرنجە پڕ بەزەییەکانیانەوە سەیریان دەکردم.

دڵنیام کە لە ڕۆژی شەکراو خواردنەوە و مارەبڕیەکەیدا هەموو میوانەکان لە ڕووە گرژو مرج و مۆنەکەی منەوە دە هەموو بەسەرهات و مەسەلەکان گەیشتن بە جۆرێك کە دایکم دەهەل و دەرفەتێکی ڕەخساودا خۆی گەیاندمێ و سەری دەبنا گوێی نام و بە چرپە یەکەوە گوتی:

- ڕەها گیان ئەو سەرو سەکوت و ڕوخسارە چیە بە خۆتەوە گرتووە، ئێستا خوا دەزانێ کە میوانەکان چۆنمان بیر لێ دەکەنەوە و چییان بە خەیاڵدا دێت.

بە توورەییەوە گوتم:

- دەڵێن چی؟ لەوانەیە هەر لەوەی بترسی پاشەملە بڵێن دایـك و بـابی کـچەکەیان بـەزۆر بەمێرد داوە. یا بڵێن ڕەها هیچ حەزی لەو مێرد کردنە نەبووە؟ باشە بۆ مەگەر درۆ دەکەن؟

دایکم چاوێکی لێ سوور کردمەوە و ڕۆیی و بە تووڕەییـیـەوەم لێ دوور کەوتـەوە. کـەش و هەوای میوانداری و ئاهەنگەکە هەناسە سوارانە و ناخۆش بوو لە هەموو شی خراپتر ئەوسەما و سوڕدان و گەمەو وازییـە ناشـیرینانەی خوشـکە. بـچووکەکەی محەمـەدی هـەر بەیـەکجاری مێـشکی هـاڕیبووم. مەنیـژە کـەتازە لـە مێردەکـەی جیـابـۆوە هـەڵس و کـەت و ڕەفتـارە جرینانەکەی کە لەبەر چاوی هەموو کەس و کارو بنەماڵەیدا دەینواند هێندەی دیکـەی تـەریق دەکردمەوە.

شیرین دەو ساتەیدا کە هەموو سەرقاڵی تەماشـاکردنێ سـەما و سـووڕدانەکەی مەنیـژەی بوون خۆی گەیاندمێ و بەبن گوێمدا گوتی:

- باشـە ڕەهـا ئـەو عاجباتیـەت لـەکوێ دیوەتـەوە؟ ئـەوە کـەی بـە زاوایـان دەچـێ؟

بەشەرمەزارییەکەوە گوتم:

- ئەوە خوشکە بچووکەکەیەتی.

شیرین بەشەرمێکەوەو بە دەنگێکی بە ئەدەبانەوە گوتی:

- داوای لێبووردن دەکەم ڕەها، مەبەستم سوکایەتی ماڵێ دەزگیرانەکەت نەبوو.

لە وەڵامەکەی ئەودا گوتم:

- قەیدێ ناکا خۆ من نارەحەت نەبووم بۆ خۆشـم هـەر لـەو هـەڵس و کەوتانـەی دەیانکـا بێزارم.

شیرین سەرنجێکی پرسیارانەی دامێ و دەمی هەڵێنایـەوە تـا شـتێکی بپرسـێ بـەڵام کـە بەچاکی نەزانی وازی لە پرسـیاکردنەکە هێنا.

لەرۆژی ئاهەنگەکەدا دایکی محەممەدی دیارییەکی زێڕی زۆر جوان و بـە نرخـی لـە لایـەن محەممەدیەوە پێشکەش کردم. بەدیتنێ ئەو دیارییە بەنرخەی یەکجار زۆر سەرسـام مـام چـونکە دەمزانی محەممەد باری داراییەکەی باش نیە ئەدی چۆنی توانیبوو دیارییـەکی ئاوا بـۆ مـن بکڕێ؟ هەر لە هەوەڵێن سەعاتی هاتنی ماڵێ محەممەدیشەوە بە دیتنێ مەنیژەی خوشکی کە بـە بیانووی هەمە جۆرەوە خۆی دەگەیاندە بابم و دەستی دەکرد بەچاك وچـۆنی و تـۆ خـۆش ومـن خۆش دەگەڵ بابمدا لێی بێزارو بێزار بووم. بـابم سـاڵ و تەمـەنێکی وای نـەبوو و هـەروەك لـە

ـەر ییەشدا گوتم هەر گیز لێی نەدەهات منداڵی ناوا لەو ساڵ و تەمەنانەی وەك ئێمەی هەبێ، ـەر: جگە لەوەش کە بابم پیاوێکی تا بڵێی بەرچاو و جوان بوو. ئـەو ڕۆژە مەنیـژە بـێ پـەروا ـتی دەقسان گرتبوو و وەك پێشینان دەڵێن دەگەڵی گـەرم کردبـوو و بابیـشم واچـووبووە نـاو ـسەکانی مەنیژەوە هەروەك دە دنیایەکی دیدا بێت و هیچ ئاگای لـەو قـسەو بـاس وپلارانـەی : یکمەوە نەبێ. مەنیژەش هیچ گوێی نەدەدایە سـەیرو سەرنجە تووڕەییەکانی دایکم تا گەییـە ـەوەی کـە دایکـم هیـچی دی خـۆ ڕانـەگرت و هەسـتی ئیرەییـە ژنانەکـەی ورووژا و بـە تووڕەییەکەوە بە بابمی گوت:

- فەرهاد پێموایە کاری گرینگترت لە ڕاوەستان و گاڵتەو گەپ و گەنجەفان لە پێشە، وەك ـمیرت چووبێتەوە کە ئەوڕۆ ڕۆژی مارە بڕینی کچەکەتەو پڕئیش وکارین.

سەرنجە تیژەکەی دایکم، بابمی بە خۆ هێنایەوەو یەکسەر داوای لێبووردنی لە مەنیژە کرد و کەوتە دووی کارەکانی.

کەسی ماڵێ ئومێدی نەهاتبوونە شەکراو خواردنەوەو ئاهەنگی مارەبڕینەکەو منـیش نـەك هەر پێم ناخۆش نەبوو بەڵکە یەکجار زۆر خۆشحاڵیش بووم دیارە دەشپرسن بۆ؟

بەدوو هۆ، یەکەمیان ئەوەیە کە بەدیتنی ئەوان غەم و خەفەتم هێندەی دی زۆرتـر دەبـوو و ئەوەی دیکەش ئەوە بوو کە بە هاتنـێ وان و دیتنـێ هـەڵس و کـەوت و ڕەفتـاری جرپنانـەی مەنیژە جیاوازییە خانەوادەی خۆم و محەممەدی لە شەرمان دەمردم. هەرچەندە دەشزانم کـە دوای ئاهەنگەکە ئیدی ئامادە بووان تا ماوەیەکی دوور و درێـژ قـسەیان زۆرن بـۆ کردنـێ و ئـەوان قسانەش بە ماڵێ ئومێدی هەر دەگەنەوە. بەڵام دەوساتەیدا بە نەهاتن و لەوێ نەبوونێ وان زۆر دڵشاد و ئاسوودە بووم.

ئەوە دیارە کە ڕۆژی مارەبڕینێ جوانترین و خۆشترین ڕۆژەکانی ژیانی هەر کـچێکە بـەڵام من هێندە تووڕە و گرژو ئاڵۆز بووم دەتوانم بڵێم ئەو ڕۆژە ناخۆشترین ڕۆژەکانی ژیانم بوو. پاشان دوای چەندین سەعات دەرد و مەینەتی ئاهەنگەکە تەواو بوو و من و محەممەد بە فەرمی بووینە دەزگیران.

دە سەروەختی دەزگیرانیە شمدا من هیچ ڕوویەکم بـەلای محەممەدیـەوە نـەبووو گـەورەکانیش ئەوەیان بەشەرم و شکۆ و ئابڕوومەندییە من دادەنا بەڵام نازانم بۆ کەسێکیش لای بەو لایەنەدا نەدەکردەوە و گوێی نەدەدایە ئەوەی کـە محەمـەدیش هـیچ گرینگییـەك بـەمن نـادات ولام لێ ناکاتەوە.

ئــەو ڕۆژە بەیانییــەکی تــازە لــە خــەوێ هەســتابووم نزیکــەی مــانگێکیش بەســەر دەزگیرانەتیەماندا تێدەپەڕی ڕۆژی هەینی بوو و من بە پێچەوانەی ڕۆژەکانی پێشووەوە یەکجار شاد و شەنگوڵ و بەکەیف بووم.

دایکم ســفرەی قاوڵتییــەی ڕاخســتبوو و مــن و ڕاحیلــە و ڕازیــە و ســالار لەســەر مێــزی ناخواردنێ بووین. خوشکەکەی دیکەم شەوێ دی چــووبووە ماڵــێ خــاڵم. تازەمــان دەســت بــە قاوەڵتی خواردنێ کردبوو کە زەنگی دەرکەی لێی دا. سالار بــە خۆشــحاڵیەوە لــە جێــی خــۆی دەرپەڕی و گوتی:

-حەمەن مامە محەممەدە، مامە محەممەد، کێ گوتوویەتی ئەوە مامی تۆیە، ئیدی نابێ پێــی بڵێی مامە محەممەد هەر تەنیا محەممەدە و بەس تێگەیشتی! بابم لەشێوازی قسەکەم نارەحەت بوو و بە نابەدڵیەوە گوتی:

- ئەوە چ شێوازێکی قسەکردنێیە دەگەڵ برا بچکۆلەکەتدا؟ ئەو منداڵە گوناهی چیە؟ ئەوە نابێتە ئەوەی کە تۆ لە محەممەدی دردۆنگی ئەو نابێ خۆشیی بووێ.

بە تووڕەیییەوە گوتم:

- من لەمحەمــەد دردۆنــگ نــیم. بەڵکــە بێــزم لێــی دەبێتــەوە و نەفرینیــشی لێ دەکــەم، تێگەیشتن!

بابە دوو بارە بە نارەحەتیەوە شیڕاندی:

- ئەدی بۆ مێردت پێ کرد؟ خۆ خەڵکی گاڵتەجاری من و تۆنین؟

بەسەر سامییەکەوە سەیرێکی بابم کردو گوتم:

- لەمن دەپرسی بۆ مێردم پێ کرد؟ بۆ ئێوە گوێتان دایە هەست و نەست و خورپــەی دڵــی من؟ ئەوە هەر ئێوە و بابەگەورە نەبوون ئەو کاڵا ڕەشەتان بە باڵا بڕیم و بۆ خۆشــتان لەبــەرتان کردم؟ هەر بۆیەتان نەبوو ویستتان نەبە مایەی سەر شۆڕی ئێوەو بنەماڵەکەتان؟

دایکم وەك پاڕانەوەیەك گوتی:

- تکا دەکەم بیبڕنەوە ئێستا محەممەد گەیوەتە حەسارێ، گوێی لێتان بێ زۆر خــراپ دەبــێ، تکــا دەکــەم دەمــە قاڵییەکــەتان ببڕنــەوە. مــن و بابــە هــەردووکمان بێــدەنگ بــووین، دەو دەمیدابەوەی زۆر دڵخۆش بووم کە ئەوەی دەدڵمدابوو هەموویم بە بابەی گوتبوو چونکە حــەزم نەدەکرد بابە ئاوا دەست دەکاروبارو ژیانی خوشکەکانی دیکەمەوە وەردا و بەســەر هەڵەیــەکی تری ئاوادا بکەوێتــەوە. دوای چــەند دقیقێکــان محەمــەد هاتــە ژوورێ و بــەدەنگێکی بــەرز و

..یەکی گەش و شاد و خۆشحاڵەوە سلاوی کرد بە وەڵامێکی ساردو سڕەوە وەڵامیم دایەوە و ..یە' تێپەڕیم و چوومەوە ژوورەکەی خۆم و دەرگاکەم بەدوای خۆمدا داخستەوە. دوای چەند .خیقێکان بە هێواشی چەند جارێکان لە دەرکەی درا پێش ئەوەی وەلام بدەمەوە محەممەد ..رگکەی کردەوەو هاتە ژووری. بەدەنگێکی تووڕەوە گوتم:

- باشە من ڕێی هاتنە ژوورەوەم داوی وا هاتوویە ژووری؟

محەممەد بەنیشانەی ڕادەستیە دەستەکانی بلند کردن و گوتی:

- داوای لێبووردن دەکەم جارێکی دی هەڵەی وا ناکەمەوە، بەلام نەتپرسی بۆ هاتوومەتە مـ.نەوەتان؟

بەبێ وازیەوە وەلامم دایەوە:

- بۆ دەبێ هەر جارێکی کەبێیە مالێ مە هۆی هاتنەکەت لێ بپرسم کەبۆ هاتووی؟

دیارە هەر حەزت لێبووە بێیتە نێرە.

- کیژەڵەی بێ مجێز، بەڵێ هۆی هەیە و ئەویش ئەوەیە کە لەوەی خۆشتر سەردان و چوپێکەوتنی جوانترین کیژی دونیایە و هەروەها بێشم ئەو مانگە ڕۆشنایەی تاقی ئاسمانێ .نگهێشتی چوونە سینەمای کەم، چۆنە؟

بەلالووتێکەوە گوتم:

- ئەورۆ ناتوانم، لەبەرەوەی تاقیکردنەوەکان نزیکن و دەبێ خۆم بۆ تاقیکردنەوەکان ئامادە کەم، خەیالم وابوو کە هەر نەبێ بەلانی کەمەوە لەو ڕۆوە بە وانەکاندا بچمەوەو دواکەوتنەکانم پڕکەمەوە.

محەممەد بەبێ گوێدانە پلارەکەی من گوتی:

- خۆزێ منیش پەڕەیەکی یەك لە کتێبەکانت بامایە تا سەرنجتم بەلای خۆمدا ڕاکێشابایە.

نازانم بۆ یەکسەر دڵم پێی سووتا بە زەردەخەنەیەکی کاڵەوە گوتم:

- زۆر باشە قەشمەر، تا تۆ چایەکی دەخۆیەوە منیش ئامادە دەبم. بۆ ساتێك لە رووی محەممەدیدا تەریق بوومەوەو بە خۆمم گوت، گوناهی ئەو گەنجە چیە کە عاشقی من بووە و منیش کەمترین ڕوویەکی نادەمێ و لای ناکەم بەلادا، گوناهی وی چیە کەمن دڵی خۆمم لە جێیەکی دی دەگرۆی عەشق ناوە، بەتەواوی ئەو حەزو ئارەزووانەی خۆی بە ئایندەیەوە هاتووە دەستی بەرەو لای منەوە ڕاداشتووە باشە بۆ بەئاگری ناخۆشەویستیە منەوە بسووتێ؟

هەر بۆیەش بڕیارم دا مادامەکێ دەستی چارەنووس ئەوەی بۆ نووسیوم بۆ هەمیشە ئیدی ئومێد فەرامۆش دەکەم و لەبیر خۆمی دەبەمەوە و هەموو هەوڵ و تەقەللاو کۆششم بۆ خۆش گوزەرانی و بەختەوەری ئەو گەنجەی تەرخان دەکەم، ئێستاش کە قسەکانی دڵی خۆمم هەموو بە بابەی گوتووە هەست بەلەش سووکی و ئاسوودەییەکی تەواو دەکەم.

ئەوەم هەست دەکرد کە ئەو هەموو باری غەم و خەفەتەی کە بەسەر دڵ و دەروونمدا کەڵەکە ببوو هەموویان لابردووە، ئیدی بە خۆشحاڵیەوەو بە هیوای ژیانی هاوبەشیم دەگەڵ محەممەدیدا زۆر خێرا ئامادە بووم.

پێش هاتنەوە دەرێم لەژووری لەبەر ئاوێنەی سەرمێزەکەم راوەستام بە دەنگێکی بەرزەوە بەخۆمم گوت:

- ئیدی بۆ پێشەوە بەرەو ژیان و ئایندەو سبەینەیەکی شادو شەنگوڵ دەگەڵ مەردی ژیان و قۆڵ لە قۆڵی هاوسەرم.

دوای بەڵێن دان بەخۆم کەتەنیا هەر محەممەد بە هاوسەرو پیاوی خەونەکانم بزانم و لە پێناو بەختەوەری ئەودا هەرچی لە دەستم بێت ولە تواناما بێت ئەنجامی دەم لە ژووری هاتمە دەرێ و چوومە لای محەممەد. محەممەد بەلای دایك و بابەوە دانیشتبوو و سەرگەرمی قسان بوو دەگەڵیاندا. بەلای باوکمەوە چووم و روومەتیم ماچ کرد و گوتم:

-دەربارەی ئەو قسەو بەڕوو داهاتنەوانەم داوای لێبووردن دەکەم.

بابەش بەمیهرەبانییەکەوە روومەتی ماچ کردمەوەو گوتی:

- قەیناکا کچەکەم، ئەو شتانە لەنێوان هەموو داك وباب و فرزەندێکان هەر دەبێ.

محەممەد لە جێوە هەستاو گوتی:

- ئیدی بە یارمەتی ئێوە من و ڕەها دەچینە سینەما، بۆ نیوەڕۆیەشمان چاوەڕێ مەبن نایەینەوە، بەنیازم دەزگیرانە جوانەکەم لەیەکێك لە جوانترین رێستۆرانەکان بۆ ناخواردنی نیوەڕۆیە داوەت کەم.

دایك و باب هەر دووك رازی و شادو شەنگوڵ دەهاتنە بەر چاوان و دوای چەندین مانگاز زەردەخەنەم بەسەرو رووی جوانیانەوە دیت و لە دڵیشەوە کە ببوومە مایەی غەم و خەفەت و کەسەرو ناخۆشیانیان تەریق دەبوومەوەو شەرم دەیگرتم و ئیدی بڕیارم دا بە هیچ شێوەیەك و لەپێناوی هیچ شتێکدا نەیان رەنجێنم و نارەحەتیان نەکەم. بەیارمەتی خواستنێ لە دایك و بابەی هاتینە حەسارێ تا لە ماڵ دەرچین محەممەد گوتی:

- ڕەها، ئەدی چارشێوەکەت کوا؟ ناکا بتەوێ هەروا بە تەنوورە وبلووزەوە بێیە دەرێ؟
سەیرێکی محەممەد و ئەوجا ئی دایك و بابیشمم کرد، ویستم بڵێم من حەز ناکەم چارشێو بگرمەوەو ئەگەر نارەحەتیشی بەتەنیا برۆ، بەڵام ئەو گفت و بەڵێنەم وەبیر هاتنەوە کە بەخۆم دابوون. دایکیشم بە چاو تروکانێکی تێی گەیاندم کە بەقسەی بکەم. بۆیە گەڕامەوە ژوورەکەم و چارشێوە ڕەشەکەم بەسەرم دادا و لەبەر ئاوێنەی ڕاوەستام تا چارشێوەکەم ڕاست کەم. سەیرێکی خۆمم کرد و گوتم:

- دەبێ لەمەو دوا ڕێز لە ویست و داوا و حەزەکانی محەممەدی بگرم تا ژیانێکی خۆش و سەرکەوتووانە پێکەوە نێم وببمەهاوسەرێکی نموونەیی.

چارشێوم کردە سەرو چوومەوە حەسارێ. محەممەد بە دیتنێ من گوتی:

- ئێستا دەڵێی مرواری ناو سەدەفێی.

ڕاستیەکەی شانازیم بەو قسەی محەممەدیەوە بەخۆم هاتێ و زەردەخەنەیەکی لە خۆرازییەم هاتە سەرلێوان دوای خودا حافیزیە لە دایك و بابان لە ماڵێ وەدەرکەوتین. محەممەد بەردەوام لێم وریا ەو چارشێوەکەم لەسەری دانە ماڵدرێ، و بەرنەبێتەوە و بە پشتدا نەخزێ. ڕاستیەکەشی سەرەتا لە شێوازی ڕەفتارەکەی نارەحەت بووم بەڵام دیسانەوە بەڵێنەکەمم وەبیرهاتەوە کەبۆ بەختەوەرییە وی ژیانی هاوبەشیمانم بەخۆم دابوو.

ئەو ڕۆژە دەگەڵ چاوەدێریە توندو تیژیەکانی محەممەدی لە پەچە و چارشێوو پەلێپ و بیانووەکانی تێپەڕی کە بەشێوەیەك بوون هەزار جارم بەخۆم گوتووە هەڵەیەکی گەورەم کرد کە دەگەڵەویدا هاتمە دەرێ. وردەوردە گۆڕەوی تەنکیشی لێ قەدەغەکردم، هەقی لەبەرکردنی جل و بەرگی قۆڵ کورتم نەما، نەدەبوو قژم بۆ سەرەوە دابێنم و قژم هەڵدەمەوە چونکە دەیگوت کاتێ کە قژت وا داهێنا و چارشێوت بەرسەر دادا ئەوە دەبیەجێی سەرنج و تەماشا کردنێ. مافی هیچ جۆرە ئارایشتێکی تەنانەت تەنکیشم نەك هەر لە دەرەوە لەناو ماڵێشدا نەما، دەگەڵ ئەوەشدا کە لەو توندو تیژیانەشی وە زاڵە هاتبووم و کلافەببووم هیچ بەرپەرچێك و نارەزایەتیەکم نەبوو. وردە وردە چوونە دەرەوەشی دەگەڵ ماڵوەماندا لێ قەدەغەکردم. مافی ئەوەم نەبوو بەبێ وی دەگەڵ ماڵەوەشدا بچمە هیچ داوەت و ئاهەنگێکی خێزانی و کەس و کارانیش.

لەیەکێك لە ڕۆژەکانی مانگی بەهمەنێ جەژنی لە دایکبوونی مەلیحەی ئامۆزام بوو، چەندین جاری بە تەلەفۆن داوا لێ کردبووم کە هەر دەبێ لە جەژنی لەدایکبوونیدا بچم و

لەوێ بم ومنیش چونکە بە تەواوەتیم خوو و ڕەوشت و ڕەفتاری محەممەدی دەزانی و شارەزای بووم هیچ بەڵێنێکی تەواوەتیم پێ نەدا و هەر جارەی بیانوویەکیشم دێنایەوە دوایە کە هەر وازی نەهێنا و دەستبەردار نەبوو گوتم:

- مەلیحە گیان تۆ بۆ خۆت دەزانی کە چەندم حەز لێیە لە جەژنی لە دایك بوونەکەتدا هاوبەشی بکەم و ئەو بەڵێنەشت دەدەمێ کە ئەگەر بوو و لە تواناداا بوو ئەوە هەر دێم.

قسەکانم هێندێکیان مەلیحە قایل کرد و ئیدی هیچی دیکەی پێ دانەگرت.

عەسری ئەو ڕۆژە محەممەد وەك هەموو ڕۆژەکانی دی هاتە ماڵێ مە تا سەعاتێکی لەوێ بێ منیش مەسەلەی چەند جارەی تەلەفۆنەکانی مەلیحەم پێ گوت، محەممەد گفتی دا کە ئەویش دەگەڵ ماڵێدا دێ بۆ ئەو جەژنەی.

ڕۆژی جەژنێ هات و هەموو لە هەموو ئامادە بووین تا بچینە جەژنەکە. چەند سەعاتێك بەسەر نێوەڕۆیەدا تێپەڕیبوو بەڵام محەممەد هەر دیار نەبوو، ئەو بەڵێنی دابوو کە بۆ ناخواردنی نیوەڕۆیە بێتەوە ماڵێ مە. هەموو ئامادە دانیشتبووین و چاوەڕێی هاتنەوەی محەممەد بووین تا پێکەوە بچینە ماڵێ مامم بەڵام محەممەد هەواڵێکی نەبوو تەنانەت تەلەفۆنێکیشی نەکرد بوو تا هۆی دوا کەوتنەکەی رابگەیەنێ. هەموومان نیگەران بووین، وردە وردە ڕاحیلە و ڕەیحانە دەنگیان لێ پەیدابوو و هاواریان لێ هەستاو بەردەوام بۆڵەیان دەهات کە درەنگ بووە و کەی بەتەماین بڕۆین.

بابم بە ناچاری داوای لێ کردم تا دەگەڵ ئەوانی دیدا بچمە ئاهەنگەکە با محەممەدیش بۆ خۆی بێت. بەنیگەرانیەوە گوتم:

- دەترسم لەوەی کەبزانێتەوە من دەگەڵ ئێوەدا چوومەتە ماڵێ مامم نارەحەت بێ و دووبارە بیانووان بگرێتەوە.

بابەش کە لە ڕەفتارەکانی محەممەد کلافە ببوو گوتی:

- مەترسە ئەگەر محەممەدیش کردیە ناخۆشی پێی دەڵێم کە من تۆم بە زۆری دەگەڵ خۆماندا بردووە.

بەناچاری و بەنابەدڵیەوە سواری ئوتومبێل بووم و هەموو پێکەوە ڕۆیشتین. کاتێ کە گەیشتینە ماڵێ مامم سەعاتێك بوو ئاهەنگەکە دەستی پێ کردبوو و گەیبووە نیوەی. مامۆژن و مەلیحە هەردووکیان بە پێرمانەوە هاتن و گلەییە درەنگ چوونێشیان لێ کردین. هەردووکیان هەوڵیان دەدا تا هۆی درەنگ چوونەکەمان و هۆی دواکەوتنەکەمان

ـ ـ ـهەر جۆرێك بوو بەبیانووی جۆراوجۆرەوە رازیمان کردن و چـووینە کۆڕەکـەوە. بـە ـ ی ئەو دانیشتنە تەواوی هەست و هۆشم هەر بـەلای حەسـارێوە بـوو تـا ئاگـاداری ـ ی محەممەدی بم بەلآم ئەو هەوالێکی هەرنەبوو. ئاهەنگەکـە تـەواو بـوو و هـەموو لـە ـ ـ هاتینەوە مالێ بەلآم دیسانەوەش محەممەد هەوالێکی هەر نەبوو. بۆ بەیانی ئەو رۆژە ـ ـ هاتە مالێ مە و بەدەنگێکی هەڕەشاوییەوە رووی دەمن کرد و لەبەردەمی دایك و ـ ـ گوتی:

- ـوینێ بە چ هەقێك بەبێ من چوویە ئەو جەژنە؟ ئەدی ئەمن بەتۆم نەگوتبوو هەقت ـ ـ من بچیە چ جێیان؟

ـ پاڕانەوە وەم سەیری باوکم کردو بە چاوانم داوای هاوکاری لێکـرد، بـابم بـەرەو لای ـ ـیەوە چوو و گوتی:

- بە هەلە مەچۆ محەممەد گیان، رەها بەتـەنێ نـەبوو بەلکـە دەگـەلّ مـن و دایکـی و ـ ـکەکانی هاتۆتە ئەو جەژن و ئاهەنگە.

محەممەد بەبێ ئەدەبیانەوە بەسەر بابەیدا گرماند:

- رەها بەرەللایی کردووە کەبەبێ رەزامەندی من دەگەلّ ئێـوەدا چـۆتە ئـەو جەژنـە، ـ ـکە من پێم باش نەبێ بچێتە ئەو جەژنە.

بابە بە دوو چاوی دەرپەڕیوەوە سەیرێکی محەممەدی کرد. دایکم خۆی رانەگرت و گوتی:

- ئەوە چ فەرمایشتێکە جەنابتان دەیفەرموون بۆ رەها چۆتە کـوێ و یـا لـە جـەژنی ـ ـزایەکەیدا چ بووە تا ئێوە بەباشی نەزانن؟

محەممەد چاوێکی لەمن سوورکردەوە و گوتی:

- هەر ئەوەیە کە گوتوومە، ئەم جارەیان لەو هەلەیەی دەبوورم بەلآم هیوادارم جارێکی ـ ـکە دووبارە نەبێتەوە.

لە دایك و بابەڕا دیاربوو کە هەردووکیان نارەحەت ببوون بەلآم هیچ کامێکیان هیچیان ـ ـگوت. محەممەد سەعاتێك لە مالێ مە دانیشت دوایەش بە خواحافیزیەکی ساردو سڕەوە ـ ـیدا رۆیی. دەمزانی تووڕە بووە و مەزەندەکەشم راست دەرچوو. محەممەدلەو بەروارەوە تـا ماوەی دوو هەفتان نەهاتەوە مالێ مە.

دەو ماوەیەیدا بابە چەند جارێکانی نا رەزایەتیە خۆی لـە رەفتـار وکـردارو هـەلّس و کەوتە نا ماقولّ و نا پەسندەکانی محەممەدی دەربڕی و دایکم هەموو جـارێ بەسـەر قالّیـە

محەممەدیەوە بۆی پینە دەکرد. دوابە دوای ئەمەش گلەیی و گازاندەی محەممەدی هەر بەردەوام بوو و تا دەشهات زیاتر دەبوو. هەر جارێکی کە لای دایك و بابم گلەییم لە رەفتارو بیرو بڕواو بۆ چوونەکانی محەممەدی دەکرد دایك و بابم قسەیان دەکردنە یەك و منیان بە کەمتەرخەم و بە گوناهبار دەزانی. دایکم بە دزیەوە پێی دەگوتم:

- ئەوە تۆی کە دەگەڵ محەممەدی هەڵناکەی، چونکە لەسەرەتاوە چاوت لە دووی کەسێکی دیکەوە بووە بۆیە ناتەوێ دەگەڵیدا بگونجێی و من دەزانم کە گوناهباری راستی تۆی.

دەگریام وپێم دەگوت:

- ئیدی دەبێ چبکەم کە تا ئێستا نەمکردووە، هەرچی محەممەد دەیڵێ من بەبێ چەندو چوون قبوڵمەو بەبێ هیچ نارەزایەتیەکیش ئەنجامی دەدەم ئیدی چبکەم تا ئێوە باوەڕکەن کەمن نومێدم لە بیر بردۆتەوە؟

دایکم بەراشکاوییەوە رووی تێکردمەوە و ڕاستەوخۆ دەچاومەوە راماو گوتی:

- ژن دەبێ بە گوێرەی ویست و بیروبۆچوونەکانی مێردەکەی هەستێ و دانیشێ و رەفتار بکا، دەبێ بزانێ مێردەکەی چی پێ خۆشە ئەوەی بکات و چی پێ ناخۆشە لێی دوورکەوێتەوە و نەیکا.

وەك کابرای زێڕکرم لێ قەومابوو، بە هەر حاڵ بە پێچەوانەی ئەو بەڵێنەی کە محەممەد پێش دەزگیرانەتیە بەمنی دابوو وردە وردە پێشی چوونە قوتابخانەشی لێ گرتم و کە نارەزایەتیە منیشی دیت بەبێ شەرمییەکەوە گوتی:

- خاتوون، من حەزناکەم بەناوی چوونە قوتابخانەوە سەر دە زۆرجێی دی هەڵکا.

بە تووڕەییەوە گوتم:

- یانی چی؟ ئەو قسانە مانای چی؟ مەبەستەکەت روون و ئاشکراتر بڵێ!

محەممەد هەر بەهەمان توندو تیژیەوە لە وەڵامێمدا گوتی:

- هەر ئەوەی کەپێم گوتی، وانەی نا وانە! نابێ بخوێنی، من رێت نادەم تۆ بێ کارەبی چاکترە لەوەی بچیتە قوتابخانە و بخوێنی، فێری رێ و رەسمی ژیان و ماڵ و ماڵداری بی چاکترە.

ئەمجارەش بەقسەی دایك و بابم و جەختی ئەوان کە بابەگەورە بەو کارەی هەستاوە ناچار ملکەچی ویست و حەز و ئارەزووەکانی محەممەدی بوومەوە. بە هەرحاڵ بە پێچەوانەی ئەو

، دابووی لە پشووی نیوەی ساڵ (جەژنــەکانی نــەورۆز) تێدا گوازرامــەوە یــان بڵـێم
ـ ـمیەوە. تەواوی پارەی بــووك گواســتنەوەو ئــەوەی کــە تێــی چــوو هــەمووی بــەمل
ـ بداهات چونکە محەممەد گوتی:
- من پارەم نیە تا ژنی پێ بگوازمەوە و ئاهەنگێ بگێڕم خۆ ئەگەر هەشـم بــێ هــیچ پێویـست ناکات دەگەدە و گیپاڵی پڕفێس و ئیفادەی ماڵێ وەی کەم.
قسەکانی محەممەدیم هەموو بە بابم گوتن بابم لە وەڵامدا گوتی:
- قەیناکا کچەکەم، کە محەممەد دەڵێ پارەی نیە ئەوە هەموو بیانوون، راستیەکەی ئەو پیاوێك نیە هەروا بە ئاسانی وازبێنێ من بۆ خۆم پارە و خەرجیە بووکێنیەکەی دەدەم و بۆ خۆشم دەگەڵ محەممەدیدا دەدوێم بزانم دەڵێ چی.
محەممەدکاتێ کەلەبڕیارەکەی بابەی ئاگادار بوو گوتی:
- راستیەکەی هەر تەنیا پارەی گواستنەوەکە نیە تەنانەت مــن پــارەی کڕینــی بــەرو جیازی بووکێشم هەر نیە، نە پارەی جل و بەرگ و نەپارەی زێڕو ئارایشت و نەهیچ شتێکی دیکە. بۆیە ئەگەر رێ بدەن هەروا سادەو ســاکارانە و بــێ هــات و بــات و بــەبێ دەنگــی دەچینە مەشهەد و ژیانی هاوبەشی هاوسەریەمان دەست پێ دەکەین.
بابە بە دڵسۆزیەکەوە دەستێکی لەشانی محەممەدی دا و گوتی:
- محەممەدئاغا تۆ خۆت دەزانی کە هەموو دایك و بابێك هەزاران حەزو ئارەزوویان بــۆ جگەر گۆشەکانیان هەیــە، قــەیناکا ئاهــەنگی گواســتنەوە و بووکێنیەکــە هەرچــەندێکی تێدەچێ هەمووی بۆ خۆم دەیدەم و قبوڵمەو وای دادەنێم ژنم بــۆ کوڕەکــەم هێنــاوە ئــەدی زاواش هەر کوڕی خودی ئەو خەڵکەی نیە؟
محەممەد سوپاسی بابەی کرد و گوتی:
- ئەگەر راستیت دەوێ لەو رۆژەوەی دەگــەڵ رەهــای بووینــە دەزگــیران ئێــوە شــوێنە چۆڵەکەی بابتان بۆ پڕ کردوومەوە، هەروەك دەزانن دایکم مووچە خۆرە و براگەورەکەشـم کە خێزانەکەی مامۆستایە زۆر بە زەحمەت ماڵێ بەڕێوەدەبات و خــۆمنیش نــاتوانم هــیچ چاوەروانییەکیان لێ بکەم، چونکە برایەکەم مەنیژەش بەخێودەکات.
بابە بە میهرەبانیەکەوە دەستێکی لەپشتێ محەممەدی دا و گوتی:

- پێم خۆش نیە بیرو خەیاڵی خۆت بەو ئاریشانەوە ماندووکەی دڵنیابە لای من و خاو خێزانم و هەروەها رەهاش پارە و پوول و بوونی ماڵی دنیا هەرگیز ئەو نرخەی نیـە بـەلای ئێمەوە. ئەدی ئەوەنیە پێشینان گوتوویانە ماڵی دنیا چڵکی دەستە.

بەجۆرە بابە هەرچی خەرجیە بووکێنییەکەی بوو هەمووی دا. جوانترین جـل و بـەرگی بووکێنییەی بۆ کڕیم و ناردمیە چاکترین ئارایشگا و جوانترین زێڕو زەبەری بۆ کـریم. لـە رازاوەترین تەلاردا ئاهەنگ و رێ ورەسمی مـارەبڕین و گواسـتنەوە بـەڕێوە چـوو. مـن و محەمەدیش دەست لەناو دەست بەرەو هێلانەی بەختەوەریمانەوە هەنگاو هەڵێنانەوە.

## (٦)

ئیمی من وحەممەد بووینە ژن و مێرد، ئیدی تازە هەموو شتێك تەواو ببوو و مـن ژنـیّ وی بووم. هەوڵ و کۆشش و تەقەللایەکم ئەوەبوو تا ژیانێکی گەرموگوڕ و پڕ لە سۆز و میهرەبانی بڕەخسێنم. ئەو چەند مانگانەی هەوەڵیّ زۆر بە چاکی و بەخۆشیەوە تێپەڕی. هەر شەوەی لە مـاڵیّ خزم و کەسێك و دۆست و ناسیاوێکی بووین و ئەو شەوانەی کەلەماڵێش بووین ئەوە هەر دەربارەی ئایندە دەدواین و نەخشەمان بۆ ژیانێکی چاکتر و خۆش و لەبارتر دەکێشا.

شەوێکیان محەممەد زۆر بەکەیفەوە هاتەوە ماڵیّ چا تازە دەمی کێشابوو و قاپ و کەوچـکی خواردنـیّ هـەموو ریزکرابـوون و دانرابـوون هـەر بەگەیشتنەوەو هاتنـە ژووریّ محەممـەدی بەگەرمیەوە بەرەو پیریەوە چووم و کۆمەکی جل گۆڕینێیم کرد. دەستیم گرت و دەگەڵە خۆمـدا هێنایە مەتبەخیّ و کورسییەکم بۆ دانا و گوتم:

- دانیشە با پیاڵە چایەکت بۆ بێنم.

محەممەد دانیشت و منیش پیاڵەکەم هەلگرت تا چایەکی بۆ تێکەم بەڵام لە پڕ پیاڵەکـەم لـە دەستی ترازا و بەربۆوە سەر عەردی. پیاڵەکە شکا و پارچە شکاوەکانیم یەك دەپێـی ڕاچـوو و پێی بڕیم. محەممەد هەر لە جێوە هەستاو گوتی:

- ئەوە هۆشت لە کوێیە؟ چەند جارم پێ گوتووی هێنـدە دەسـتوپێ سـپی مەبـە، یـەکێك پیاڵەیەکی پێ هەڵنەگیرێ دەبێ بە کەلکی چی بێ. ئەوە تۆ چـۆن دەتـوانی ئـاوا ژیـان بەریـە سەریّ؟ بۆتۆ پێتوایە من لەسەر خەزنـەی دانیـشتووم هـەر ئـەتۆ پیاڵـە و قـاپ و کەوچـکان بشکێنی و ئەمنیش بیانکڕمەوە.

بێ باوەڕانە سەیرێکی محەممەدیم کرد و گوتم:

- ئەوە تۆ لەبەر شکانیّ پیاڵەکەی وا ناڕەحەتی یان لەبەر برینداریە پێیەکەی من؟

محەممەد بەددەم پاڵ پێوەنانی منەوە بۆ لایەکی گوتی:

- لاچۆ بڕۆ بەو لاوە تا کەتنێکی دیشت نەکردووە!

بەراستی بەو رووبەڕوو نەوەی وی زۆر تێکچووم چۆن یەکێك بۆ شـكانی پیـاڵێکی ئـاوا بـە پەرۆش و برینی پێی براوی من ئاوا کەمتەرخەم بێ؟

هەروا کە بەشە لەشەلەوە بەرەو لای دەستشۆرەکەوە دەچووم تا خوێنی پێیەکـەم بـشۆمەوە سەیرێکیم کرد هەر سەریشی بڵند نەکردەوە تەماشایەکی پێیە برینداره‌کەم بکات. بۆ خۆم دڵی خۆم دایەوە و دەخۆمەوە خوری:

- بۆ خەریکە هەروا لە خۆوە ناخۆشی کەی؟ ئەوە چیە بەمێشکتدا دێت و دەچێ خـۆ ئـەو نەیگوتووە لەبەر پیاڵەکە وا نارەحەتە، رەنگە هـەر لەبـەر برینـی پێیەکـەت وا دەستەوەسـتان بووبێ و نەیزانیبێ چ دەڵێ.

هەر بەو هیوایەوە خوێنی پێیەکەم شووشتەوە و هاتمەوە مەتبەخێ. محەممەد پارچەیەکی لـە پیاڵە شکاوەکە بە دەستەوە بوو. کە چوومەوە مەتبـەخێ بـەرەو لامـەوە هـات و پارچـەکەی پێشاندام و گوتی:

- ئەوە ئەو پیاڵانە نیە کە برایەکەم بە دیاریی ژن هێنانێوەی بۆ هێنا بووین؟

منیش بێ ئاگا لە هەموو شتێکی گوتم:

- بەڵێ، یەکێکە لەو پیاڵانە کە جەمیلەی براژنت بۆی هێنابووین.

لە پڕ محەممەد هاواری کرد:

- دیارە کە بە ئەنقەست شکاندووتە! دەی بڵێ کە بە ئەنقەست شکاندووتە، چـونکە ئـەوە دیاری کەسوکارەکانی منە بۆیە شکاندووتە تـاتێم بگەیـەنی کـە نـەخۆم و نەکەسوکارەکەشـم هیچمان بەلای تۆوە هیچ نین و بێ نرخ و بەهاین.

بەسەر سامیەکەوە تەماشام کردنێ، هیچ جۆرە پەیوەندییەکم لە نێـوان شـکانی پیاڵەکـەو قسەکانی ویدا نەدەدیت بە ناچاری لەسەرخۆ لە وەڵامی ویدا گوتم:

- کەمێك هێواشتر، ئەوە چیە بۆ وا هاوار دەکەی، خەلکی دەڵێن داخوا چبووە، بەسـیەتی بیبڕەوە ئیدی.

بەڵام محەممەد هەروا لەسـەر هات و هاوارەکەی خۆی هەر بـەردەوام بـوو و تـا مـن داوام لێ دەکرد بێدەنگ بێ ئەو زیاتری پێ لێ هەڵـدەبڕی و تونـدتری دەشـیڕاند. هـەر بـۆ ئـەوەی بـێ دەنگیشی کەم گوتم:

- سوێندت بۆ دەخۆم کە کەوتنی پیاڵەکە هەروا بە ڕێکەوت و لـە خـۆوە بـوو و هـیچ بـە ئەنقەست و بە مەستێکەوە نەبووە، باشە بۆ پێتوایە من بەئەنقەست شکاندبێتم، بۆ ئەوەی تـۆ

...کەم، تکات لێدەکەم بەسە بیبڕەوە هەر نابرووشمان دەنێو گەڕەك و هاوسێیاندا چوو، ئەگەر ... ئەو هەمووو هات و هاوارو دادو بڕۆیەت تەنیا لەبەر شکانی پیالێکیە چمان پێدەڵێن؟

...ك بڵێی قسەکانم خوێی سەر برینانی بێ، هات لەجارانی زیاتر تین تێکرد تا دەنگی ...گی دەرکەی بڵند بوو و پیاوێك لە پشت دەرکەیەوە هاواری کرد:

- ئەوە چیە ئاغا، ئەوە دەڵێی هەر لە کێوی گەورە بوو وی و لە دەشتێ ژیاوی؟ خەڵکی حە...یکی حەسانەوێن و ئەتۆش ئەوا دەنگت لێ بڵند کردووە و هاوار دەکەی. هاوارو بانگی ئەو ...ەی وای کرد محەمەد هێور بێتەوە و ئیدی هاوار نەکات. هەر چەندە من پێموابوو هەر ...ت نا ئێستا محەمەد دەگەڵ پیاوەی تێکەوە دەگلێ بەلام بە پێچەوانەی بۆ چوونەکەی من ...ەت نەچووە بەر دەرکێش بەلکە چۆوە ژووری نووستنێ و بەبێ شێو وبێ چا خواردنەوە لێی ...ست.

بە هەوتیە رەفتارە ناما قوڵانەکانی وییەوە پارچە شکاوەکانی پیالەکەم خڕ کردنەوە و ئەو ...ەم بە تەنێ شێوکرد.

بەیانی ئەو رۆژە هەرکە لە خەوێ ڕابوو بێ سێ و دوو گوتی:

- چەند جارێکە دەمەوێ شتێکت پێ بڵێم بەلام وارێك نەکەوتووە بەلام وا ئێستا دەمەوێ ...ێنم، لێرە بە دواوە هەر ئیشێکی ویستت بیکەی دەبێ بە پرس و ڕای براژنم بێ.

بەسەر سامیەوەم محەمەد تەماشاکردو گوتم:

- یانی چی؟ لە مەبەستی ئەو قسانەت ناگەم؟

محەمەد بەبێ حەوسەڵەییەوە گوتی:

- لەوەی روونتر کە براژنم مامۆستایە و لەمن و تۆ زۆر زیاتر تێدەگا و دەزانێ، ئیدی وا باشترە هەرکە کارێکی دەیکەی بە پرس و ڕای ئەو بێ.

مەیلەو بە هاوارەوە گوتم:

- با براژنت دیدو بۆ چوونەکانی لە چوار چێوەی ماڵ و ژیانی خۆیدا بەکار بەرێ من رێ بەهیچ کەسێك نا دەم بێتە ناو ژیانی ماڵی منەوە، ئەم ژیانە پەیوەندی بەمنەوەیە و هەر بۆ خۆشم بڕیاری هەڵسووڕانی کار و بارەکانی دەدەم و پێویستیم بە رێنمایی هیچ کەسێك نیە.

محەمەد لە جێوە دەرپەڕی و گوتی:

- هەر ئەوەیە کە گوتم، بۆت نیە بەبێ پرسی براژنم هیچ کارێکی بکەی.

لەسەر ئەو باسەی چەند مانگێکان جیاوازیان کەوتە نێوانێ. من کە تەواوی داواکارییەکانی ویم قبوڵ کردبوو نەمدەتوانی بەهیچ شێوەیەك ئەو داوایە ناما قوولێەی لێ قبوڵ کەم و بە گوێی بکەم.

محەممەد هەر ئیشێکی ویستبایە بیکا لە پێشدا لای براو براژنێی باس دەکردو تەنانەت بۆ جارێکیش چیە پرسێکی بەمن نەکرد و نەدەکرد ولێی نەپرسیم. هەر بۆ بەردەوامیە ژیانیشم وردە وردە هاتمەوە سەر گوێ رایەڵیە ویستەکانی محەممەدی. هەموو هەوڵ و تەقەللای خۆمم بۆ پێکەوەنان و بنیاتنانی ژیانی خۆم تەرخان کرد. دەترسام هەواڵی تێکچوونێمان بە گوێی دایك و بابم بگاتەوە و هەمدیس ئەمجارەش هەر من بە کەمتەرخەم و گوناهبار لە قەڵەم دەنەوە. بۆ ئەوەی دڵێ محەممەدیش بەلای خۆمدا راکێشمەوە تا دەمتوانی بەلایدا دەچووم و دڵیم رادەگرت بەڵام ئەو وەك ئەمانە هەمووی بە ئەرك و پێویستیەکانی سەر شانی من بزانێ، بچووکترین ئاورێکی لێ نەدەدامەوە و هەر گوێشی نەدەدامێ و خواستەکانی هەموو بەلاوە هەر هیچ بوون.

وردەوردە براو براژنەکەی لەبن گوێیان خوێند کە خانووەکەمان بگۆڕین، جەمیلە پێی گوتبوو:

- تا رەها ئاوا لە ماڵێ بابیەوە نزیك بێ هەرگیز گوێ بەتۆ و بەقسەکانی تۆ نادا.

- محەممەد گلەیی و گازاندە و عەیب و عارێکی زۆری لەو خانووەی دەگرت کە تێیدا بووین تا لە دوایەش چووینە ئەو خانووەی بۆ خۆی دۆزیبوویەوە و بەکرێی گرتبوو. ئەو خانووەی محەممەدیش بەکرێی گرتبوو ئی پیرێژنێکی بوو کە منداڵەکانی هەموو چووبوونە ماڵێ خۆیان و ئەو ژنە بێدەرەتانە بە تەنێ مابۆوە. سەرەتای مانگی ئابانێ بوو و حەوت مانگ بەسەر ژن و مێردایەتیەماندا تێدەپەڕی. نزیکەی مانگێك بوو محەممەد دەستی لە بیانووان هەلگرتبوو و ژیانێکی ئاسوودەمان هەبوو، بەڵام دووبارە دەستی بە ئازارو ئەشکەنجەی من کردەوە.

چەند رۆژێك بوو میزاجی تێك چوو بۆوە و بەردەوام لەسەر بچووکترین مەسەلەیەك دنیایەکی بگرەو بەردە و دەمەقاڵێ دێنایە گۆرێ و منیش لە ترسێ خاوەن خانووەکەی کە نەك دەنگمان بدا هەرچی دەیگوت بەبێ چەند و چوون قبوڵم دەکرد تا نەیکاتە هات و هاوار وداد و برۆ.

لەبێ ئیشیان هەرچی ناو ماڵەکەبوو هەموویم تێك هەڵ شێلاو هاتم دیکوری ماڵەکەم گۆڕی.

بڕیارم دابوو کە شەوێ محەممەد هاتەوە ماڵێ هێندێکی قسان دەگەڵ بکەم و هۆی ئەو حەزو بیانووانەی بپرسم. دوای گۆڕینی دیکۆری ماڵەکە هەموو شتەکانم خڕکردنەوە و ئەو چێشتەی حەزی لێبوو لێم نا و دەستێکیشم بە دەموچاوی خۆمدا هێنا و بێ ئارامانە لە چاوەڕێی محەممەدیدا دانیشتم. دڵنیابووم هەرکە هاتەوە ژووری ماڵێ لەو گۆڕانکاری دیکۆرە و ئەو چێشتە ئامادەو دیتنی من بەو خۆ تیف تیفە دانەوە زۆر دڵخۆش دەبێ.

سەعات نزیکەی یازدەی شەو بوو کە هاتەوە ماڵێ. بە خۆشحاڵیەکەوە بەرەولایەوە چووم و بەگەرمی بەخێرم هێنایەوە. محەممەد بە ساردو سڕیەکەوە وەڵامی دامەوە.

لێم پرسی:

- لە پێشدا نانی دەخۆی یا چا؟

محەممەد بە لالووتێکەوە وەڵامی دایەوە:

- هەر کامێکیان ئامادەبێت.

بەمیهرەبانیەوە گوتم:

- هەردووکیان ئامادەن حەزت لە کامیانە تا بۆت بێنم.

بەدەنگێکی بەرزەوە گوتی

- وای چەند دەڵێی، گوتم هەر کامێکیان بێ.

لە رەفتارە دزێوەکەی محەممەد زۆر دڵگیر بووم بەڵام بەسەر خۆشم نەهێنا، ساردو سڕیەکەیم بۆ ماندوو بوون و شەکەتیەی گێڕایەوە و چوومەوە متبەخێ و چێشت و پیاڵەیەك چاشم لەسەر سینییە دانان وهێنامە ژوورێ.محەممەد لە ژوورێ نەمابوو پێموابوو چووە ئاوێکی بەدەست و دەموچاویداکا. سفرەکەم راخست و چەند دەقیقێکان دانیشتم تا پێکەوە نانێکی بخۆین. بەڵام محەممەد هەر نەهاتەوە سەر سفرەی نانخواردنێ لەجێی خۆم هەستام چوومە دەستشۆرێ لەوێ نەبوو بەسەرسامیەکەوە بەرەولای ژووری نووستنێوە چووم سەیرم کرد ئەو لەسەر جێی لێی نووستووە.بە دەم زەردەخەنەیەکەوە لەتەکیەوە لەسەر لێوی چارپایەکە دانیشتم و کەوتمە دەست بەسەر داهێنانێ قژەکانی و بە ئارامیەکەوە پرسیم:

- دەزانم زۆر ماندووی ئازیزەکەم، تەواوم ئاگا لێتە بەڵام خۆ نابێ کە ماندووشی هیچ نەخۆی، بەو جۆرەی لە پەل و پۆ دەبی.

محەممەد لەپڕ لە جێ راپەڕی و هاواری کرد:

- زۆرت پێ خۆشە زوو لە پەل و پۆ بکەوم؟ وەنا نەڵێی نا، دەزانم کە یەکجار زۆر حەز دەکەیت تا زووە لەپەل و پۆ بکەوم و تۆش بچی میردێکی دەوڵەمەند بکەیتەوە.

بەزاری بەشەوە سەیرێکی محەممەدم کرد کە هەروا بەچاوی دەرپەڕیوەوە سەیری دەکردم و بەدەنگێکی لەرزۆکەوە گوتم:

- ئەرێ بەڕاست تۆ دەزانی چ دەڵێی؟ کێ دەڵێ من حەز دەکەم لە دەست تۆم رزگار ببێ، ئەوە کەی قسەیە دەیکەی؟ راستیەکەی رەنگە ئەوە تۆبی کەمنت خۆش ناوێ و حەز بە چارەم نەکەی ئەی ئەگەر وانیە بۆ لەسەر قسەیەك و یا هەر باس و خواس و مەسەلەیەکی چووکەڵە دەیکەیە هات و هاوار وداد وبڕۆ؟ من ئیدی لە توانامدا نەماوە و هیچی دیم خۆ پێ ڕاناگیرێ و تا کەنگێ دەتوانم هەروا بێدەنگ بم، چاك دەڵێم هەر وەی خراپ دەڵێم هەروەتر دەیکەیە هەراو زەنایەك مەپرسە، وەك بڵێی من دەگەڵ شێتێکیدا بژیم و نازانم؟راستیەکەی چ پەیوەندییەکی بەمنەوەیە نانی دەخۆی بخۆ ناخۆی مەخۆ، بەجەهەننەم، ئیدی من چبکەم؟

لەسەر لێوی چارپایەکە هەستام تا بچمەوە دەرێ کە محەممەد یەکسەر لەجێی خۆیەوە بڵند بوو و هێرشی بۆ هێنام و وەبەر مست و شەق و پێلەقانی دام، دەوساتەوەختەشدا نەمدەزانی گوناهم چیە؟ باشە چم کردووە شایانی ئەو هەموو لێدان و کوتانەی بم و دەنگیش نەکەم، دەمزانی هەر دەمم لێك کەمەوەو قسێکی بکەم محەممەد بەرزتر هاوار دەکا. دوای ئەوەی محەممەد لە لێدان و کوتانی من ماندوو بوو بە لەشی کوتراو و دڵی شکاوەوە پەنام بردەوە بەر گۆشەیەکی ژووری میوانان و تالای بەیانی هەر گریام تالێکیشم دەدایەوە کەمتر بەسەرەنجام دەگەیشتم، نەمدەزانی محەممەد بۆ وام دەگەڵ دەکا خۆمن هەڵە و گوناهێکم نەکردبوو دەو چەند مانگەی دوای هاوسەریەتەمان تەنانەت پەرداغە ئاوێکم بەبێ پرس وئاگاداریەوی نەخواردبۆوە.

بەیانی رۆژی دوایی محەممەد بەبێ ئەوەی هەر ئاوڕێکیشم لێ بداتەوە لە ماڵێ چووە دەرێ. بەلەشی تێك شکاوەوە لەجێ هەستام وبەرەو لای ئاوێنەکەوە چووم، دوای دیتنی دەموچاوم دەئاوێنەکەدا لە ترسان هاوارم لێ بڵندبوو. دەوروبەری هەردوو چاوم شین هەڵگەڕابوو ولێوی خوارێشم ئاوسابوو.ناوچاوی راستەشم وەك گۆمی خوێنێ داوەستابوو، بەکورتیەکەی دەموچاوم وای لێ هاتبوو کە نەمدەتوانی بەخەونیش ببیبنم. هەروا بەو حاڵەوە و لەبەر ناڕەحەتیان هەردوو دەستم بەڕووی ئاسمانێدا هەڵبڕین و سکاڵام بردەوە لای خوا.

- خودایە ئەوە چ نەگبەتیەکە بەسەر من دێت؟ ئەوە چ چارەنووسێکە قەڵەمت بۆ لێداوم؟ خودایە خۆ بۆ خۆت ئاگاداری و دەزانی کەهۆی ئەو ژیانە ناهەموارە هەمووی بابە گەورەمە،

ـ هەرگیز لێی خۆش نابم و نەفرەتیشی لیٚ دەکەم و هەرگیز لە گوناهەکانیشی نابوورم کەمنی
ـ بەو رۆژە ڕەشە گەیاندو ئاوای بەدبەخت کردم، تۆش خوایەگیان هـەرگیز لـە گوناهـەکانی
حووزی، بابەگەورە نەفرەتت لیٚ بیٚ کە بەو رۆژە ڕەشەت گەیاندم، هەزاران نەفرەتت لیٚ...

بەدەنگێکی بەرزەوە نەفرەتم لە بابە گەورەی دەکـرد و دەشـگریام. دوای سـەعاتێك گریـان
جـووەمە حـەمامیٚ و دوای حـەمامێش دەموچـاوم بـۆدرە کـرد بـە هیـوای ئـەوەی کـەمێك
شینییەدەموچاوم وتێکچوونیٚ بەر چـاوەکانم وەشـێرم تـا کـەمتر یـان پێـوە دیاربـیٚ. بـەڵام
دەموچاوم واشین ببوونەوە کە بە بۆدرە لێدانێش هەر نەمتوانی شین بوونەوەکەیان وەشێرم.

بەرە بەری نیوەڕۆیە بوو و تازە لە ئیشان ببوومەوە کە محەممەد هاتەوە ماڵیٚ. بـەدیتنیٚ وی
دەو دەمەوەختەی رۆژێدا زۆر سەرسام بووم وپـێم سـەیربوو.ئـەو بـەبیانووی بردنـی شـتێکەوە
هاتبۆوە ماڵـیٚ، دوای هاتنەوێـشی دەگـەڵ ئـەو رقـەی لێـشیم بـوو بـەرەو پیریـەوە چـووم و
بەخێرهاتنەوەم کرد.

محەممەد وەڵامی نەدامـەوە و سـەیرێکی تووڕاویانـەی کردمـیٚ. بـە دیتنـیٚ دەموچـاوە بـو
دراوییەکەمەوە کتوپڕ هێرشی کردمیٚ و پەلاماری دام و سەرو پرچمی دە هەردوو دەستەکانیەوە
ئاڵاند و بەدەنگێکی بەرزەوە شیڕاندی:

- بابزانم داخوا خانم لە کویٚ و لـەکام ئاهـەنگێکی داوەتـن وا ئـەو ئارایـشتە خەسـتەتان کردووە؟

بەر لەوەی دەرفەتی وەڵامدانەوە بدۆزمـەوە دووبـارە کەوتـەوە گیـانم بەلێـدانیٚ و هـاواری کردەوە:

- کاتیٚ کەمن لە دەرەوە بەهەر کولە مەرگییەك خەریکی پەیدا کردنیٚ پارووە نانێکیم کیٚ دەزانیٚ لەو کاول بووەیدا چ باسە؟ نەدی من نابـیٚ بـزانم بـۆ چـیت وا خـۆ تیـف تیفـە داوە و لەبەرکیٚ؟

دەبن مست و پێلەقە و کوتانێکی کە بەسەر و چاوم دەکەوتن بـەدەم هەنیـسکی گریـانێوە گوتم:

- بە خودای بە مەرگی بابم بەتەمای هیچ جێیەك نەبوو وم، تەنیا لەبـەر شـاردنەوەی شـین بوونەوەکانی دەموچاومم بۆدرە لێداوە.

محەممەد بەبیستنیٚ قسەکانم وازی لە لێدانێم هێناو دەستی کێشایەوەو بەتووڕەییەوە هەردوو لا دەرکەکەی بەدوا خۆیدا پێك دادانەوەو لە ماڵیٚ چووە دەریٚ.

دووباره بەلەشی برینداره‌وه چوومەوه سەر چارپایەکەو تا شەوێ هەر گریام.

محەممەد لەشەوانی دی زووتر هاتەوه ماڵێ و کە نان و چای حازریشی نەدیت هاتە ژووری نووستنێ. چاوەڕێ بووم دووباره دامگرێتەوه بە لێدانێ بەڵام بە پێچەوانەی بۆ چوونەکانی منەوه بە دەنگێکی ئارام و لەسەرەخۆوه بانگی کردم و لەسەر لێوی چارپایەکەوه لە تەنیشتمەوه دانیشت و کەوتە دەست بەسەر داهێنانی سەرو پرچم و بەدەنگێکی لەرزۆکەوه گوتی:

- رەها دەزانم لێم بێزاری، هەڤیشتە داوای لێبووردنت لێ دەکەم، دوێنێ شەوێم ئاگا لە خۆ نەبوو، ماندوو بووم، تکات لێ دەکەم بمبوورە.

- دەگەڵ بیستنێ ئەو قسانەیدا هەرچی رق و کینە و نەفرەتێکی کە بەرامبەرویم دەدڵیدا بوو هەمووم بەخشی، لە جێوه هەستام و گوتم:

- نا، من لە تۆ بێزارنیم، تاکو کەمێك دەحەسێیەوه منیش دەچم نان و چایەکی ئامادە دەکەم.

محەممەد دەستی گرتم و بەرەو لای خۆیەوه راکێشام و لەتەنیشت خۆیەوه دانام. بەهێواشی لە تەنیشت محەممەد دەستێکی وەبەر چەناگەی هەڵێنام و رووی بەلای خۆیدا سووڕاندم. لە دیتنێ شین هەڵگەڕانێ دەموچاو و هەڵاوسانێیان تێکڕا بوو، لەسەرخۆ جێیە شین هەڵگەڕاوەکانی دەموچاوی ماچ کردم و زۆر بە سۆزەوه گوتی:

- خوا بمکوژێ کە ئەو دەموچاوه جوانەتم ئاوا لێ کردووه. بەڵام رەها بەڵێن دەدەم کە ئەمە دوایین جاربێت دەستت لێ هەڵێنمەوه. ئێستاش تۆ پێویستیت بە پشوودان و حەسانەوەیە دەچم لە دەرێ خواردن دێنمەوه و پێکەوه دەیخۆین.

بەپەلە لە جێی خۆیەوه ڤیت بۆوه و بۆ خواردن هێنانەوێ وەدەرکەوت. منیش هەستام و چوومە حەمامێ و دووباره لەشەکوتراو و ورد و خاشەکەم تاوێك وەبەر ئاوی گەرم دایەوه تا بەو هۆیەوه هێندێك لەو ئازارە گیان پڕووکێنە کە گیان و دڵ و ناخ و دەروونی داگرتبووم دامرکێنمەوه

ئەو شەوه و چەند رۆژێکی دواتری گفت و بەڵێنەکەی خۆی بردە سەر. دوو هەفتە بەسەر ئەم رووداوەدا دەچوو و محەممەد هەموو رۆژێ بۆ نیوەرۆژەی دەهاتەوه ماڵێ و شەوانەش هەر زوو دەهاتەوه ومنی دەبردە سینەما و بۆ ماڵێ بابی دەبردمەوه. زستان داهاتبوو و سەرما و سۆڵەی توند و تیژی زستانێ وای کرد بوو زۆربەی کاتەکان هەر لە ماڵێ بم و نەچمە دەرێ.

... ئامادەبوو و بەچاوەڕێییە محەممەدیەوە دانیشتبووم و کتێبێکم دەخوێندەوە نزیکی ...ییە محەممەد بە دوو هەنگلی پڕ لەمیوە و قوتوێک شیرینیەوە هاتەوە ماڵێ و میوەو ...ییەکانی دایە دەستم و گوتی:

- ...ڕەها ئەوانە سەرویەرکە وخێراکە و زووتر نانەکە بێنە بیخۆین ئەوشۆ دایکم و برا و ...ـنکەکانم بانگ کردوون و دێنە ئێرە، بە یارمەتیت چی دەکرێ ئامادەی کە.

منیش شادو خەندان بەوەی کە ژیانەکەم ئاهەنگێکی بەبەردا هاتەوەو ئارام و ئاسوودەیە ...عەر دوای نیوەرۆژە ورۆیشتنەوەی محەممەدی بۆ سەر ئیشێ، سەرقاڵی ماڵ خڕکردنەوەو ...دەکردنێ بەرو ماڵێ بووم.

شەوێ میوانەکان گەیشتن و بەدەنگە دەنگ و هات و باتەوە هاتنە ژوورێ.

بەدەنگێکی بەرزەوە هەمووم بەخێرهێنان و فەرمووی ژووری میوانانم لێ کردن.

جەمیلەی براژنێ محەممەدی بەنابەدڵیەکەوە چاوێکی بە ماڵێدا خشاند و کاتی تێپەڕ بوونێی ...بەردەم ئاوێنە باڵانمایەکەی ژوورێ میواناندا پەنجەیەکی بەسەر ئاوێنەکەدا هێنا و بەنازو ...زێکەوە گوتی:

- ڕەها گیان هەرکە دەرفەتت بوو دەستێکی بە ئاوێنەکەیدا بێنە باهێندە تۆز نەگرێ، خۆ مندالت نیە لەبەروان پێت نەکرێ و بلێی کاتم نیە.

لە شەرمان سوور هەلگەڕام و بە دەنگێکی لەرزۆکەوە گوتم:

- بەڵام من ئەمرۆ هەمموو جێیەکم کۆ کردۆتەوەو سڕیومنەوە و پەڕۆم پێداهێناونەوە.

جەمیلە هەروا کە بەرەو لای موبیلە کانەوە دەچوو تا دانیشێ گوتی:

- دیارە لەبیرت چووە ئاوێنەکەی پاك کەیەوە، وەك بزانم پێدەچێ هەر تەنیا ئەو کاتانەی میوانت دێ ماڵێ کۆکەیەوەو دەستێکی پێدا بێنی؟

تەماشایەکی محەممەدیم کرد تا بەڵکە نێ ئەو بگاتێ و بگاتە فریام کەچی ڕوویەرووی سەرنجێکی ڕقاوی ئەو بوومەوە. دوای دانیشتنێ میوانان چوومە متبەخێ تا چای تێکەم و بۆیان ببەم.

محەممەد خێرا پاڵێکی پێوەنام و هەڵیدامە لایەکی متبەخێوە و گوتی:

- مەگەرسەد جارم پێ نەگوتووی کەسوکاری من زۆر گرینگیە بە پاك و خاوێنیە دەدەن، ئەگەر ماڵەکەت جوان خاوێن کردبایەوە ئێستا ئاوا لە ئاقار وان تەریق و شەرمەزار نەدەبوومەوە.

بەنارەحەتیەوە گوتم:

- باشە ئەدی بۆ خۆت نابینی کە هەموو جێیەك پاك و خاوێنە؟ من لە مەبەستی جەمیلەی لەو دەست خستنە بێ جێیانەی ناو ژیانی ئێمەی تێناگەم و نازانم بۆ هەمیشە هەر هەوڵ و تەقەلای تێکدانی ئارامی و ئاسوودەییە ژیانی ئێمەیەتی؟

محەممەد هەروەك شێتان هەردوو دەستی دەخنخنۆکێ ئام و بەرقەوە گوتی:

ئەگەر یەکجاری دی سووکایەتی بە براژنم بکەی دەتخنکێنم تێگەیشتی؟

پێش ئەوەی هیچ قسەیەك بکەم لە متبەخێ چووە دەرێ و چۆوە لای میوانان. لەبن لێوانەوە گوتم:

- خودا ئەمشەو بەخێر بگێڕێ و ڕەحمێ بکا کە ئەو ئەسناسە ئاگرێکی نەکاتەوە.

چام تێ کرد و بردم. کاتێکی کە سینییەکەم لەبەردەمی خەسووم ڕاگرت تا چای هەڵگرێ، چاوێکی لەمحەممەدی تروکاند وگوتی:

- بزانم داخوا هێشتا سوارە سوکەڵێکتان هەر وەرێ نەخستووە؟

لەشەرم و لەتەریقیان ڕوومەتم سوور هەڵگەڕان و هیچم نەگوت خەسووم درێژەی دایە:

ڕەها گیان پێتوانیە خەریکە درەنگ دەبێ منیش حەز دەکەم منداڵی محەممەدی لە بەرو باوەش گرم...

جەمیلەش لەولاوە دەگەڵ قسەکانی خەسوومدا گوتی:

- خوا بکا ڕەهاش وەك دایکی هەر کچە زێ نەبێ...

بە ڕق و توورەییەکەوە سەیرێکی جەمیلەم کرد و هیچم نەگوت، ڕاستیەکەی هێشتا ئازاری لێدانەکانم هەر لەبیر نەچوو بۆوە.

ئەو ساتە حەزم دەکرد لە جیاتی من محەممەد وەڵامی ئەو ژنە لەخۆ ڕازی و خۆ بەشت زانە بداتەوە، بەڵام محەممەد وەك کەڕ و لاڵان بوو، هەرگیز قسەی دەور و بەرەکەی نەدەبیست، هەموو هۆشێکی هەر بەلای منەوە بوو کە نەکا بێ ڕێزیەك بە دایکی یا بە براژنەکەی بکەم.

هێشتا سەعاتێکیان بەسەر هاتنێدا نەچوو بوو کەزەنگی دەرکێ بلند بوو و محەممەد ڕاپەڕی و بە نیگەرانیەوە بەرەو لای منەوە هات و پرسی:

- تۆ چاوەڕێی کەسی؟

سەرێکم بادا و گوتم:

- نەء بڕیار نەبووە کەس بێتە ماڵێ مە.

محەممەد بە دەستە پاچەییەوە گوتی:

- برۆ دەرکێ بکەوە ئەگەر ئیشیان بە من بوو بڵێ لە ماڵ نیە.

سەرم لە دەستەپاچەییە محەممەدی سوورِما بەڵام راست نەبوو لەلای میوانان هۆیەکەی لێ بپرسم بەرەو لای دەرکی حەسارێوە چووم و دەرگاکەم کردەوە. بە دیتنی دایك و بابانم زۆر دڵشاد بووم و بەخۆشحاڵیەوە فەرمووی ژوورێم لێ کردن.

محەممەد دەنێو دەرکەی ژوورێدا راوەستابوو هەر بە دیتنی دایك و بابەی سەر و سەکوتی تێکچوو و بەبێ ئەوەی کە بەرەو پیریان بچێ و بەخێرهاتنیان بکا لووتی خۆی هەڵەنگاوت و بەرەو ژووریی بادایەوە. بابە و دایە بەو بێ ئەدەبییەی محەممەدیان زانی بەڵام کەسیان بەسەر خۆیان نەینا. دایە پرسی:

- دەڵێی لە ناوەختدا هاتین، نەمانزانی میوانتان هەیە! لەخۆرِا و لە ناوەختدا لێمان تێکدان...

قسەکەم لێ وەرگرتەوە و گوتم:

- قسەی وا مەکەن، خۆ میوان غەوارەیەك نین کەسوکاری محەممەدین ئەمشەو میوانی ئێمەن.

رێنماییە دایك و بابەم کرد بۆ ژوورێ و بۆ خۆشم بە دوایاندا. کەسوکارەکەی محەممەدی هەریەکەو چاك و چۆنی و ئەحواڵپرسییەکی ساردو سرِیان دەگەڵ دایك و بابدا کرد، ئەوانیش وەك بێگانان چوون لە لایەکیەوە دانیشتن.روویان لە هەر یەکێك لە میوانەکان دەکرد و دەیاندواندن بە کورتە وەڵامێك سەروبنی مەسەلەکەیان دەبراندەوە و وایان پێشان دەدا حەزیان لە درێژەپێدانی قسەکان نەبێ. داکێ محەممەدی بەدیتنی دایك و بابەی وای رووی خۆی تێکنا هەر کەسێکی بیدیبایە هەر لە دوورەوە دەیزانی چاوی پێیان هەڵنایە،دوای بەخێرهێنان و چاك وچۆنیەکی ساردوسرِ دەگەڵ دایك و بابەیدا چوو لە لایەکیەوە دانیشت و ئیدی قسەی نەکردنەوە.

دایکەی بێ ئاگا لە هیچ رووی دەوی کرد و گوتی:

- ئێوە ئەو شۆ زۆر بێدەنگن؟ دەشتێکی بڵێن با ئێمەش سوودێك لە فەرمایشەکانتان ببینین.

داکێ محەممەدی چاوێکی قیچ کردەوە و دە وەڵامی دایە یدا گوتی:

- که قسەکەر زۆر بوون ئادەمیزاد دەرفەتی قسانی نامێنێ بە تایبەتیش ئێوە خۆ ماشەڵڵا مۆڵەتێ قسان بە کەس نا دەن.

لە پڕ هەموو لەشم وەلەرزە هات، دایکە بە ئاشکرالەو وەڵامەی کەبیستی ڕەنگی سوور هەلگەڕا و بەدەنگێکی لەرزۆکەوە گوتی:

- بەڕاستی من ئەگەر زۆرم گوتبێ داوای لێبووردن دەکەم چونکە من هەر لە هاتنە ژوورەوێمرا تەنیا هەر چاك و چۆنی و ئەحوالپرسیم دەگەڵ تاك تاکەی ئامادەبووانـدا کردووە و هیچی دی و چ قسەیەکی دیم نەکردووە.

دایکە کەمێ ڕاوەستاو دوای ساتێك درێژەی دایەوە:

- دیارە ئێمە ئەمشەومان لێ تێك دان، ڕاستیەکەی نەمانزانی کە ئێوە ئەمشەو لێرە میوانن دەنا نەدەهاتین و دانیشتنەکەتانمان لێ تێك نەدەدان.

خەسوو بەبێ شەرمیەوە لە وەڵامی دایکمدا گوتی:

- پێموانیە هیچ دایکێك لە ماڵی کوڕەکەیدا میوان بێ بەڵکە خاوەن ماڵە.

دایکم خاکە ڕایانە وەڵامی دایەوە:

- بەڵێ، هەقتانە، من مەبەستەکەم خراپ بۆهات و گوتم یا ئێوە ئەمشەو قسەکانی منتان لێ خۆش نایە، من هەرگیز مەبەستم شتی نابەجێ نەبووە ونیشمە...

هەر بۆ ئەوەی کوتاییش بە دەمەقاڵێیەکە یان بێنم خێرا چوومە مەتبەخ و قاپی میوە و شیرینیم دەگەڵ دەستی خۆمدا هێنان و فەرمووم لێ کردن.

داکێ محەممەدی وەك ئەو شەوە هەر بۆ شەڕ و هەرایە هاتبێ گوتی:

- محەممەد ئەوە چ باسە، وا ئەو هەموو میوە و شیرینیەت کڕیوە: هەر بۆیە دەژیانی خۆتدا قەت نابی بەهیچ و هیچ بە هیچ ناکەی، هەر لەبەیانیەوە تا شەوێ ئیشێ دەکەی هەر بۆ وەی لایەکی گەلان گێدان و تێکەو لێکەی ژنەکەت بگری و پڕکەیەوە

لەرزێکی وام هاتێ تەواوی بەدەنی گرتمەوە لە حەژمەتان قاپی میوەوشیرینیەکەم لە دەستی بەربۆوە سەر عەردی وشکا.

جەمیلە بە دەنگێکی بەرزەوە گوتی:

- ئەوە هۆشت لە کوێیە؟ وا ئەو قاپە نازدارەت شکاند، وای حەیف بۆ ئەو قاپانە، زۆر بەنرخ بوون. دەو دەمەو ساتەمدا مەبەستی جەمیلەی چاك دەزانی، ئەودەیویست ئەو ئاگرەی خۆش کا، کە هەموو دەمێ لەسەر هەڵایسانێیە.

- محەممەد کە هەروەك مرۆڤی قورمیش (کۆك) کراو چاوەڕێی قسێکی بوو تا لەجێی خۆیەوە دەرپەڕێ لە جێوە بڵند بۆوە و بە هاوارەوە گوتی:

- چەند دەست و پێ سپیلکەی، دەڵێی ماری پێوەدای کە قاپەکانت ئاوا بەو جۆرەی بەردانەوە هەی هیچ و پووچ.

بابە کە تا ئەو ساتەش بێدەنگ لەلایەکەوە دانیشتبوو و ئاگای لەهەموو رووداوەکان بوو بە دەنگێکی لەسەر خۆوە گوتی:

- ئێستا هەر باش بوو کە دەست و پێی بریندار نەبوو. بە یارمەتی ئێوە هیچ خۆتان نارەحەت مەکەن، هیچ نەبووە من بەڵێن بە هەردووکتان دەدەم زۆر لەوانەی خۆتان چاکترتان بۆ بکڕمەوە و بۆشتان بێنمەوە.

دایکم بەنارەحەتیەوە لە جێوە هەستاو رووی دەمن کرد وپرسی:

- بابزانم دایەخان دەست و پێت بریندار نەبووینە، هەرگیز نارەحەت نەبی، ئەوانە هەمووی بەلاّوەگێڕی خۆت بن ئەوە هەمووی قەزا و قەدەرە و وەقاپەکان کەوتووە، هەرخۆشت تێك مەدە و مەڵێ تاقمەکە کەچ دەبێ، تاقمەکەی راحیلەش هەر ڕاست وەك ئەوەی تۆیە قاپی میوە و شیرینییەکەیت بۆ دێنمەوە.

ئەوجا بەرقیکەوە سەیرێکی محەممەدی کرد و گوتی:

- باشە خوا کردی و زۆریش سوپاس بۆ خوا کە تۆ نایان کڕیەوەو پارەکەیان نادەی کە ئاوا بەسەر رەهایدا دەشیڕێنی، رەنگە ئەو قاپە بێ نرخ و بەهاو هیچانەی کەبەلای ماڵە براکەتەوە زۆر بەنرخ بن لە ماڵێ مە سەد دانە قاپی ئا ئاوا بە قوربانی تاڵە موویەکی سەری کچەکانمە.

خەسووم کەلەلایەکەوە دانیشتبوو وەك فەنەرێ لەجێی خۆیەوە دەرپەڕی و بەدەنگێکی بەرزەوە رووی قسانی دەدایکم کرد و گوتی:

- بەسیەتی بیبڕەوە خانم هێندەمان بەروجیازی کچەکانتان بەچاویدا مەدەنەوە، بەرو جیازچیە، بەروجیاز بە بووکێوە جوانەکە بەداخەوە کچەکەی ئێوە ئەو بایەخەی هەر نیە و هیچ ناهێنێ.

تا دەهات هەرای دایکم وداکێ محەممەدی بەرەو ژوورتر دەچوو کە بەناوبژیوانیە بابم و شووبراکەم هێور بۆوە و دامردەوە. دایك و بابم هەردووکیان بەنابەدڵی و پەشێمانیە هاتنێیان ماڵێ مەیان بەجێ هێشت و رۆیشتنەوە. ئەو شەوە خەسووم هەرچی ناکرێ پێی کردم و تاتوانی تانە و تەشەرو تانووتی لێ بارکردم و هەرکە بێدەنگیش دەبۆوە جەمیلە بە ئەنقەست شتێکی

دەگوت و قسێکی دەکردەوە و سەر لەنوێ ئاگری خەسوومی خۆش دەکردەوە و دەگیانی منی بەردەدایەوە. محەممەدیش لایەنی ئەوان بوو و ئەو جنێوانەی زۆر بەبێ شەرمیەوە هەمووی بە دایك و بابم دان.

من کە لەوزەم دانەما و چیدیکەم خۆ پێ ڕانەگیرا پەنام بردە بەر لایەکی مەتبەخێوە و بەبێ دەنگی بەکوڵ گریام، هەموو نارەحەتیەکەشم هەر لە محەممەدی بوو کە چۆناوچۆنی ئەو هەموو چاکە و پیاوەتییەی دایك و بابی لەبیر خۆی بردۆتەوە و ڕێزی ئەوانی ئاوا خستبووە ژێرپێ و ئەو هەموو هاریکارییەی ئەوانی لەبیرچوو بۆوە.

لە مەتبەخێدا دەگریام کە محەممەد هاتە مەتبەخێ و بەدەنگێکی بەرزەوەی وا کە هەموو ئەوانیدیش گوێیان لێبێ گوتی:

- چیە، بۆ وا لێرە چەقیوی و فرمێسکان بەردەدەیەوە؟ ناکا دایك و بابت مردبن؟

لە ڕقان و لەبێزاریان سەیرێکی محەممەدم کرد و بەدەنگێکی بەرزەوە هاوارم کرد:

- هەی بێ شەرم و بێ ئابڕوو، شەرم لە خۆت بکە، ئەوان کەمیان بۆ نەکردی، ئەگەر کەمێك مێشکت هەبێت و هەست بکەی تێدەگەی کە لەبەرامبەر ئەو هەموو لە خۆ بووردەییەی ئەوان دەبێ بێی دەست و پێیان ماچ کەی، تێگەیشتی! ئەوەش پیاوی خۆی دەوێ کە هەرگیز لە دەست یەکێکی وەك تۆ نایەت.

محەممەد پشتە دەستێکی وای لە دەمی دام کە دەمم بە تەواوی پڕبوو لە خوێن.

دەنگی دەمە قاڵی من و محەممەد، ئەوانەی لەوێ بوون هەمووی کێشانە مەتبەخێ.

خەسووم بە بەدەنگەوە هاتنێ محەممەدی بە تووڕەییەوە بەرەولامەوە هات و گوتی:

- هەی ئافەرین لەو شیرەی خواردووتە! دایکت کچێکی چاکی پەروەردە کردووەو ناردوویەتیە ماڵ و مێردی دەزانن ژنێك کە بەسەر مێردەکەیدا بقیژێنێ دەبێ قوڕقوشمی دەزاری کەی، چل ساڵانم دەگەڵ مێردی خوالێخۆشبووم لەبن ساپیتێکی بەسەر برد و دەگەڵ هەموو خراپییەکانیشیدا تەنانەت جارێکم دەنگ بە ڕوویدا بەرز نەکردەوە، گوناهی تۆنیە خەتای دایکتە کە ئەو شتانەی فێرنەکردووی، دیارە دایکت هەر بەسەر بابتدا دەقیژێنێ بۆیە تۆش ئاوا فێر بوو وی و ڕاهاتووی؟

بە هەموو توانایەکمەوە قیژاندم:

- بیبڕەوە بەسە، بۆت نیە بەهیچ جۆرێك ناوی دایکم بێنی، دایکم نەك هەر تەنیا بێ گوناهە، ئەوە هەر ئێوەن کە کوڕێکی ئاوا دڕندە و بێ نمەکتان پەروەردە کردووە...

ژەی قسەکانم دەنێو مست و پێلەقەی محەممەدیدا ونبوو. تەنیا دەنگی جنێوەکانی ئەو
ڕەماقوولێیەکانی داکێ محەممەدیم دەبیستن. ئەو دەنگەی وی کە بەردەوام هانی محەممەدی دەدا
چاکترم لێدا و بەهات و هاوارێکی بەرزەوە دەیگوت:

- هێندەی تێهەڵدە تا دەتوانی تا جارێکی دیکە نەتوانێ لە رووت هەڵگەڕێتەوەو چ خراپە
پێت بکا و پێت بڵێ.

ئەمجارەش بەناوبژیە براگەورەکەی محەممەدی دەستی لە لێدانێم هەڵگرت و دەگەڵ دایك و
براکەیدا ماڵەکەیان بەجێ هێشت.

من و کۆڵە غەم و خەفەتێك و هەناسەی سارد ماینەوە. بەیانی پیرێژنێ خاوەن خانوو
بانگی منی کرد و بەسەرهاتی شەوی پێشووی پرسی و هۆی ئەو هات و هاوارەی شەوی
رابردووی پرسیەوە. دوایەش زۆر بەڕێزەوە داوای لێبووردنی دەنگدانێ خانووەکەی کردین و
گوتی:

- کچەکەم من تازە تەمەنم تێپەڕیوە و پیرو کەنەفت بوو وم توانای بیستنێ شەڕو هەرا و
زەنای دەور و بەرانم نەماوە. جگە لەوەش من شەرمم بەخۆیە و حەزناکەم هەموو رۆژێکی خوا
دایناوە دەنگی هات و هاوارو قیژەو زریکەم لە ماڵێ هەستێ، کە مێردەکەت هاتەوە بڵێ با
غەمێ لە خانووێکی دیکە بخوا.

سەرم بەردایەوە و گوێم بۆ قسەکانی پیرێژنێ شل کرد، نەمدەتوانی سەیری چاوەکانی بکەم.
بەشەرمێکەوە گوتم:

- بە چاوان، بەڵێن بێ هەر محەممەد بێتەوە ماڵێ بەسەرهاتەکەی پێ بڵێم و دەربارەی هات و
هاواری دوێنێ شەوێش شەرمەندەم دەبێ ببوورن کە نارەحەتمان کردبن.

پیرێژن بە میهرەبانیەوە گوتی:

- کچەکەم تە هێشتا کاڵی و پیاوان ناناسی. هەر یەکەی بەدووان بەژنان هەڵدەپرژێن و
کەچی توانای دوو قسەی ڕاست و ڕەوان و حیسابییان نیە. ئەگەر بەقسەی من دەکەی کەمتر
دەم دە دەمی مێردەکەت بنێ تا لە لێدانێ بە دووربی دەنا ئەگەر هەروا بڕوا کارتان تەواوە.
هیوادارم قسەکانم وەك ئامۆژگاری دایکێکی دڵسۆز لێ قبوڵ کەی.

سوپاسی پیرێژنێم کرد و هاتمەوە ژوورێ.

ئەو شەوە محەممەد هەواڵێکی نەبوو و نەشهاتەوە ماڵێ، رۆژی دواتر و رۆژەکانی دیش محەممەد
هەر نەهاتەوە ماڵێ، ماوەی یەك هەفتە ئاگام لە محەممەدی بڕا و کە نەشدەهاتەوە لە دڵەوە پێم

خۆش بوو. دەمزانی وەك منداڵان لە ماڵەوە تۆراوە و توورە بووە و چۆتەوە ماڵێ دایکی و حەزم دەکرد تۆران و توورەبوونەکەی تابێ هەر درێژە بکێشێ و نەیەتەوە ماڵێ و ماوەیەکی دیش هەروا بێ.

لە بەسەر هاتەکانی ئەو شەوەوە هەرچەند جارێکی کە بە تەلەفۆن قسەم دەگەڵ دایك و بابمدا دەکرد دڵنیام دەکردنەوە کە دوای رۆیشتنەوەی ئەوان هیچ رووی نەداوە ومن و محەممەد پێکەوە بە ئاسودەیییەوە ژیانێکی خۆش بەسەر دەبەین. بەڵام دوای تەلەفۆنەکەم دەگەڵ دایك و بابمدا بە دەنگێکی بەرز و بەکوڵەوە دەگریام و نەفرەتم لە بەختی رەشی خۆم دەکرد.

دوای هەفتەیەك محەممەد هاتەوە ماڵێ و من بەناچاری چووم قسەم دەگەڵ کردەوەو راسپاردەی پیرێژنێم پێ راگەیاند.

دوای یەك مانگ گەڕان و سووڕانەوە تا محەممەد لەیەکێك لە گەڕەکە بەد ناوەکانی شاری خانووێکی بەکرێ گرت و گواستمانەوە ئەوێ. ئەو خانووەی محەممەدیش بەکرێی گرتبوو ئی بێوەژنێکی جحێڵی تەڕ و تۆڵ بوو کەسێ منداڵی سەلکەو بنکەی هەبوون و بۆ دابین کردنی خەرجییە وان دوو ژووری بەکرێ دابوون.

لەو شەوەوەی کە هەرایەکەمان ببوو ئیدی محەممەد چوونە ماڵێ بابمی لێ قەدەغە کردووم و بۆ ئەوەی منیش جارێکی دی هیچ بەهانەیەکی نەدەمەوە دەستێ و هەرای دیکەی لێ پەیدا نەبێتەوە خۆم مات کردووەو هیچ ناڵێم.

جەژنی نەورۆزێش محەممەد هەر تەنیا جارێکی بردمەوە ماڵێ بابم و ئەویش سەعاتێکی نەبرد قیت بۆوە و داوای لێکردم بچینەوە ماڵێ خۆمان.

سێ مانگ بوو چوو بووینە خانووەکەی موحتەرەم خانمێوە، محەممەد ئێواران لە رۆژەکانی دی زووتر دەهاتەوە ماڵێ و بەسەر و روویەکی خۆش و بە میهرەبانیەکەوە چاك و چۆنی دەکرد. لەو گۆڕانانەی ویم سەر سووڕمابوو، ئەو گۆڕانانەی محەممەدیم بەودمی خێر لێك دەدایەوە و بەخۆشی و شادییەکەوە چوومەوە مەتبەخێ و پیاڵە چایەکی تازە دەمم بۆ تێکرد و بۆم هێنایە ژوورێ. محەممەد بەردەوام خەریکی گەمەو جەفەنگان بوو و منیش ئەوە بەکوڵ و جۆشەوە هەروا بە دوای هۆی ئەو گۆڕانە کتوپڕانەدا وێڵم. لەکەشێکی زۆرشاد و شەنگوڵیدا نانی ئێوارێمان خوارد دوای ئەوەش کە قاپەکانی سەرمێزەکەم کۆکردنەوە محەممەد بانگی کردم و گوتی:

- رەها دانیشە دەمەوێ هێندێکت قسان دەگەڵ بکەم.

لەوەڵامدا گوتم:

- ئەگەر کەمێك راوەستی تا قاپەکان دەشۆم و پیالە چایەك و هەندێ میوەت بۆ دێنم ئەودەمی پێکەوە دادەنیشین و قسان دەکەین.

محەممەد قایل بوو و منیش بە تاسەو کەفوکولێکی زۆرەوە چایەکەم گەیاندێ و میوەم دەقاپێکی جوان و رازاوە کرد و دوای شووشتنێ قاپەکانیش چوومەوە ژووریێ و پیالە و چا و قاپە میوەکەم لەسەر مێزەکە دانان. داوام لە محەممەدی کرد تا چایەکەی ساردنەبۆتەوە بیخواتەوە و منیش سێوێکم بۆ پاك کرد لەسەر قاپێکی میوە خواردنێم دانا و لەسەر مێزەکە لەبەردەمیم دانا. کاتێ کەویستم دەستم بکێشمەوە محەممەد دەستی گرتم و بەسەرنجێکی عاشقانەوە گوتی:

- تۆ فەرموو دانیشە، ئەمشەو دەمەوێ هەواڵێکی خۆشت بدەمێ.

منیش کورسییەکم بەرەولای خۆمەوە راکێشا و دانیشتم. چاوم دەدەمی محەممەدیەوە بڕی تا گوێم لە قسەکانی بێ. حەزم دەکرد تا زووە ئەو هەواڵە خۆشەم بداتێ کە دەیهەوێ پێم بڵێ. بە تاسەوە گوتم:

- هەمولەشم گوێیە، دەی خێراکە ئەو هەواڵە خۆشەم بدەیە.

محەممەد زەردەخەنێکی هاتێ و بەپەنجەکانی کەوتە دەست بەسەر داهێنانی ئەو سەرو پرچ و قژانەی بەسەر شانەکانمدا هاتبوونە خوارێ و گوتی:

- دەمەوێ مژدەیەکی خۆشت بدەمێ بەمەرجێك بەڵێن بدەی کە یارمەتیم دەدەی و پشتم دەگری.

زۆر بە تاسەوە گوتم:

- دڵنیابە ئەوەی لە دەستم بێ دریغی ناکەم.

محەممەد هەروا کە زەردەخەنەی بەلێوانەوە بوو گوتی:

- لەو رۆوە بڕیارە کە راسپاردەی دروونی جلی ژنانەش قبوڵ بکەم و ئەمەش یانی راسپاردە و دەسکەوتی زیاتر بەڵام دەبێ تۆش دەوکارەیدا یارمەتیم بدەی ئەو ئیشەی کە تۆ دەبێ بیکەی ئەوەیە کە هەموو رۆژێ دەنێو موغازەیدا یارمەتیم بدەی.

بەنیگەرانیەوە گوتم

- بەڵام خۆمن دروومان نازانم.

- پێویست ناکا تۆ بدرووی، تەنیا تۆ لەلایەکی موغازەکەوە ئەندازەی مشتەرییە ژنەکان دەگری و ئەمنیش بۆیان دەدرووم. دوای دروونێش بەگوێرەی ئەو ناو و نیشانانەی مشتەرییەکان

داوایانە بۆیان دەبەیەوە بەر دەرکێ ماڵێیان و دەیاندەیەوە, بەم جۆرە پارەی بردنەوێ جلەکانیش وەردەگری.

لەبیستنێ قسەکانی محەممەدی و ئەو کارەی بۆی دەبەرچاوگرتبووم داچڵەکیم و بەنارەحەتیەوە گوتم:

- هەرگیز کارم بەو کارەی هەرنیە، تۆ بۆ خۆت دەزانی کە ئێمە پێویستمان بەو جۆرە پارە پەیداکردنە هەر نیە، خۆ ئەگەر پێویستیشمان بە پارەی بوو ئەوە هەرچەندێکی بمانەوێ بابم دەماندات.

محەممەد بە توورەییەوە گوتی:

پارەی بابم، پارەی بابم، هێندەم لەو قسانە بیست ماندوو بووم ئەوەندەی سامان و پول و پارەی بابتم بەچاوی دادەیەوە، خاتوون من هیچ نیازێکم بە پارەی بابت نیە، حەزدەکەم بۆ خۆم خەرجیە ژیانی خۆم دابین کەم، باشە ئەوە گوناهە؟.

بۆ ئەوەی دیسانەوە شەڕو هەرامان نەبێتەوە قبوڵم کرد و لەبەیانی ئەو رۆژەوە هەموو رۆژێ بەیانیان دەگەڵ محەممەدیدا دەچووینە شوێنی ئیشەکەی کە هەر موغازەکەی بابم بوو دەچووم و ئەندازەی ئەو ژنانەم دەگرت کە بۆ جل دروونێ دەهاتن و ئەوجا دەمدایەوە محەممەدی.

بەدرێژایی رۆژێش محەممەد بە بیانووی هەمە جۆر و جیاوازەوە موغازەو کارەکەی بەجێ دەهێشت و دوای چەند سەعاتێکان کەمنی بەتەنیا لە موغازەکە بەرهەڵدا دەکرد دەهاتەوە.

هەموو جارێکیش کە دەمپرسی چوو بوویە کوێ؟ هیچ وەڵامێکی ڕاست و ڕەوان و روونی نەدەدامەوە دڵم ئاوێ بخواتەوە.

چەند مانگێك بەم جۆرە رابردن ومن سەرە دەریم لە کارەکانی محەممەدی دەرنەدەکرد. هەر جارێکی کە موغازەکەی بەجێ دەهێشت و بە بیانووی ئیشێکیەوە منی بە تەنیادەهێشتەوە بەردەوام رایدەسپاردم موغازەکە بەجێ نەهێڵم و نەچمەوە ماڵێ، ئەگەر پیاویش بوون داوایان لێ بکەم چەند سەعاتێکی دیکە بێنەوە.

منیش قبوڵم دەکرد، وە ئاگا هاتبوومەوە کە ماوەیەکە کاتێ کەجلەکان ئامادەی وێدانەوێ و بردنەوێ دەبوون ئەو بەجورەها بیانووی جیاواز جیاواز منی بۆ دەرەوەی موغازەی بەرێ دەکرد و پێش هاتنەوەی منیش جلەکانی هەموو قەد دەکردن و دەیپێچانەوەو کە دەشهاتمەوە ناو موغازەکە بەستە جلەکانی دەدایە دەستم تا بیانبەمەوە ماڵێ خاوەنەکانیان.

سەیرم بەو گۆڕانانەی ڕەفتارەکانی محەممەدی دەهات، ئەو جاران پێی خۆش بوو خۆم لەپشیلۆکانیش داپۆشم کەچی ئێستا نازانم چبووە واچەند سەعاتانم لە موغازەی بەتەنێ بەجێ دەهێڵێ ویا دەمنێرێتە بەر دەرکەی ماڵە مشتەرییان ئەمن دەوەی ناگەم.

ڕۆژێکی ساردو سۆڵەی ئەسفەند مانگێ بوو بایەکی توندی دەهات. جلی یەکێك لە مشتەرییەکان تەواو ببوو و محەممەد پەلەی بوو تازووە جلەکان بەرمەوە ماڵێ خاوەنی و بیاندەمەوە. چەندەم پێ داگرت تا هەروا کەمێك خۆشتر بێتەوە نەچووە گوێی و قبوڵی نەکرد و گوتی:

- ئەو شۆ جلەکانیان پێ دەوێن و دەبێ تا زووە بیاندەینەوە.

سەیرێکی دەرەوەم کرد، بایەکی توندی دەهات و تەپوتۆزی ڕەحەواخستبوو گوتم:

- ئێستا ئەوە تازە هەوڵی بەیانییە، باشە خۆ ئێستا تا شەوێ زۆری ماوە، تاوێك ڕاوەستە با هەوا خۆشتر بێتەوە.

محەممەد بە میهرەبانییەوە گوتی:

- ئەوە جلەکان کەمایەسییەکیان هەبوو با هەر نەبێ دەرفەتی ئەوەمان بەدەستەوە بێ گلەیی و گازاندەکانیان ببڕین.

بە هەر شێوەیەك بوو منی ڕەوانەی ماڵێ خاوەن جلەی کرد. سواری تاکسی بووم و بەرەو ئەو ناونیشانەوە چووم کەپێم بوو. لە ڕێیە بایەکی بەهێزی دەهات. کاتێ کەلە تاکسیەکە دابەزیم زۆر بەسەختیم هەنگاو داویشت. تەپو تۆز و با بەرچاویان گرتبووم دەستم بەبەر چاومەوە گرت و ڕێچکەی شەقامێم تا ماڵێ مشتەرییەکەی دایە بەرێ کە دووپیاو بەجل و بەرگی تایبەتی خۆیانەوە ڕێیان پێ گرتم. یەکێکیان کارتێکی لە گیرفانی پاڵتۆکەی دەرێناو ڕووبەمنەوە گوتی:

- خاتوون! ئێمە ئەفسەری ئاسایشین، ئێوە دەبێ دەگەڵەمەدا بێنە ئاسایش. گێژو وێژانە سەیرێکم کردن و پرسیم:

- باشە بۆ، مەگەر من چ هەڵە و گوناهێکم کردووە، بە یارمەتی خۆتان پێم بڵێن چ ڕوویداوە؟

یەکێکیان سەیرێکی ئەویدیکەیانی کرد و گوتی:

- یارۆ دیارە زۆر کارکردە و کارامەیە سەیری چۆنی خۆ لە گلێلیە داوە.

ئەوجا بەرەو شەقامێوە پاڵێکی پێوەنام وگوتی:

- له دەفتەرێ هەموو شتێك ڕوون دەبێتەوە.

هەردووکیان تا بڵێی ڕەفتاریان وشك و بە تەواوەتی ڕاشکاوانە بوو. سەیرێکی دەوروبەرێم کرد و ناکامانە لە ناسیاوێکی گەڕام تا ئەوانە تێ بگەیەنێ.

دەوساتەیدا بیرێکم کردەوە ئەگەر محەممەد ئاگاداربێت و بەوە بزانێتەوە چ دەکاو چی بەسەردێ. خۆ ئەگەر کەسوکارم بەو باس و خواس و مەسەلانە بزانن ئەوە چ ئابڕوو چونێکی لێ دەکەوێتەوە. بەنیگەرانیەوە سەیرێکی دەورو بەرەکەم کردەوە بەڵام هیچ کەس و ناسیاوێکم نەدیت. بەناچاری دەگەڵیان وە ڕێ کەوتم و منیان بردە ئاسایش بەڵام هۆی گرتنەکەیان هەر پێ نەگوتم. تا گەیشتنە ئاسایشێ هەر گریام و تکام لێ کردن بەرهەڵدام بکەن، دڵنیام کردنەوە کە لێیان تێکچووە و بە هەڵە چوون و من هیچ کارێکی نابەجێم نەکردووە. بەڵام ئەوان هەروا وشك و بێ گیان دەهاتنە بەرچاو. بۆ ساتە وەختێکی زۆر کەم ئەوەم بە خەیاڵدا هات کە دەگەڵ دوو پەیکەردا دەدوێم.

ئێوە نازانن دەوساتەوەختە سەختەدا چیم بەسەرهات دەگەڵ ئەوەشدا کە من لە بێ گوناهیە خۆم دڵنیا بووم بەڵام هەموو ئەندامەکانی لەشم وەك بیژۆکێ دەلەرزین ئەویش لەترسی ئابڕوو چوونێ لای محەممەد و کەسوکارەکەی. دەترسام گیرانەکەم ببێتە بیانووی قسە و قسەلۆکی سەرزمانی محەممەد و کەسووکارەکەی. ئەی ئەگەر محەممەد ئامادە نەبوو دەگەڵ ژنێکی پەروەندە داردا بژی و هاوسەریەبکا ئەو دەمی قوڕی کوێ بە سەری خۆمدا بکەم؟ بەوەش کە ناوی بابم لەکەدارکردبوو زیاتر دەلەرزیم.

بە هەر شێوەیەك بوو دەنێو تەواوی گێژاوەکانی بیرو خەیاڵەکانمدا گەیشتینە ئاسایش و بردمیانە ژوورێکەوە. دەگەڵ چوونە ژوورەوێمدا بەستە جلەکانیان لێوەرگرتم و دوای سەعاتێکیش بردمیانە ژووری لێکۆڵینەوە.

یەکێك لەو ئەفسەرانەی کە جلەکانی لەمن وەرگرتبوو هێنای لەسەر مێزەکەی دانا و لەولاترەوە ڕاوەستا. کات بەسستی دەڕۆیی و دڵیشم بە توندی لێی دەدا.

بە ترسێکەوە سەیری ئەملاولایانم دەکرد و پڕ بە دڵ داوام لەخودای خۆم دەکرد و دەپارامەوە بەزووترین کات لێرەم ڕزگارکا. ئاغایەکی پیرە بەجل و بەرگی فەرمیەوە هاتە ژوورێ و ئەو ئەفسەرەی منیشی دەستگیر کردبوو یەك پێ لە پێشوازییەیدا ڕاوەستا. منیش لە جێی خۆم قیت بوومەوە لەسەرەخۆم بەخێرهاتن کرد. ئەو پیاوەش ئاغای مورتەزەوی گەورە

ئەفسەری فەرمانگەی ئاسایش بوو بە وردی سەیرێکی کردم و وەڵامی بەخێر هێنانەکەی دامەوە.

بە ئاماژەی دەست تێیگەیاندم کە لە جێیەکەی خۆم دانیشمەوە. دوایەش بەرەو لای مێزەکەوە چوو بەستە جلەکەی لەسەر مێزەکە هەڵگرت و ڕووی دەمی تێکردم و گوتی:

- بابزانم ئەو بەستەیە هی ئێوەیە؟

بەدەنگێکی لەرزۆکەوە گوتم:

- نەء،جلی یەکێك لە مشتەرییەکانی موغازەیە کە بۆم دەبردەوە.

هەروا کەسەیری نێو چاوی دەکردم گوتی:

- پێیان راگەیاندووین کە ئێوە بە بیانووی جل بردنەوێ مشتەرییان مادده هۆشبەرەکان بڵاو دەکەیتەوە، ئێوە ددان بەو تاوانەی خۆتاندا دەنێن؟

بەزاری بەشەوە گوێم بۆ قسەکانی رەییسی ئاسایش راداشتبوو و چاوەکانم هێندەیان نەمابوو لەقەپێلکێ بێنە دەرێ و دەرپەڕن. ناباوەڕانە گوێم بۆ قسەکانی شل کردبوو و چاوەکانم تێ بڕیبوون و تەنانەت توانای چاو تروکانێشم نەمابوو، هەرگیزیش بیرم لەوەی نەدەکردەوە کە منیان لەبەر شتێکی ئاوا دەستگیر کردبێ. نا باوەڕانە لە جێوە هەستام وگوتم:

-چی؟ بە تاوانی ماددەی هۆشبەر؟ یانی ئێوە مەبەستتان ئەوەیە کەمن مادده هۆشبەرەکانم بڵاو کردۆتەوە؟ ئەوە کێ وا دەڵێ؟ دڵنیام لێتان تێکچووە دەنا من ئی ئەو کارانە نیم.

ئیدی وەگریە هاتم و بەگریان و زاریەوە گوتم:

- بەخودای درۆیان کردووە من هەرگیز ئی ئەو کارەی نیم ونیشی منیش نیە، بەخودای هەڵەیەك دەوکارەیدا هەیە! ئەو بەستە جلەی کەبەمن بوو دەتوانن بیکەنەوەو سەیری کەن کەهەر جلە و هیچی دی.

ئاغای مورتەزەویش بەسپاییەکەوە گوتی:

- ئێستا هەموو شتێك روون دەبێتەوە.

لەسەر خۆ ئەو بەستەیەی کە محەممەد دابوویە من کردیەوەو جلەکەی بە هەواوە هەڵتەکاند. لەناو جلەکانەوە چەند پرێسکەی چووکەڵەی هێرۆیین بەربوونەوە، پرێسکە هێرۆیینەکانی لەسەر مێزەکەی بڵندکردن و بەبەر چاومیەوە راگرتن و پرسی:

- ئێستاش هەر مل نادەی؟

بەچاوە دەرپەڕیوەکانمەوە سەیرێکی زەرفە نایلۆنەکانم کرد. خەریك بوو شێت دەبووم و لە ناخەوە دەپاڕامەوە کە ئەوە لە مۆتەکەی زیندە خەونێك بەو لاوەتر نەبێت. لەترسان زریکاندم و بێ ئاگا بەربوومەوە.

* * *

ڕەها پەرداخە ئاوێکی لەسەر مێزەکە هەڵگرت و یەکسەرە بەدەمیەوەنا و خواردیەوە. دوایەش هەناسێکی قووڵی هەڵکێشا و دەستی بردە ناو قژیەوەو سەرنجێکی وردی لێدام و ئەوجا درێژەی دایەوە:

- دوای بەئاگا هاتنەوێم خۆم دەژوورێکی دیکەدا وبە سەری پێچراوەوە دیتەوە. کاتێ کە لە هۆش چوو بووم سەرم بەتوندی بەکورسییەکی کەوتبوو و شکابوو. سەرم ئازارێکی زۆری هەبوو, بەسەختی لەجێی خۆم هەستامەوەو چووم لەسەر تەختەجێیەکە دانیشتم و سەرم دەنێو دەستەکانم گرت و بە کوڵ گریام. ئیدی هیچ شانسی ئەوەم گومان نەدەکرد ئەوانە بەبێ گوناهم بزانن، هەرگیز ئەوەم بە خەیاڵدا نەدەهات کە ڕۆژێك لە ڕۆژان مۆری قاچاغ فرۆشیەم بەنێو چەوانێوە بلکێ. سەعاتێك نەچوو بوو کە هەمدیس بردمیانەوە هەمان ژوورەکەی پێشوو و لێکۆڵینەوە دەستی پێکرد. هەموو جارێکیش بێ ئاگاییە خۆم لەو هێرۆیینەی دووپات دەکردەوە و بەدەم گریانێوە هەموو شتەکانم دەگێڕایەوە. ئاغای مورتەزەوی فەرمانی دا محەممەدیش دەستگیرکەن و بیهێننە ئاسایش.

لەبەردەمی محەممەدی دووبارە هەموو شتەکانم بۆ ئەفسەرەکانی ئاسایش باس کردەوە. بەڵام نەچووە ژێرباری هیچ شتێکەوە و منی بە بڵاوکردنەوەی مادده هۆشبەرەکان تاوانبار کرد ئەو گوتی:

- ڕاستیتان دەوێ سەرکار هەرجارێکی کە دەمەویست دەستەجلێك قەدکەم و بی پێچمەوە، خاتوون دەیگوت لەبەر ئەوەی سەلیقەی ژنان بۆ ئەو کارانە باشترە بۆمنی لێگەڕێ و منیش کە ئاگام لە مەحمودی بێ زەواد نەبوو قبوڵم دەکرد، ئا ئەی، سەیرم دەکرد کە هەر جارێکی بیویسبایە دەستەجلێکی بپێچێتەوە بە بیانووی جۆراوجۆرەوە منی لە موغازەی وەدەردەنا و دەیناردم بۆ ئیشێکی.

ئاغای مورتەزەوی زۆر بە وردی گوێی دابووە قسەکانی محەممەدی و دوای کەمێك پرسی:

- خێزانەکەتان چۆنی ئەو شتانە·دێنانە نێو موغازەیەوە و ئێوە ئاگاتان لێنەبوو؟
محەممەد لە پرسیارەکەی ئاغای مورتەزەوی تێکڕابوو بەڵام هەر زوو خۆی گرتەوەو گوتی:
- ئاغا هەروەك بۆ خۆتان دەزانن من دەبوو بەسەعات ئەوم دەموغازەیدا بەتەنێ جێ هێشتبایە تابتوانم بەسەروەختی کرینی دەرزی و دەزوو و قەیتانیەوە بچم و ئیدی چوونزانم ئەو شڕوشاڵاتانە بکرم، دیارە دەوکاتانەدا کە تەنیابووە کاری خۆی کردووە، منی قوڕ بەسەر چوونزانم چی لە بن سەریدایە و خەریکی چیە. هەرگیزیش پێم وانەبووە کە خاتوون ئەو کارانە بکا تا وریابم و ئاگام لێی بێ و هەر ناوە ناوە ناو موغازەکەی بپشکنم و بگەڕێم...
لە حەژمەتان هاوارم لێ هەستاو لە جێی خۆم هەستام و گوتم:
- ئاغا درۆ دەکا بەخودای درۆدەکا، ڕاستیەکەی هەموو شتەکان هەڵدەگێڕێتەوە ئاغای مورتەزەوی بەدەنگێکی گڕەوە منی بێدەنگ کرد و فەرمانی دا بمبەنە دەرێ.
هەر خوا دەزانێ محەممەد چ درۆیەکی هەڵبەستن کە دوای یەك هەفتە ئەویان بەرهەڵدا و منیان بەند کرد. کاری شەو ورۆژانم ببووە گریەو زاری، بەهارهات و من ساڵی تازەم بەزیندانێ دەست پێکرد، هەر چەند زیاترم بیردەکردەوە ڕەفتارە گوماناوییەکانی کە محەممەد دەیکردن یەکە یەکە یانم لەلازیاتر روون دەبۆوە.
ئیدی دەمزانی محەممەد منی بۆ بردە دوکانی بەرگدروونەکەی و بەهۆی چیەوە هەموو رۆژێکی چەند سەعاتێکان لە موغازەی دەچووە دەرێ. لەوەش کە هەروا زووی بۆ پێوە بووم خۆم سەرزەنشت دەکرد. نەفرەتێکی وام لەمحەممەدی دەدڵی خۆمدا هەست پێ دەکرد کە حەزم دەکرد هەر بەو دەستانەی خۆم بیخنکێنم. پیاوێك کە بۆ دەرباز بوونی لەو گوناهانەی کرد بوونی ئامادەبێت ژنە بێ گوناهەکەی تووشی زیندانێ کات شایانی ئەوەیە لەسێدارەدرێ.
دوای تێپەڕبوونی سێ مانگی دیش و هاتنی هاوینێ هێشتا هەر دەزیندانێدا چاوەڕێی بەرەڵلا بوونێ بووم لەوەی کە دەنێو ژنانی بەدناودا گیرابووم وردە وردە وتا دەهات هاوکێشەی خۆمم لە دەست دەداو هەروەك شێتانم لێ هاتبوو. دەو ماوەیەیدا دایك و بابم هەردوکیان دەهاتنە سەردانم و دڵیان دەدامەوە. بابم پارێزەری گرتبوو و ئەو بە کارەکانم ڕادەگەیشت دەماوەی ئەو چەند مانگانەی کەبەسەرگرتنەکەمدا تێدەپەڕی محەممەد تەنانەت جارێکیش چیە نەهاتە سەردانێم. سەرەتای تیر مانگێ بوو کە دادگا یان دانا و بردمیانە

دادگایە بەدەم گریانێوە و لەبەر چاوی هەمووان هەموو شتێکم باس کرد و گێڕایەوە و زۆر بەکەساسی و لانەوازییەوە تکای بەربوونێم کرد:

دوای چەندین سەعات پرسیارو وەلآم کە ئیدی کلآفە ببووم بە چاوی سەرسامیەمەوە فەرمانی بەربوونێم دەرچوو. نازانم چۆنیان پەی بەبێ گوناهیە من برد و بەریاندام بەلآم هەر چیەك بوو هەر لەوێ هەر دوو دەستم بەرامبەر خودای بەرزکردەوەو سوپاسی خوام کرد.

دایکم بەچاوی پڕ گریانەوە دەباوەشێی گرتم و ئەویش هەر سوپاسی خوای کرد.

کاتی بەردانێم ئەفسەرە پیرەکە کە یەکجار زۆر میهرەبان بوو گوتی:

- کچەکەم لە مەودوا بەچاوی کراوەوە ئەو کارانە قبوڵ کە و بیانکە کەپێت دەسپێرن.

ئاخیرەکەی دوای چوارمانگ و نیو ئێش و ئازار و گریانی بەردەوام بەردرام.

ئەو رۆژەی کەلە زیندانێ هاتمە دەرێ دەگەڵ ئەو هەموو تکا و داوا و پێدا گرتنانەی دایك و بابم هەر چوومەوە ماڵەکەی خۆم. دایك و بابم هێندە لە محەممەدی بێزار ببوون زۆر بەگرانی رێیان دام دووبارە بچمەوە ئەو ماڵە. لەبەر دەرکێ ماڵێ دایك و بابم کەمو زۆر حەزیان نەدەکرد بێنە ژوورێ بەلآم هەر بۆ ئەوەی یەك دوو قسان دەگەڵ مێردە بێ غیرەتەکەمدا بکەن هەر هاتنە ژوورێ.

لە دیتنێ شێواویە ماڵەکەی نارەحەت بووم، هەموو ژوورەکان پەرت و بڵاو بوون و تێك هەڵشێلرابوون بەلآم محەممەد دیار نەبوو کە دایك و بابم ماڵەکەیان بەو جۆرە شێواوییەوە دیت نەیانهێشت ماڵەکە رێك خەمەوە و منیشیان دەگەڵە خۆیاندا بردەوە ماڵێ بابم.

خوشکەکانم کە هیچ کامێکیان بەگرتنێ منیان نەدەزانی و ئاگایان لێ نەبوو منیان زۆر بە پەرۆشەوە دەباوەش گرت و لەبەر ئەوەش کە چەندین مانگ بوو نەچووبوومەوە گلەییان دەکرد. ماوەی هەفتێکی لە ماڵێ بابم مامەوە و دەگەڵ ئەو وەلآمانەی بابیشم دەیدانە محەممەدی کەچی ئەو هەر نەهاتە ماڵێ بابم. ناچار ماڵ ئاواییم لە دایك و بابم کرد و بەرەو لای ماڵێ خۆمانەوە کەوتمەرێ.

پێش ئەوەی بچمەوە ماڵێ بڕیارم دا بچمە موغازەکەو ئەوەی لەدەمم بێتە دەرێ و لای خوا ناخۆشە پێی بکەم، هێندە لەو پیاوە قێزەون وبێ شەرم و دزێوەی بێزار بووم حەزم دەکرد هەرچی زووە ئەو قسانەی کە دەو چەند مانگەی لەسەر دڵم خڕببوونەوە هەمووی پێ بڵێم. ئەوجا کێردێکی تابن دەسکان دەدڵی چەقێنم.

گەیە موغازەکەی بەڵام دەرگای موغازەکە داخرابوو. ناچار بەرەولای ماڵێ بوومەوە دە دڵ و هەناوی خۆمدا وەك پڵینگێ بریندارم دەگرماند و جنێوم پێ دەدا. کاتێ کە گەیشتمەوە ماڵێ محەمەد لە ماڵێ بوو و هێشتا لە خەوێ هەڵنەستابوو. ساتێکی لە تەنیشتێوە راوەستام و بەبێزارییەکەوە سەیرێکیم کرد دوایەش بە هەرچی هێزو توانایەکیەوە کە هەمبوو مستێکم دەکەلەکەی کوتا. بە پەشۆکاویەوە لەجێی راستبۆوە و بە دیتنێ من چاوی ئەوق بوون و سەیرێکی کردم. بە دەنگێکی چاپلووسانەوە گوتی:

- ئەوە تۆی رەها، بەراستی خۆتی، بەریاندای، نازانی چەند شادم بە بەربوونێت!

هاوارم کرد:

- بێدەنگ بە هەی بێ ئابڕوو، هەی نا پیاوی بێ غیرەت، تۆ دەبوو لە شەرمان بمری، تۆ غیرەتت نیە، پیاوێك هێرۆیینێ بداتە دەست ژنەکەی بۆی بڵاوکاتەوەهەر بۆ مردنێ چاکە، من ئیدی ئامادەنیم تەنانەت سەعاتێك چیە دەگەڵ تۆدا لەبن یەك ساپیتەی ژیان بەسەربەرم، پێم شەرمە بڵێم تۆمێردمی.

محەمەد خێرا لەسەر جێیەکەی راستبۆوە و بەرەو لامەوەهات و بە میهرەبانیەوە قۆڵی گرتم و گوتی:

- دەزانم، هەقی تۆیە، من هەڵەیەکی گەورەم کرد قبوڵمە، بەڵام هەمووشیم لە پێناو ئاسوودەیی و بەختیاری تۆدا ئەنجام داوە و کردوومە. بەتەوسێکەوە پێکەنیم و گوتم:

بۆ ئاسوودەیی من، دیارە پێتوابووە دەزیندانێدا زیاتر بەختەوەرو ئاسوودەم کە ئینکاری هەموو شتێکت کرد و ئەوەت پێ باشتر بوو کە مۆری قاچاغچیەتی بەنێو چەوانی ژنەکەتەوە بنێی، وەڵڵاهی ئەگەر هێندەی یەك دەنکە هەرزنت غیرەت هەبایە دەبوو خۆت هەڵواسی.

فرمێسکم وەك زریانی دەریایە لە چاوان هاتبوونە خوارێ. دەردو ئازاری گیانپرووکێنی نێو دڵ و دەروونم وایان چنگ لە هەناوم دەدا لەپەل و پۆیان کردبووم و هێزو توانایان لێ بڕیبووم. تەواوی هەموو لەشم لە تووڕەییاندا دەلەرزی، ئیدی دەو دنیا بێ بەزەییە تەنگەبەرەیدا خۆم تاك و تەنیا و بێ پەنا دەهاتە بەرچاوان. ئیدی هیچ پاڵپشتێکم دەژیاندا نەمابوو، تەنانەت رووی چوونەوە ماڵێ بابیشم نەبوو، هەموو نەخشەکانی ژیانی ئایندەشم ببوونە بلقی سەر ئاو، ئەو هەمووهیواو ئاوات و حەزو ئارەزووانەم هەمووی ناکام بوون. دەماوەی ئەو دووساڵ و نیوەی هاوسەریەتیەم دەگەڵ محەمەدیدا هەموو هەوڵ و

تەقەللام تەنیا ئەوە بوو ژیانێکی گەرمووگوڕو پڕ لــە خۆشەویــستی هاوبــەش پێکــەوەنێم کەچی چیم بەنسیب بوو و چیم بۆ دەرچوو.

ئەگەر بابە گەورە دەستی دەوکارەی وەرنەدابایە و یان بابم ئیختیاری خـۆی دەدەسـتی وی نەنابایە من ئێستا تووشی ئەو هەموو ئێش و ئازار و دەردو مەینەتیانە نەدەبووم. پاڵم بە دیواریەوە دا و بەلەرزە لەرزەوە لەسەر عەردی دانیشتم، حەزم دەکرد بەهـەموو هێـزو توانای خۆم کە هەمە هاوارکەم وهەرچی ناگوترێ دەو دنیایەیدا بـەو پیـاوە بـێ سـۆز و بەزەییەی بڵێم بەڵام سوودی چبوو؟ ئیدی تازە من ژنێکی پێشینەداری بـەدناو بـووم کـە چوار مانگ و نیوم زیندانی دەپەروەندەیدا بوو. هەر چاوەڕێی دەرفەتێکیش بووم بیکوژم.

* * *

رەها بێدەنگ بوو لە نارەحەتیان پشووی سـوار ببوو و بەگرانی هەناسەی هەڵدەکێـشا. پەرداغە ئاوەکەی سەر مێزەکەی هەڵگرت و یەکسەرە ویەك بـێ خواردیـەوە. دەموچـاوی سوور هەڵگەڕابوو وەك تای لێبێ، دڵۆپە ئارەقەی بەهەنیایەوە ریز ببوون بە پشتە دەستێی ئارەقەکەی سڕینەوە و رووی دەمی دە ڕەبابە خانمێوە کرد کـە لـە سـەرە خـۆی فرمێـسك بەردەدانەوە گوتی:

- بە یارمەتی خۆت ئەورۆ ئێوارێ نانێکی پوخـت و چێـشتێکی خۆشمـان بـۆ لێنـێن، چونکە دەمهەوێ سپێدە خانمێ بۆ ئێوارێ داوەت کەم. سوپاسی رەهام کرد و گوتم:

- بەداخەوە من هەر دەبێ بچمەوە ماڵێ تـا ڕەشنووسـەکانم بـۆ بـەیانی ئامادەکـەم. هەروەك بۆ خۆشت دەزانی ئاغـای میرزایـی هـەموو رۆژێ بـەیانیان نووسـینەکانی دەوێ بیانخوێنێتەوە تا زووتر بە چاپیان بگەیەنێ...

رەها هاتە نێو قسەکانمەوە و گوتی:

- قەیناکا، وازت لێ دێنین و سەعاتێکت مۆڵەت دەدەین بە تەنیا نووسـینەکانتان رێك خەنەوە و سەرو بەریان کەن، خۆ ئیدی بەهانەی رۆیشتنێشت نەما.

بەزەردەخەنێکی رازیبوونێ خۆمم بەیان کرد و ڕەبابە خانمیش لە جێی خۆیەوە هەستاو گوتی:

- ئەوە منیش دەچمە مەتبەخێ تا خەریکی نان و چێشتی ئێوارێ بم بەڵام تکا دەکەم ئەگەر ویستتان بەسەر هاتەکان دەست پێ بکەنەوە هێندێك بەرزتری بڵێن تا منیش گوێم لێبێ.

رەها پێکەنی وگوتی:

- نا ڕەبابە خانم، پێموایە ئەوڕۆ تا ئێرە بەس بێ. دەبێ هێندیکیشم ئاگا لـە سپێدە خانمێ بێ کە زۆر ماندوو بوو ون.

دە وەڵامی رەهایدا گوتم:

- تۆ لەمن گەڕێ، ئەگەر بۆ خۆتان ماندوو نەبوو ون ئێمە گـوێ لەبەسەرهاتەکەتان رادەگرین، چونکە تا زووە دەبێ داستانی ژیانەکەتان بۆ چاپکردنێ بدەمە گۆڤارێ.

- پەلە مەکە کات بـۆ چـاپکردنێ داستانی ئـێش و ئـازارو دەردو ڕەنجم زۆرە، مـن شەرمەزاری ئێوەشم کە بەگێڕانەوەی رۆژانی پڕ ڕەنج و غەمی خۆم ئێوەش نارەحەت دەکەم کە رەبابە خانمیش دڵنیابوو ، دها هیچیدی بەسەر هاتەکە ناگێڕێتەوە چووە مەتبەخێ تا هەرچی زووترە شامێ ئاماد ^کا.

من و رەهاش کەوتینە سەر بابەتی ئێرە و ئەوێ. نانی ئێوارێم دە کەشێکی پڕمیهرو خۆشەویستیدا خوارد و دوای شامێش ماڵ ئاواییم کرد و هاتمەوە ماڵێ.

## (٧)

بەیانیەکەی ڕۆژی دوایی نووسینەکانم دانە ئاغای میرزایی و بەپەلە بەرەو ماڵی ڕەهایەوە چووم.

ماوەی دە ڕۆژم مۆڵەت لە ئاغای میرزایی وەرگرت تا بەکاوە خۆو وردتریەکی زیاترەوە گوێ بدەمە قسەکانی ڕەهاو بەڵێنیشم دا تا دوای دە ڕۆژی دی تەواوی بەسەرهاتەکانی ڕەهای ڕادەست کەم و بۆ چاپیان ئامادەکەم. ئاغای میرزاییش قبوڵی کرد و منیش بەسەر و دڵێکی خۆشەوە بەرەو ماڵێ ڕەهایەوە چووم. ڕەبابە خانم و ڕەها هەردووکیان سەیریان بە دیتنێم دەو دەموسەعاتەی ڕۆژێداهات بەڵام بەمیهرەبانیەوە فەرمووی چوونە ژوورێیان. لێکردم بەسەرهاتی دە ڕۆژ مۆڵەتەکەمم بۆ گێڕانەوە. ڕەها هەر دوو دەستی پێك دادان و گوتی:

- کەواتە بەر لەوەی من دەست بەگێڕانەوێ بکەمەوە تۆ بچۆرەوە ماڵێ خۆتان و پیویستیەکانی خۆت هەرچی هەیە دەگەڵ خۆتدا بۆ ئێرە بێنە. چونکە پێم خۆشە ئەو چەند ڕۆژە ماوەکەمە، لە ماڵێ من، میوان بیت.

تۆزێکم لەو داوایەی ڕەهای خۆ کەناردا بەڵام سوور بوونێ ڕەهای وای لێکردم داوایەکەی بگرمەوە و قبوڵی بکەم. چوومەوە ماڵێ و هەندێ کەل و پەلی پێویستی تایبەتی خۆمم دەجانتایەکی بچکۆلە هاویشت و هاتمەوە ماڵێ ڕەهای.

کاتێ کە گەیمەوە ماڵێ ڕەهای نیوەڕۆ ببوو و بەبۆنێ ئەو چێشتەی دەنێو ماڵەکەیدا بڵاوببۆوە ئیشتیام بزووت.

دوای ئانخواردنێ ڕەبابە خانم بەخۆو بەسینییەکی دوو فنجان قاوە بەسەرەوە هاتەوە ولە تەکمانەوە دانیشت. دوای ئەوەی کەمن و ڕەها قاوەکانمان خواردەوە ڕەبابە خانم بەگاڵتەوە گوتی:

- باشە دەی دوای ئەوەی سینییەکەم بردەوە مەتبەخێ و هاتمەوە ئیدی هیچ ئیشێکی دیم نیە و ئامادەم گوێ لە پاشماوەی داستانی ژیانەکەتان بگرم.

پێش ئەوەی دەرفەتێش بەرەها خاتوونێ بدا قسێکی بکا لەجێی خۆی هەستاو سینییەکەی بردەوە مەتبەخێ و هەر دوای چەند دەقیقێکان هاتەوەو بەرەهای گوت:

- دەی من ئامادەم گوێ لە پاشماوەکەی بگرم

رەها بەمیهرەبانیەوە زەردەخەنەیەکی بەدەم رەبابە خانمێوە کرد و دەستی بە گێرانەوێ کردەوە.

❋ ❋ ❋

محەممەد بەزمانە چەور و شیرینەکەی ئاگری دەروونی کەتا دەهات زمانەی دەکێشاو بڵێسەی دەدایەوە دامراندەوە ئەو دەیگوت:

- بەو خودایەی قەسەم لەو ماوەیەی کە ئەتۆی تێدا دەزیندانێدا بووی شەو و رۆژ نازانم چەند جارانم خۆ ڕاناوە بێمە ئاسایش و خۆم بناسێنم بەڵام ترسام، دەمزانی کە ئەگەر خۆم بناسێنم و ددان بە هەموو شتێکیدا بنێم و هەموو شتەکان بڵێم بەلانی کەمەوە دەبێ چەندین ساڵێکان لەو دیو میلی دەرگای بەندیخانەیدا بمێنمەوە بەڵام ئەوانە کە دەئیشەکانی خۆیاندا لێزان و کارامەن زوو لە باری دەروونی تۆ گەیشتن کەبێ گوناهی و بەرهەڵدات هەردەکەن و ئەوەتا هەروەك دەبینی مەزەندە و بۆ چوونەکانم راست دەرچوون، بەڵام بەڵێنت دەدەمێ کە ئیدی هەر کار و ئیشێکی ئەتۆ پێت خۆش بێ ئەوەی بکەم و بێ دڵیەت نەکەم و پێ دەبەرپێی نەنێم و هەنگاوێ ناوێم.

ئەو رۆژە محەممەد هێندەی لەبەر هەڵ خوێندم تا وای لێ کردم چاو لە هەموو گوناهەکانی بپۆشم ولێشی ببوورم بەجۆرێکی واش کە پێچەوانەی بۆ چوونی دایك و بابم خوازیاری ژیان بەسەر بردنێ دەگەڵ محەممەدیدا بورمەوە. دوای ئەوە محەممەد لەو پێستەوە چووە پێستێکی دییەوە، خۆش رەوشت و پیاوێکی نموونەی ژیان و خۆشەویستی، ئیدی رێی چوونە ماڵێ بابی لێ نەدەگرتم.بۆ خۆشی هەر شەوێکی دەگەڵە مندا هاتە ماڵێ بابم و داوای بەخشین و لێبوردنێی لێ کردن و بەڵێنی دا لە مەودوا هەڵەکانی راست کاتەوە.

زۆربەی رۆژان پێشنیاری چوونە ماڵێ بابی بۆ دەکردم تا دیدارێك تازەکەمەوە. مەسەلەی کەوتنە زیندانێشم لە تەواوی خزم و کەس و ناسیاوانیش شاردبۆوەو حەزم نەدەکرد دوای بەسەرچوونی ئەو رۆژە تاڵانە بە وەبیر هێنانەوێیان بەخۆ نازینەکانم برینداركەمەوە، رەنگە هەر پێشم شەرم بووبێ کە ئەوان پەی بە چۆنیەتی محەممەدیش بەرن. بەبیانووی زۆر شتانە وە داوای

لێبوردنی نەچوونی ئەو چەند مانگانەم بۆ سەرداوەت و سەردان و میوانیان دێنایەوە چەند مانگێك بوو کە بەڕاستی خۆم بەبەختەوەر دەزانی، بابم هەمیشە چاوێکی هەر دە محەمەدیەوە بوو نەکا کەتنێکی دی بکاتەوە. دوای ئەوەش کە محەمەد هۆی قاچاغ فرۆشیەکەی بەمل دەست کورتی و نەدارییەدا هێنا بابم بە هەموو جۆرێك، تەنانەت لە کڕینی پێویستیەکانی نێو ماڵێشدا هاریکاری دەکردین تا بیانووی محەمەدی لەکاری بێ جێ ببڕێ، بەڵام وەك بڵێی بەختەوەری هەمیشە لەمن سڵ بکاتەوەو هەڵێ. بەختەوەرییەکەم تەنیا هەمان ئەوەندە ماوە کورتەی ئەو چەند مانگانەی دوای هاتنەوێم بوو لە زیندانێ.چەند رۆژێك بوو بۆنی هەر شتێکم دەکرد دڵم تێکەڵ دەهات و هێڵنجم دەهاتێ هەرکە خواردنێکیشم دەدیت یەکسەر بە دیتنی خواردنەکەی تێك دەچووم. مەسەلەکەم بۆ دایکم باس کردو هۆیەکەیم لێ پرسی. دایکم بە خۆشحاڵیەوە ماچی کردم و مژدەی دامێ کە بەو زووانە دەبیە دایك و منداڵت بەزگی کەوتووە. دەپێستی خۆمدا نەدەحەجمیم، بڕیاریشم دا دەگەڵ دایکمدا بچمە لای دکتۆر تا دڵنیابم، ئەوجا هەواڵی زگەکەم بە محەمەدی بڵێم. دکتۆر چەند تاقیکارییەکی جۆراوجۆری بۆ نووسیم و گوتی:

- من لەبەر دڵنیابیە سەلامەتییە ئێوە چەند تاقیکارییەکی جۆراو جۆرم نووسیوە. بەیارمەتی دوای ئەنجامی تاقیکارییەکان، وەڵامەکەیانم بۆ بێننەوە.

بەیانی رۆژی دوایی چوومەوە ماڵێ بابم تا دەگەڵ دایکمدا بچینە تاقیگا بۆ ئەنجامدانی تاقیکارییەکان. چونکە دکتۆر کەدەبێ تاقیکاری سەرجێییبۆ بکرێ، دەمزانی تا سەعاتێکی دیکە دەردەکەوێ کە هۆی ئەو دڵ تێك هەڵاتنەم چیە؟ دەگەڵ دایکمدا بەرەو تاقیگاوە دەچووم کە هەر بەرێوە لەپڕ هەستم کرد ئەو پیاوەی چووە موغازەکەوە محەمەدە. دایکم ئاگاداری محەمەدی نەبوو، کاتێ کە بە بەردەمی موغازەکەدا تێپەڕین و هێندێك دوور کەوتینەوە بەبیانووی تەماشاکردنێ بلووزێکیەوە لە دایکم جیا بوومەوە و بەرەو لای موغازەکەوە چوومەوە ناوڕێکم دایەوە، لەو دیوجامخانەکەوە زۆر بەئاسانیم محەمەد لێ دیاربوو. محەمەد بلوزێکی ژنانەی زۆر شیك و جوانی بە دەستەوە بوو و دەگەڵ بلووز فرۆشەکەیدا دەدوا. دیاربوو بلووزەکەی پەسەندکردبوو چونکە فرۆشیارەکە بلووزەکەی پێچایەوە و محەمەدیش دەستی دەگیرفانێ نا تا پارەی داتێ. دەو ساتەیدا دەپێستی خۆمدا نەدەحەجمیم پێموابوو محەمەد بەنیازە تا بەو بلووزەی غافڵ گیرم کا. بۆیە بەبێ ئەوەی خۆم لە محەمەدی ئاشکراکەم بەسەرودڵێکی خۆش و شادییەوە دەگەڵ دایکمدا بەرەو تاقیگاوە چووم.

ی چەندین تاقیمانەی یەك بەدوای یەكدا من ودایكم لە چاوەڕوانی وەڵامی تاقیمانەكاندا
ـین تا لە دواییدا و دوای چەندین سەعات چاوەڕوانی وەڵامی تاقیمانـەكان ئامـادەبوون و بەدەنگێكی بەرزەوە ناویان خوێندمەوە. وەڵامەكانم وەرگرتنەوە، وەڵامەكە ئـەرێی بـوو و مـن دڵنیابووم كە بەزوویی دەبمە دایك. بە پێشنیاری دایكم نیوەڕۆیەش لە ماڵێ وان بووم و نانیـشم هەر لەوێ خوارد و دوای نانخواردنیش بەخەیاڵی ئـەوەی كـە محەمـەد لەسـەر ئیـشێیە چـوومە موغازەكەی تا هەواڵی زگەكەمی بدەمێ و خۆشحاڵی كەم. بەڵام بە پێچەوانەی مەزەندەی من محەممەد لە موغازەی نەبوو. لە كرێكارێكی كە مانگێك بـوو دە موغازەكەیـدا ئـیش دەكـرد و شاگردی محەممەدی بوو پرسیم:

- ئاغا رەزا، نازانی محەممەد چۆتە كوێ؟

ئاغا رەزا بیرێكی كردەوە و گوتی:

- نا ئەو چەندانە ئاغا زۆر نایەنە موغازەی، هـەروا چـەند سـەعاتێكان دێـن و سـەرێكی خواردەكەنەوە و دەڕۆنەوە بەڵام بەمنیش ناڵێن لـە كـوێن و دەچـنە كـوێ. ئاغـا رەزا بیرێكـی كردەوە بەڵام لە پڕ شتێكی وەبیرهاتەوە و درێژەی دایەوە:

- راستیەكەی، هەندێ جاران دەڵێن ئەگەر كارێكم پێیان بوو ئەوە لە ماڵێن.

لە قسەكانی هەوت مام بەڵام هیچم بەسەر خۆم نەهێنا و خودا حافیزیم لێكرد و بەرەو ماڵ بوومەوە.

دڵە خوتەیەكی ناخۆشم كەوتێ.دڵم گەواهییە هەواڵێكی ناخۆشی دەدا. بەدەم رێوە كەوتمەوە بیرو خەیاڵی قسەو ئامۆژگارییەكانی دایكم و دەبیرو خەیاڵانەوە چووم. دەدڵـی خۆمـدا نەخـشە دەكێشا كە لێرە بە دواوە چۆناو چۆن دەگەڵ محەممەدیدا رەفتاركەم تاكوانووی ماڵەكەم هەر گەرم و گەرمتریش بێ.بیرم دەكردەوە چۆناو چۆنی هەواڵی بوونـە باوكایەتییەكـەی بـدەمی، لـەوەش كەنیازی بوو غافڵگیرم كا پێكەنینم هات چونكە بۆ خۆشی نەیدەزانی كـەمن هـەواڵێكم پێیـە ئەوی پێ غافڵگیر دەكەم.

دەحاڵێكدا كەمن نەخشەی غافڵگیریە محەممەدیم دەكێـشا كلـیلم دەقفڵـی دەركێـدا بـادا و چوومە ژوورێ. چاوەكانم لە حەژمەتان زەق زەق بوونەوە، بـاوەڕم بـەو دیمەنـەی كـە بەرامبـەر چاوەكانم بوو نە دەكرد. محەممەد و موحتەرەم خانم هەر دووك پێكەوە لەسەر لێوی حەوزێ بەدەم یەكەوە دەتریقانەوە.

هەر کە چوومەوە ژووری ئەو بلووزەی کە هەر ئەو رۆژە محەممەد کڕیبووی ناسیمەوە. بلووزەکە لەبەر موحتەرەمیّ بوو، بەڵیّ موحتەرەم بلووزەکەی لەبەرکرد بوو و بە دوورییە نیومەتری لە محەممەدیەوە دوورتر لەسەر لیّوی حەوزیّ دانیشتبوو.

هەر دووکیان، کە منیان دیت زەردە خەنەیان لەسەر لیّوان وشك بوو و چاویان بەمنەوە ئەوق ما.

راوەستابووم و شیّتانە سەیرم دەکردن وەك بڵیّی هیّشتا فیّری قسان نەبووبم هیچ قسەیەکم لەبیر نەمابوو، محەممەد هەلی لەو بیّدەنگییەی من قۆستەوەو بە خۆ داهاتەو بە دەنگیّکی قەرزدار بارکردنەوانەوە پرسی:

- ئەوە تا ئیّستا لە کویّ بووی؟ باشە نابیّ بزانم تۆ لە کویّ وکەی لە ماڵ دەچییە دەریّ و کەی دیّیەوە؟ هاتمەوە بزانم هیچت بۆ ماڵیّ ناویّ کەچی ئەوە دوو سەعاتە چاوەڕیّم، ئەوە چ نەبووە ژیان هەر کاتیّکی...

هەنگاویّك چوومە پیّشیّ و قسەکەیم بڕی و لەبن لیّوانەوە گرماندم:

-ئەوە خۆت گیّلی، ئەوە بۆ خۆشت دەزانی کە هەرچی پیّویستیەکی ماڵیّمانە ئەوە بابم دابینی دەکات و بۆمان دیّنیّتەوە و ئەوەی دەشمیّنیّتەوە ئەوە بۆ خۆم دەیکرم، ئەدی پیّم نالّیی بۆ دەو ناوەختە رۆژەیدا هاتوویەوە ماڵیّ و بەقسەی خۆشت دوو سەعات چاوەڕیّمی؟ ئەوە ئیّستا دەزانم بۆ هیّندە بە ئەمەك و هەق شوناسی کەسوکاری منی و هەموو رۆژیّم هاندەدەی بچمە ویّ؟ دەمەقالّیە من و محەممەدی هەلکشا. موحتەرەم لەلایەکیەوە راوەستابوو و زەردە خەنەیەکی بیّ شەرمانەی بەلالیّوانەوە بوو. لە پڕ محەممەد زللەیەکی توندی لەسەر و چاوی دام و هاواری کرد:

- خۆت هەرچی هەی، ئەوە هەی، پیّتوایە هەموو کەسیّکیش وەك تۆن، ئەوە شەرمیّ ناکەی تۆمەتیّ وەپاڵ موحتەرەم خانمیّ وا ئەجیب دەدەی؟ تەریق نابیەوە ئەوەی شایانی خۆت و کەسوکارەکەتە بەو ژنە بەریّزەی دەڵیّی.

موحتەرەمیش لەو سەری حەساریّوە گوتی:

- دەك دەستت نەڕزیّ محەممەد اغا، ئەگەر ناتوانی زاری ژنەکەت بگری هەیە کە دەتوانیّ دەمی بگریّت و ئەو زارە پیسەشی پڕکات لە خۆڵ.

- ئەوەکیّیە دەیهەویّ زاری من بگریّ ها؟ ناکا تۆیەکی کەپیاوی غەوارە دابینت دەکەن؟

موحتەرەم رووی لە محەممەدی کرد و گرماندی:

- گوێت لێیە چ دەڵێ یانە نا؟ ئیدی من چیدی توانای ئەو سـووکایەتیانەیم نیـە. محەمـەد بەرقەوە بەرەو لای منەوە هات و پرسی:

- مەبەستت لەو قسان چیە؟ بێدەنگ دەبی یان بۆ خۆم بتخنکێنم و بێدەنگت کەم؟

بەلاقرتێوە پێکەنیم و گوتم:

- یانی ئێوە هەر دووکتان بەدووان دەمانای قسـەکانی من ناگەن، دەمزانی کـەودەنن بـەڵام تائەو ئەندازەیەش نا، بابزانم ئەو بلووزەی دەبەریەتی کێ بـە دیـاری بـۆی هێنـاوە؟ هاچـبوو؟ بێدەنگ بووی؟ رەنگت پەڕی؟ باشە دەی قەیناکا تۆ ئەگەر ناوێری بە بەرزیەوە بیڵێی ئەوە مـن خۆم یارمەتیت دەدەم، بەڵێ ئاغا، ئەورۆ بۆ خۆم ئاگام لە کڕینی ئەو بلـووزەی بـوو و بەچـاوی خۆم دیتم، خۆش غیرەت، پیاوێکی هێندە بە غیرەتی دیارە لەوانەنی؟

لە پڕ محەمەد پەلاماری دام و چنگی لەسەرو پرچ وقژم گیرکردو ڕاکێش ڕاکێش رایکێـشامە ژووریٚ و گرماندی:

- وەرە تا پێت بڵێم تۆمەتبارکردن یانی چی؟

محەمەد پاڵی دامە دیوی ژووریٚ و دەرگاکەی لە پشتەوە داخست و بەمـست و پێلـەقانی دا گرتم. بە هەموو هێزیەوە و زۆر بەتوندی لێی دەدام و جنێوی دەگوتن، موحتـەرەمیش هـاتبووە پشت دەرکەی و بانگی وی دەکرد و بەنازەوە دەیگوت:

- وازی لێ بێنن محەمەد اغا، ناماقوڵی کرد، توبی ئەو خودایەی بەسە، حـەیف نیـە ئێـوە خوێنی خۆتان لە پێناو ئەو بوونەوەرە بێ نرخ و بەهایەیدا پیس دەکەن.

هەروا کەلێم دەدرا جنێوم بە محەمەد و موحتەرەمێ دەدا، جنێوەکـانم ئەوەنـدەی دیکـەیان محەمەد لە لێدانێم شێلگیرتر دەکرد. دوای ئەوەش کەلە لێدانێ من ماندوو و وەڕەز بوو بـەجێی هێشتم و چووە ژوورەکەی موحتەرەمێ و تاشەو درەنگانێك هەر لەوێ مایەوە و نانی ئێوارێشی هەر دەگەڵ ئەو و منداڵەکانیدا خوارد.

بەئەنقەست بەدەنگی بەرزەوەی دەگەڵ موحتەرەم ومنداڵەکانیدا قسە دەکردن و پێدەکـەنی، موحتەرەمیش هەروەتر بەدەنگی بەرزەوە پێدەکەنی و نازی دەکردن. بڕیـارم دا بـچمەوە ماڵـێ بابم و بەیەکجاری واز لەو ژیانە بێنم دەگەڵە ویدا بەڵام نەمتوانی، ئاخر خۆبێجگـە لـە منـیش یەکێکی دیکەش هەبوو کە پەیوەندی و وابەستەی ئەو ماڵەو ئەو پیاوەی بوو.

ئەوشەو و رۆژانەی دی زۆر بەپەلە و بەخێرایی دەڕۆیشتن و تێدەپـەڕین بـەڵام محەمـەد هـەر لەسەر هەڵس و کەوت و رەفتارە دزێو و کرێتەکانی خۆی بەردەوام بوو و ناکۆکییەکانیشمان رۆژ

بە ڕۆژ تا دەهات هەر زیادی دەکرد. وردە وردە محەممەد وا بێ شەرم و چەقاوەسوو بوو کە بەرۆژ و بەشەو چەند سەعاتێکانی لە ژووری موحتەرەمێ بەسەر دەبرد و هەرچی پێویست بایە بۆی دەکڕی. ڕۆژانە کاتێ کە نیازی چوونە دەرێی هەبایە بەدەنگێکی بەرزەوە دەیگوت:

- ڕەها، کە ئیشەکانت تەواو بوون بزانە داخوا موحتەرەم خانم هیچ ئیشێکی نیە یارمەتی بدەی. ئەوجا بە دەنگێکی بە ئەدەبانەوە ڕووی دەموحتەرەمێ دەکردەوە ودەیگوت:

- موحتەرەم خانم من وادەچمە سەر ئیشێ ئەگەر ئیشێکتان بوو منداڵێکی بنێرن تا پێم بڵێن.

موحتەرەمیش بەنازو بازێکەوە دەهاتە حەسارێ و دەیگوت:

دەستتان نەرزێ و هەر خۆش بن، پێموانیە هیچمان بوێ بەڵام ئەگەر شتێکیشمان ویست دڵنیابن نارەحەتتان هەر دەکەین و ئەو زەحمەتەتان وە بەردەدەین. محەممەدیش بە میهرەبانیەوە وەڵامی دەدایەوە.

- تکا دەکەم، ئەو قسانە چین؟ بەخۆشحاڵیەوە ئەوەی لە دەستم بێ بۆتان ئەنجام دەدەم شەو و ڕۆژەکان دەهاتن و دەچوون و تێدەپەڕین من و محەممەد یەك وشەشمان قسە دەگەڵ یەکتریدا نەدەکرد. وردە وردە وەك بێگانەیەکم دەهاتە بەرچاو و حەزم دەکرد نەیبینم و نەگوێشم لە دەنگی بێ. کاتێ کە محەممەد لە ماڵ نەدەبوو موحتەرەم قسەی بێ جێ و ناسکی پێ دەگوتم و ئازاری دەدام. بڕیارم دا بۆ ئەوەی لووتی ئەو ژنە بێ شەرمەی لە عەردی دەم محەممەدی زیاتر ئومێدەوار و دڵی زۆرتر بە ژیان خۆش کەم ئەوەش چۆن بکەم، هەردەبوو هەواڵی بوونە باوکیەتیەی بدەمێ.

تەواوی ڕەفتار و قسەکانی ئەو دووانەم دەدیتن و دەبیستن بەڵام بەخۆمم دەگوت:

- قەیناکا دواییەکەی ڕۆژێك محەممەد پەی بە هەڵەکانی خۆی هەردەباو دەگەڕێتەوە ناو ماڵ و ژیانی خۆی. ڕاستیەکەی گوناهی خۆمە کەپێم نەگوتووە زگم هەیە تا بە ماڵ و حاڵ و ژیانی خۆی دڵخۆش و ئومێدەوارکەم بەڵام لێرە بەدواوە دەزانم چدەکەم تا ئەو ژنەی لەنێو ژیانەکەی خۆم دەرێنم و دووری خەمەوە.

شەوێ کە گوێم لە دەنگی دەرکی حەسارێ بوو بە پەلە بەرەو لای حەسارێوەم ڕاکرد.

محەممەد بە دوو هەنگڵی پڕ لەمیوەوە هاتە حەسارێ و هەر بەپێ دەرگەکەی بەدوای خۆیدا پێوەدایەوە. بە دەنگێکی کزەڵەی لەرزۆکەوە بانگم کرد:

- محەممەد وەرەوە ئیشم پێتە.

محەممەد بەرەو لای ژووریّ موحتەرەمیەوە چـوو و زەرفـە میوەکـانی لەبـەر دەرکـیّ ژووریّ موحتەرەمی لەسەر عەردی دانان و بەرەو لای من هاتەوە و زۆر لا لووتانە سەیریّکی کردمیّ و پرسی:

- چیە، چ ئیشیّکت هەیە؟

- بە دەنگیّکی پڕ لە پاڕانەوەوە گوتم:

- لیّرە ناکریّ قسان بکەین، وەرە بچینە ژووریّ ئیشم پیّتە.

محەممەد بەبیّ حەوسەڵەییەکەوە کەوتە دوام و کاتیّکیش کە چووینە ژووریّ گوتی:

- زوو قسەکەت بکە دەچم نانی دەخۆم.

- بەپاڕانەوەوە گوتم:

محەممەد بۆ لەقە لەو ژیانەمان دەدەی؟ بۆ بە دەستی خۆت ئەو ژیانەمان دەئـاگری داویـی و دەیسووتیّنی؟ بۆ دەبیّ بچیە ماڵی ژنیّکی بیّگانەو لەویّ نانی بخۆی، وەرە بالیّرە بگوازینەوە و لیّرە بڕۆین، تۆ خۆت بەجوانی سەیری ژیانمان کە خوا هەڵناگریّ ئەوە ژیان نیە من تاك و تـەنیا دانیشم و هەر چاو لە ڕیّی تۆبم و تۆش دەگەڵ بیّوەژنیّکی تەڵاق دراو دا کاکە و براڵـەی بکـەی ئەوی بەسەرمندا بشکیّنیەوە! محەممەد بە تووڕەییەوە گوتی:

- کوێرایی لە چاوت دایە، ئەگەر تۆش منداڵت بووبایە ئیّستا دەبوو یەك دوو منـداڵت بـە دەورو بەراندا هەڵبەزن ودابەزن، نەك ئاوا بە تاقی تەنیّ لە کـونجیّکی ژووریّ وەك کوندەبـەبۆی هەڵنیشی, ڕاوەستە با دوا قسەمت پیّ بڵیّم، چونکە تۆ منداڵت نابیّ بۆیە بەنیازم موحتەرەمیّ بەسیغە مارەکەمەوە، ڕەنگە هەر یەکجاریشی مارەکەم خەڵکی چـووزانن، هـەر تـۆ دەزانـی، ئەگەر تۆش دەتەویّ تەڵاقت نەدەم دەبیّ بابت موغازەکە بخاتە سـەرمن و بـە نـاوی منـی کـا تیّگەیشتی و گویت لیّیە! هەر ئەوەیە کە گوتم، ئەگەر بابت ژیانی کچەکەی خـۆی دەویّ دەبـیّ موغازەکەیم بەناوکا بۆ تۆ پیّتوابوو مـن لەبـەر چـاوی جـوان و بـرۆی ڕەشـی تـۆ بـوو هاتمـە خوازبیّنیت و تۆم هیّنا. نەخیّر خاتوون، خەونت دیوە خیّرە ئیشاڵڵا، من هەر لە هەوەڵیّوە نیازم وابووە بابت موغازەکە بەناوی منەوەکات، ئیّـستاش درەنگ نەبووە بۆ ئەوەی تەڵاقت نەدەم بە بابەگیانت بڵیّ محەممەد گوتوویەتی ئەگەر نایهەویّ مۆری تەڵاقیّ بەنیّوچەوانی کچەکەیەوە بنریّ با موغازەکەی بەناوی منەوە بکات.

سەرم سووڕا تەواوی دنیایەم لە پیّش چاوان تاریك بوو، قاچەکانم شل بوونەوە، وەك نیوە بیّ هۆشیەکی بەربوومەوە سەرعەردی، توانای هیچ جووڵەیەکم نەما، وام هەست دەکرد پشتم کووڕ

بۆتەوە و چەمیومەوە. ڕاست وەك ئەو دارەم لیٚ هاتبوو کـە بـەبای بـەهێزو تونـدی زەمانـەی لەنێوەڕاستێوە دوو لەت بووە. محەممەد کە ئاوای دیتم غیرەتی زیاتر بزووت و گوتی:

- هیچ پیاوێك ئامادە نیە تا کۆتایی تەمەنی دەگەڵ ژنێکی نەزۆکدا بژی. ئەگەر ئەوەی بە بابت بڵێی دڵنیام کە قبوڵی هەر دەکـا، لەبـەر ئـەوەی موغازەیـەك لـە بەرامبـەر تەمـەنێك حەسرەتی منداڵ نەبوونێدا یەکجار زۆر کەم و هیچە.

هێزو توانایەکم دە ئەژنۆیەکاغدا هەست کردن و لە جێوە ڕاست بوومەوە و گوتم:

- ئـەو تـیرەت بەچـەپەی هاویـشت چـونکە مـن زگـم هەیـە و ئاوسـم، زگەکـەم سـێ مانگانەیەوهەروا بەو زووانەش دەبیە خاوەن منداڵ

محەممەد بە بیستنیٚ ئەو قسەی داچڵەکی و هەنگاوێك هاتە پێشیٚ و گوتی:

- درۆ دەکەی، دەزانم کە درۆ دەکەی، خێراکە دەی زوو بڵیٚ کـە درۆت کـردووە. بـۆ سـاتە وەختێکیم خۆ بەسەر کەوتوو زانی پێکەنینێکی تەوساویم کرد و گوتم:

- نا، ڕاستە، دکتۆر و تاقیگا ئەوە دەسەلمێنن.

محەممەد تاوێك ڕاوەستاو دەبیر وخەیاڵەوە چوو، چەند دەقیقەیەکی نەبرد کەوتەوە سەر خـۆی و گوتی:

- کەواتە واباشترە کە باش گویٚ بکەیتەوە و باش گویٚ بدەیەی، ئەگـەر تـۆش بتـەویٚ وەك دایکت یەك دوو دەستە کچان لێرە ریزکەی دەبیٚ بلـێم ئـەوە نـاخوا، باشـتروایە بزانـی ئەگـەر منداڵەکە کچ بیٚ دەبیٚ هەر لە نەخۆشخانەوە یەکسەر بچیەوە ماڵـیٚ بابـت، تێگەیـشتی چـیم گوت؟

محەممەد لە ژووریٚ چووە دەریٚ و منی تێماو و پەرێشانیشی تەنیا بەجیٚ هێشتەوە.

منێکی کە دەوکات و ساتانەدا پێویستیم بەو و دڵدانەوە و دەست بەسەر داهێنانی ئەو بوو بەتەنیای جیٚ هێشتمەوە و چۆوە سەرو سۆراغیٚ موحتەرەم و منداڵەکانی. سەرم بەرز کردەوە و دەستەکانم بەرەو ئاسمان هەڵبرین و ناڵاندم:

- خوایە بۆ دەبیٚ بەشی من لە ژیاندا هەر ئەوە بیٚ؟ بۆ هەردەبوو هاوسەریٚ پیاوێکی ئـاوا چەپەڵ و بیٚ بەزەیی بم؟ هەرگیز لە بابە گەورەی نابوورم کە بووە هۆی تەواوی ئەو بەدبـەختی و چارە ڕەشیانەم، هەر ئەو بوو منی ئاوا هاویشتە ئەو دۆزەخەوە و دەوێیدا دیل کردم. بـەخودای هەتا بمێنم هەر نەفرەتی لێدەکەم، خودایە من لەو دەرد و ڕەنج و ئێش و ئازارەی رزگارکـە یـا

محەممەدی بێنەوە سەر هۆش و گۆشی خۆی، ئەگەر ئەوانەش ناکەی ئەوە من بکوژە و بحەسێنەوە.

ڕۆژ و هەفتەکان دەهاتن و تێدەپەڕین و ژیانی منیش هەر هەمان چارە ڕەشیەکەی جاران بوو. ڕۆژانە بەتەنیایی خۆمەوە، هەر قسەکانی محەممەدیم دووبارە دەکردنەوە و دڵخۆشی خۆم دەدایەوە کە محەممەد هەر ویستوویەتی بمترسێنێ، ئەو هەر چەند چەپەڵیش بێ دەست لە جگەرگۆشەکەی خۆی هەر هەڵناگرێ، دڵنیام هەرکاتێ کەمنداڵەکەی ببینێ سۆز و میهرەبانیە بابایەتیەی لە ئەنجامیئەو کارانەی هەر دەگێڕێتەوە.

وردە وردە بە ڕەفتارە سارد و سڕە بێ گیانەکانی بەرامبەر بە خودی خۆم تێگەیشتم کە هەرچی گوتوویەتی ڕاستە و ئەو منی هەر بۆ ئەوە خواستووە تا بابم موغازەکەی بەناوکا نەك لەبەر خودی خۆم و ئەو عیشقەی لەسەرەتاوە دەمی تێ وەردەدا.

ئیدی بە یەکجاری بۆم دەکەوت و لەلام ڕوون بۆوە کەمنی تەنیا و تەنیا هەر لەبەر خاتری سامان و دەستمایەی بابم بووە و منی وەك پردێك بۆ گەیشتن بە ئامانجە دزێو و کرێت و پیسەکانی ڕەبەر چاو گرتووە.

* * *

چەند مانگێکی دیش چوون زگەکەم بووە شەش مانگانە، محەممەد کەمێکی موحتەرەم لە بیر بردبۆوە و کەمتری خۆ تێدەگەیاند و منیش لە دڵەوە سوپاسی خودام دەکرد کە لە خەیالی موحتەرەمێ هاتۆتە دەرێ. دڵخۆشی خۆشم هەروا دەدایەوە کە محەممەد هەر چییەکی گوتووە تەنیا جەفەنگ بووە و مەبەستی دیکەی دەقسەکانیدا نەبووە.

بە پێچەوانەی تەواوی ژنە دوو گیانەکان کە مێردەکانیان هەمیشە ئاگاداری خواردن و جۆری خواردنەکانیانن محەممەد هیچ ئاگایەکی لەمن نەبوو و خۆی تێ نە دەگەیاندم، شەو و ڕۆژم ببووە غەم و خەفەت خواردن و ترسی لە دایکبوونی منداڵەکە، بەدڵ ڕازو نیازم دەگەڵ خودایدا دەکرد و هەرچیەکم بە خەیاڵدا هاتبایە نەزرم دەکرد هەر هێندە منداڵەکەم کوڕ بێ، تا محەممەد نەبێتە هۆی ئێش و ئازارو دەردەسەریم. کەسوکارەکەم کە ئاگایان لە هیچ نەبوو بە دوو گیانیەکەم زۆر شاد و خۆشحاڵ بوون و دایکم سەرگەرمی ئامادەکردنێ جل و بەرگی منداڵەکەی بوو.

دایکم زۆر بە نیگەرانییەوەی سەیر دەکردم و لە کزو لاوازی و ڕەنگە پەریوەکەی مـن زۆر پەشۆکاو بوو. ئەو جارەهای جار لێی دەپرسیم:

- ڕەها دەگەڵ محەممەدیتدا هیچ گرفتێك هەیە؟

لە حالێکدا کە وام پێشان دەدا لە مەبەستەکەی ناگەم دەمپرسی:

- نا، مەگەر چۆن؟ هیچ بووە کە ئەو خەیاڵەت کردۆتەوە؟

دایکم دەوەڵامێمدا گوتی:

- ئەوە چەندین مانگت بەسەر دوو گیانییەدا تێدەپەڕێ، هەر جارێکی کە دەتبینم لە جاری پێشتر ڕەنگ پەڕیوو داکەوتووتری؟ ناکا خواردنەکانت باش نەبن؟

هاتمە نێو قسـەکانی دایکمەوە و بە ڕواڵەتێکی شادەوە گوتم:

- نا، محەممەد ئێستا زۆر لە جارانم زیـاتر بـە پەرۆشـەوەیە و زۆری ئاگـا لێمـە، بـەردەوام خواردنی چـاك و خـۆراکیم بـۆ دێنێتـەوە، زۆرم گرنگـی بـە خواردنـێ دەدات بـەڵام نـاتوانم تۆزقاڵێکیشیان لێ بخۆم. هەر کە چاوم بە خواردنێ کەوت دڵم تێکەڵ دێ، پێموایە ڕەنگ پەڕین و کزو نەماوییەکەشم هەر ئی هێندێ بێ.

دایکم کە بەقسـەکانی باوەڕ نەکرد بوو بە پێداگرتن و سوور بـوونێکی زۆرەوە بردمیـە لای دکتۆرو باسەکەی دەگەڵ تاوتوێ کرد. دکتۆر دوای پشکنینێم گوتی:

- خاتوون ئەوە تۆ چیت لە خۆت و ئەو کۆرپەیەت کردووە؟ وەك مـن لـەدوای پـشکنینتان بۆم دەرکەوتووە بەو کێش دابەزینەی کەتووشتان بووە منداڵەکە لە ئەنـدازەی سروشـتی خـۆی بچووکترە و ئەگەر ئەم بارو دۆخەش هەروا بڕوا لەوانەیە منداڵەکـەت لەباربـچێ و خـۆ ئەگـەر لەباریش نەچوو لەوانەیە کەم ئەندام بێ. ئەگەر دەتەوێ خۆت و کۆرپەکەت سەلامەت بن ئـەوە دەبێ خۆت دامەزرێنیەوەو لە هەر دەمارگرژیەکی هەیە خۆت بپارێزی...

دکتۆر هەڵوێستەیەکی کردو ئەوجا دەستی پێکردەوە:

- دەتوانم پرسیارێکی تایبەتیت لێ بکەم؟

بەسەیرێکەوە تەماشایەکی دکتۆریم کرد و وەڵامم دایەوە:

- بەڵێ، تکا دەکەم فەرموون.

دکتۆر بە وردی چاوێکی بەڕوومدا خشاندو پرسی:

- ئێوە و هاوسەرەکەتان هیچ تەنگوچەڵەمە و گرفتێکتان پێکەوە هەیە؟

چاوێکم لە دایکم کرد، لەلای ئەو هەرگیز نەدەکرا ڕاستیە بڵێم بە توورەییەکەوە گوتم:

- نا، نا هەرگیز ئەو قسانە چین دەیانکەی؟ مێردەکەم هەموو هەوڵ و تەقەللای خۆی تەرخان کردووە هەر بۆ ئەوەی کونجێکی ئارام و ئاسوودەم بۆ بسازێنێ. دکتۆر بەناباوەڕییەوە سەیرێکی کردمەوە بە دەنگێکی تایبەتی ئەو تۆ گوماناوی بەقسەکانی من گوتی:

- بەڵام واپێناچێ، تۆ بۆ خۆت هەوڵدە تا لە هەموو دەمار گرژییەك بەدوور بیت و خۆتان بۆ خۆتان ئارامی و هێوری و خوێن ساردیتان بپارێزن.

ئەوجا رووی لە دایکم کردو گوتی:

- بە بۆچوونی من وا باشترە ئێوە بۆ خۆتان ئەو چەند رۆژە ناسکانە ئاگاتان لەکچەکەتان بێت و چاوەدێرییەی بکەن.

دایکم سەرنجە میهرەبانەکەی تێوە بڕیم وگوتی:

- جا ئەگەر خۆی رازی بێ من لە خودام دەوێ.

زەردەخەنەیەکی خۆشیە سەر لێوەکانی دکتۆری داگرت و رووی لەمن کردو گوتی:

- ئەگەر بە پەرۆشی تەندروستی خۆی و منداڵەکەیەوە بێ ئەوا قبوڵی دەکا.

دوای خودا حافیزی لای دکتۆر هاتمە دەرێ. بۆ خۆم کەمم بیرو خەیاڵ هەبوون دکتۆر چەندان هێندەی دیشی هاویشتنە سەرێ.

دایکم داوای لێ کردم تا ئەو چەند مانگانەی دووگیانیەی ماویشمە بچمەوە ماڵی ئەوان تا بۆ خۆی لە نزیکەوە چاوی لێم بێت و ئاگای لە خواردن و هێوریە بیرو خەیاڵەکانمەوە بێت و یارمەتیم بدات. دەترسام داوا و پێشنیارەکەی قبوڵ کەم و محەممەدیش بەتەنیا دەگەڵ موحتەرەمێدا لەو ماڵەی بەجێ بێلم، دەترسام پێش لە دایکبوونێ کوڕیەکەم ئەو موحتەرەمێ بێنێ.

لەبەر ئەوە بەبیانووی جۆرا و جۆرەوە ملم بەتکاو پێشنیارەکەی دایکم نەدا و بەڵێنم دا هەموو رۆژێ بە رۆژ بچمە ماڵی ئەوان وشەویش بێمەوە ماڵێ. چەندین هەفتە ئاواچوو. لەو رۆژەوەی کە دایکم لە خواردنی باش و میوەی زۆری گرتم و بۆ خۆی بەسەرم ڕادەگەیشت وردە وردە سەرئێشەو سەر سووڕانەکەم نەما. شەوێکیان دوای نانخواردنی ئێوارێ زوو چوومە ناوجێ و نووستم محەممەد هەروا دانیشتبوو و سەیری تەلەفزیۆنی دەکرد. نازانم چەند سەعات نووستبووم کە ئازارێکم لە کەلەکەی وەستا و بە ئاگای هێنامەوە و لە خەوی کردم. کاتێ کەلە جێوە هەستام دیتم محەممەد لەناو جێیەکەیدا نیە. زۆر بەئەسپایی بانگم کرد:

- محەممەد، ئەوە هێشتا هەر نەنووستووی؟

بەڵام گوێم لە هیچ وەڵامێك نەبۆوە، بەگومانی ئەوەی کە محەممەد چۆتە مەتبەخێ ئاو بخواتەوە لە جێی خۆم ڕاکشامەوە بەڵام نەنووستمەوە و هەر چاوەڕێی هاتنەوەی ئەو بووم.

سەعاتێکی پێ چوو کە سەیرم کرد ئەوە محەممەد بە دزیەوە لەسەر پەنجەی پێی دێتەوە ژووری و لەسەرخۆ دەخزێتەوە ناو جێگاکەی. من خۆم لە خەوکرد و هیچم پێ نەگوت. چەندین ڕۆژ بەم جۆرە تێپەڕین و وردە وردە مەسەلەکەی ئەو شەوەو شەوانی دواتریش منیان لەکارەکانی محەممەد خستە گومانەوە تا ئەو کاتەی وەختی دانێ کرێی خانووێ هات. ئەوشەوە محەممەد زۆر شادو شەنگوڵ و بەکەیف دەهاتە بەرچاو و بەردەوام لەبن لێوانەوە نارەناری شیعرێکی بوو و جارجارەش دەچووە بەر پەنجەرەی و سەیرێکی دەرەوەی دەکرد.

دەگەڵ ئەوەشدا کە سەرم لەکاری وی دەرنەدەکرد بەڵام ڕێی ئەوەم بەخۆشم هەر نەدا هیچ بپرسم، رووم دە محەممەدی کردو گوتم:

- کرێی خانووت لەبیر نەچێ، بەیانی بەر لەوەی بچیە موغازەی کرێی خانووەکە لەسەر مێزەکە دانێ تا بەیانی بیدەمە موحتەرەمێ.

محەممەد وەك بڵێی چاوەڕێی هەلێکی وابێ گوتی:

- نا، پیویست ناکا تۆ بە پلیکاناندا بچیە خوارێ، دەترسم لە پلیکانەکان بەربیەوە من خۆم کرێیەکەی دەدەمێ.

- بەلالووتێکەوە گوتم:

- نا، پێی ناوێ تۆ کرێیەکە بەری بۆخۆم بەیانی کەچوومە خوارێ پارەکەی دەدەمێ.

محەممەد ئیدی هیچی نەگوت وپێی دانەگرت. هەر تەنیا شانێکی هەڵتەکاندوله وەڵامێمدا گوتی:

- باشە، کە هێندە حەز دەکەی و واسووری لەسەر ئەوە خۆت پارەکەی بدەیە. دوای سەعاتێك خۆم بۆ نووستنێ ئامادە کرد و لەمحەممەدم پرسی:

- من دەچم دەنووم تۆ نانووی؟

محەممەد خۆی دە تەماشاکردنێ تەلەفزێنیدا ون کرد و گوتی:

- نا، سەعاتێکی دیش بۆ ئەو بەرنامەیەی خۆم دادەنیشم کە حەزم لێیەتی.

- کەواتە من دەچم دەنووم، هیچت ناوێ؟

محەممەد هەروا بەدەم سەیرکردنێ تەلەفزیۆنەوە گوتی:

- نەء شەوباش.

لە ڕەفتارو هەڵس و کەوتەکانی محەممەدی کەوتمە گومانەوە و دەنێو جێیدا ڕاکشام و چاوم نێکنا، دەبیرو خەیاڵی خۆمدا بەدوای بەڵگەیەکدا دەگەڕام تا ئەو گومانانەم بڕەوێنێتەوە. دڵە خوتەیەکی سەیرم لێبوو و دڵم خێراخێرا لێی دەدا، هەرواکە بیرو خەیاڵی خۆم دێنا و دەبرد هەستم کرد محەممەد تەلەفزیۆنەکەی کوژاندەوە و بەسپایی لە جێی خۆی قیت بۆوە و بەرەو ژووریوەهات. کاتێ کە گەیشتە دەرکێ ڕاوەستاو هەستێکی ڕاگرت، وەك بڵێی دەیویست ئەرخەیان بێ کەمن نووستووم. چەند دەقیقێکان ڕاوەستا ودوایەش وەك سێبەری بێدەنگ لە ماڵێ چووە دەرێ و دەرگاکەی بە دوای خۆیدا داخست. گوێم لە دەنگی پێیەکانی بوو کەلە پلیکانەکان دەچووە خوارێ، دەستبەجێ لە جێوە هەستام و چوومە بەر پەنجەرەی حەزم دەکرد بزانم بەو ناوەختەی شەوێ دەچێتە کوێ، بەڵام چەندی ڕاوەستام محەممەد لە حەسارێ نەچووە دەرێ. نیوسەعاتێکی برد لە پشت پەنجەرێوە بووم و سەیری حەسارێم دەکرد بەڵام محەممەد لە حەسارێ نەچووە دەرێ. ئیدی دڵنیابووم کە ئەوە لەلای موحتەرەمێیە، بەڵام بەو ناوەخت و سەعاتەی چ کارێکی بەماڵێ موحتەرەمێ بوو؟

بە درێژایی ژوورێم دەست بە ڕاوێچکان کرد و چاوەڕێی محەممەد بووم بەڵام دیسانەوەش سووسەیەکی هەر نەبوو. سەیری سەعاتێم کرد نزیکەی یەك سەعات بوو چووبووە خوارێ، وام بە خەیاڵداهات:

- هەردەبێ چووبێتە لای موحتەرەمێ تا کرێیەکەی بداتێ.

بەڵام قنیاتم نەبوو و لە وەڵامدا گوتم:

- بەڵام خۆ بڕیاربوو بەیانی من ئەو کارەی بکەم ئەدی ئەو چ کارێکی بەموحتەرەمێیە ناکا ئەو و موحتەرەم...

لەو بیرو خەیاڵانەی هۆروژمیان بۆ مێشکم هێنا ترسام و بێ ڕاوەستان دڵی خۆمم دایەوە:

- نا، نا، هەرگیز وانیە، قەت نابێ محەممەد تا ئەو ئەندازەیەش هیچ بێ. سەعاتێکی دیکەش چوو بەڵام محەممەد هەر نەهاتەوە ماڵێ سەیری سەعاتم کردەوە سێ سەعات دەبوو چووبووە ماڵێ موحتەرەمێ و نەهاتبۆوە، بە گرژییەکی زۆرەوە بە درێژایی ژوورێدا دەهاتم و دەچووم و جنێوم بە ئەرزو ئاسمانان دەدا.بێزم لە خۆم دەبۆوە کە بۆهێشتم، لەبێ ئاوەزیە خۆم و لەبەر نەزانیە خۆم زاڵم لێ هەستا بوو. نیوە شەو شەق ببوو بەڵام محەممەد هەروا بێ سووسەو هەواڵ بوو بەنارەحەتیەوە بەرەو لای ژوورێ موحتەرەمیەوە چووم لە پەنجەرەی دەرکەی ژوورێوەمرا دەتوانی محەممەد و موحتەرەمێ ببینم. هەردووکیان پاڵیان دابۆوەو خەریکی پێکەنین

و قسان بوون. موحتەرەم بەعیشوەو نازەوە دڵی لە محەممەدی دەستاند و محەممەدیش وا دەویدا ون ببوو هیچ ئاگای لە خۆی و لە دەورو بەرێی نەمابوو. دەو دەمیدا بوو زانیم کە جێی ئەو شەوەی محەممەدی بۆ چۆڵ بوو ومنی گێلیش هەموو شەوێ دەکەوتمە خەوی بێ ئاگاییــە و ئــەو دووەش سوودیان لەبێ ئاگاییە من دەدیت. بەدیتنێ وان و ئاوا بەم جۆرەش خوێنم وەجۆش هات و بەبێ لە دەرگادان دەرگام کردەوە و چوومە ژوورێ. هەردووکیان لە جێی خۆیان وشــك بــوون محەممــەد بەسەرسامیەکەوە سەیری دەکردم و هیچی نەدەگوت. چەند دەقیقێکــان بــە بێــدەنگی تێپــەڕی بەرقەوە سەیری هەردووکیانم دەکرد لە تووڕەییان ددانم دەچیڕەوە دەبردن. محەممەد لــە جێیەکــەی خۆی هەستاو بەرەو لای منەوە هات و گوتی:

- ئەوە هەستای رەها؟ هاتبووم کرێ خانووەکەی بدەم.

- هاتبووی کرێی بدەی؟ ئەدی من نەمگوت بەیانی بۆ خۆم ئەو کارەی دەکــەم، ئــەوە ئــەو شۆ هاتبووی کرێی بدەی ئەدی شەوەکانی دی بۆچی هاتبووی؟

محەممەد بێدەنگ بوو و بەدوای وەڵامێکی گونجاودا دەگەڕا. بەگرانیەکــەوە ســەیرێکی ئــەوم کردەوە و درێژەم دایەوە:

- ئەوە شەرمێ ناکەی و تەریق نابییەوە؟ ژنە دووگیانەکەی خۆت لە ماڵێ بەجێ هێشتووە و دەگەڵ بێوەژنێکیتدا گەرم کردووە؟ تۆ لە ماڵێ ژنێکی ڕەبەنی بێ مێرد بەو شەوە ناوەختــەی چدەکەی؟ ئێستا دەزانی ساعات چەندە و چــەند سەعاتیــشە لێــرەی و لــە پــەنا ئــەو ژنەیــەوە دانیشتووی؟

دوایەش چاوێکم دایە موحتەرەمێ و گوتم:

- شەرمێ بکە ژنێ، لە خودای بترسە، چــیت لــە گیــانی مێــردی مــن دەوێ؟ بــۆ دەســت لەیەخەی مێردەکەی من هەڵناگری و وازی لێ ناهێنی؟ بۆ بەو خۆهێنان و بردن و خۆ بادانانەت خەریکی لاڕێی کەی؟ تەریق نابیەوە ئاوا بــەو شــێوە ناشایــستەیەی دەگــەڵ پیــاوێکی بێگانــە دانیشتووی و خۆت دەبەر کردووە نوقورچانت لێ بگرێ؟ موحتەرەم لە جێوە دەرپەڕی و دەستی بەشاتەشات و هاتو هاوارێ کرد:

- تۆ تەریق ببەوە کە تۆمەتی ناڕەوا لە خەڵکی دی دەدەی. من کەی بۆ مێردی تــۆم خــۆ هێناوە و بردووە و خۆم باداوە؟ کەی ویستوومە مێردەکەت لاڕێ کەم؟ئەگەر نازانی راوەستە با پێت بڵێم تا بزانی کەمحەممەد خۆشی ناوێی و ڕقیشی لێت دەبێتەوەو راوەستاوە تــا منداڵەکــەت دەبێ ئەو دەمی تەڵاقیشت دەدا باشە؟ بۆ وام تەماشا دەکەی؟ باوەڕناکەی؟ وەرە ئــەوە محەممــەد

لە خۆی بپرسە، دەشزانی دوای تۆش بەنیازە کێ بێنی؟ دەی ئیدی ئەوەی نازانی، بەنیازە مـن بێنێ، ئەی گیانە، مەرجی شوو پێکردنێشیم تەڵاقدانێ تۆیە، خۆ باش تێگەیشتی خاتوون!

- بەزاری بەشەوە سەیری محەممەدم کردەوە و ناباوەڕانە پرسیم:

- محەممەد ئەوە ئەو ژنە دەڵێ چی؟

محەممەد شانەکانی هەڵتەکاندن و گوتی:

- بۆ خۆت گوێت لێبوو چی گوت، خۆ کەڕنی تێ نەگەی؟

دەمەوەری و بگرە وبەردەی نێوان من و موحتـەرەمێ بـەرزبۆوە. لـە پـڕ محەمـەد دەسـتی بەرزکردەوە و زللەیەکی وای لە بناگوێی دام کەلە توند یانی سەرم بە دیـواری کـەوت و ئیـدی ناگام لەهیچ نەما.

تاوێکی پێچوو تا توانیم بەسـەر خۆمدا زاڵ ببمەوە، تەنیا هەر دەگریام و بەدەم هەنیـسکی گریانێوەش بە محەممەدم گوت:

- ئیدی ناتوانم خۆم ڕاگرم، ئیدی تەنانەت بۆ تاوێکیش چیە ناتوانم دەگەڵە تۆدا بژیم، بێزت لێ دەکەمەوە.

محەممەد ئەوەی لە خودای دەویست دەستی گرتم و بەڕقەوە ڕاکێش ڕاکـێش سـەعات یـەك و نیوی شەوێ وەدەرێی نام و لەماڵێی دەرکردم. لەترسان هێنـدەی نـەمابوو زیرەبکـەم و بتـۆقم. نەمدەزانی تاك و تەنیا بەو نیوە شەوەی لەو کۆڵانەی چبکەم. ماڵێ بابم یەکجار زۆر دووربـوو، نەسەر پۆشێکم بەسەریەوە بوو نە پێڵاوێك لە پێ، لەوەی دەترسام یەکێك لە هاوسـێکان بێتـە دەرێ و ناوام ببینێ. لەپشت دەرکێ پاڕامەوە:

- محەممەد دەرکەی بکەوە، تکات لێ دەکەم دەرکەی بکەوە، بابێمەوە ژوورێ، ئەگەر خەڵکی بزانن چ دەڵێن، تووبی و خودا دەرکێ بکەوە.

بەتوندیم لە دەرکەی داو هەر دەشگریام نزیکەی بیست دەقیقان لە پشت دەرکەی ڕاوەسـتام و لە دەرکەم داو ناڵاندم تا محەممەد ڕێ بدا بچمەوە ژوورێ. بـەدەنگی کرانـەوەی قفڵـی دەرکـێ هەنگاوێك کشامەوە دوایە. محەممەد دەرکەکەی کردەوە و سەرپۆش و پێڵاوەکـانی بـۆ فڕیدامـە دەرێ و توند دەرکەکەی پێك دادایەوە و ڕۆیی.

ئیدی نەمدەزانی چبکەم بەترس و لەرزەوە پێڵاوەکانم لەپێ کردن و سەرپۆشەکەشم بەسـەرم دادا و کەوتمە ڕێ. بەپەلە ڕامدەکرد و دەگریام. دەنگی گریانەکەم بێدەنگیە شەوێی دەشـلەقاند و دەناخی تاریکە شەوێدا ون دەبوو. گەیمە سـەری کۆڵانێ، ڕاوەستام و سـەیرێکی لای ماڵـەوەم

کردەوە، حەزم دەکرد دووبارە بگەڕێمەوە و پەنا بەرمەوە بەر کونجی ژوورەکەم، بەڵام نەدەکرا، باش دەمزانی کە ئیدی محەممەد دەرکەم لێ ناکاتەوە. دووبارە لە قوڵپەی گریانێم دایەوە و بەدەنگێکی بەرزەوە دەستم کردەوە بەگریانێ، دەستم بە دەممەوە نا تا دەنگی گریانەکەم دەرنەیە، دەترسام نەك خەڵکی وە ئاگابێنم.

چەند شەو گەڕ وکۆڵان کوت و بەرەڵڵایەکیش ئاگریان دەنێو تەنەکەیدا کردبۆوە و خەریکی قسەی قۆڕو بێ تام بوون دەگەڵ یەکتری. خۆم دایە کەناری دیواری و بەسپایی دەڕۆیشتم تا ئەوانە پێم نەزانن. نزیکەی سەد مەترم پیادە ڕۆیەکە بڕیبوو کەلە پڕ لە دواوە دەنگێکم بیست کەمنی بانگ کرد:

- باجی، ئەگەر لە جێی نووستنێ دەگەڕێی ئێمە لە خزمەتداین.

بەبێ ئەوەی ئاوڕ لەلای دەنگەکە بدەمەوە هەنگاوم هەروا و خێراتر کردن. دەنگی چەندین کەسم دەبیست کە بەدوامەوە بوون و دە ڕێژنەی مەتەڵەکانیان گرتبووم. سەرتاپا لەشم لەرزێك دایگرتبوو مەپرسە. هەرچی هێزو توانام هەبوو دەقاچەکانمدا کرکردبۆوە و ڕامدەکرد. کۆڵان کوتەکانیش لە دوامەوە بەدەنگی بەرزەوە پێدەکەنین.

لەوەی کە هەر لەوێ لە پشت دەرکەی ئەمامەوە و هاتمە سەرشەقامێ پەشیمان بوومەوە و لەدڵەوە بێزم لە بێ غیرەتی محەممەد و بەخت ڕەشیە خۆم دەبۆوە. هەوڵم دا گوێ نەدەمە ناماقوڵیە بەرەڵڵا و کۆڵان کوتان بەڵام نەدەکرا یەکێکیان گوتی:

- بابزانم لە مێردەکەت تۆراوی؟

یەکیدی دەیگوت:

- مەگەر من مردووم، وەرە مێردەکەتم پێ بڵێ تا ئێستا ملی بشکێنم.

هەڵوەستەیەکم کرد و بەرەو لای ئەوان گەڕامەوەو بە پاڕانەوەوە گوتم:

- ئێوەو ئەو خودایە وازم لێ بێنن.

یەکێکیان رووی لەوانی دیکە کرد و گوتی:

- کوڕینە بابڕۆین، دیارە یارۆ لەوانە نیە.

یەکیدی گوتی:

- بەڵێ سەیری کە خەریکە دڵی ڕاوەستی، واوە وەرن تا بەسەرماندا ساغ نەبۆتەوە و بەملماندا نەهاتووە باتا زووە بگەڕێینەوە.

هــەموویان ڕێ و ڕێ لــە کوێــوە هــاتبوون گەڕانــەوە. هێــشتا چــەند هــەنگاوێك دوور ـەکەوتبوونەوە کە یەکێکیان ئاوڕی دایەوە و بە بەرزیەکەوە گوتی:

- ببوورە باجی مەبەستم سووکایەتی نەبوو، بەڵام لەبەر ئەوەی من بۆ تۆمە و چاکەی تــۆم گەرەکە زۆر بەشەرمیشەوە ئەوەت پێ دەڵێم، کەنەدەبوو بەو ناوەختەی شەوێ بێیە دەرێ و ئاوا بە تەنیاش ماڵێ بەجێ بێلی.

زۆرم سوپاس کرد و گوتم:

- ڕاستیەکەی بۆ خۆشم لەوەی کە بەو شەوە ناوەختەی ناچــارم بــوو وم مالــێ بــەجێ بــێلم نارەحەتم.

لاوە سەیرێکی ئەو لاو لای کرد و گوتی:

- ئەگەر حەزیش دەکەن تا ئەو جێیەی دەتانەوێ باڵەگەڵتان بێم تاکەس نارەحەتتان نەکا.

زۆرم سوپاس کرد و گوتم:

- پێویست ناکا هێندەی نەماوە بۆ ماڵێ.

لاوەکە چۆوە ناو ئاواڵەکانی و کەوتەوە قسان دەگەڵیانــدا. وردە وردە لــێم دوور کەوتنــەوە وەك بڵێی قسەکانی من کاری دەدڵی کردبن یا پەرجووەکی خوایی بــوو کــە ئــاوا لــەو ڕێیــەی لێوەی هاتبوون گەڕانەوە. گەیە شەقامەکەی دواتر، دڵم هەروا تەپەی بــوو و خێــرا خێــرا لێــی دەدا، لەوەی دەترسام بەرەڵڵایەکی دی ڕێگام پێ بگرێ. دەترسام تووشی یەکێکی دیکــەی ئــەو تۆزم قسەی نەچتە گوێ و کاری تێنەکا و تووشی ئێش و ئازارو دەردە سەریەم کا. کــە ئەوانــەم هێنایە پێش چاوی خۆم هەنگاوەکانم خێراتر کردن و بەپەلەتر کەوتمــە ڕێ کەلــەپڕ بــەدەنگێکی ئاشنا لە جێی خۆم چەقیم.

زۆر بەترسەوە سەیری دواوەم کرد و ئەحمەدم ناسی. ئەحمەد خوارزای مێردەکەم بووکە منــی ناسیبوو و بانگی دەکردم. ڕاوەستام و لە دڵــەوە ســوپاســی خــوام کــرد. دیتنــێ ئەحمــەدی دەو سەعاتەی شەوێ و دەو بارو دۆخەیدا کە هەستی تێماوی و ترس و لەرز زۆر نەمابوو لە پــەل و پۆم بخەن بەراستی پەرجووەکی خودایی بوو.

ئەحمەد بەرەو لامەوە هات و بەســەر سامییەوە پرسی:

- خالۆژن ئەوە لێرە چدەکەی؟

سەیرێکی ئەو کوڕە هەرزەکارەم کرد کە دەگەڵ ئەحمەدی بوو و لە ئەحمەدم پرسی:

- ئەدی تۆ بەو شەوە درەنگ وەختە چدەکەی لە دەرێ؟

ئەحمەد سەیرێکی برادەرەکەی کرد و وەڵامی دایەوە:
- ئەمین برادەرمە و من لە ماڵێ وان پێکەوە سەعیمان دەکرد و ئێستاش بەنیاز بووم بچمەوە ماڵێ تووشی ئێوە بووم.
ئەحمەد سەرنجێکی پرسیاراوی بەم لاولادا گێڕاو کەکەسی لەو دەورو بەرانەدا نەدی پرسی:
- ئەدی خاڵە محەممەد کوا؟ ئەو لە کوێیە؟ ئێوە نەتانگوت بەو شەوە ناوەختەی چدەکەن لێرە؟
تاوێك راوەستاو کەهیچ وەڵامێکی لەمن نەبیستەوە درێژەی دایەوە:
- ئێوە نازانن هاتنە دەر دەوکاتانەی شەوێدا چەند تەلەزگەیە؟ من خاڵم زۆر پێ سەیرە کەهێشتوویەتی ئەویش بەو شەوەی بەتەنیا لە ماڵێ بێیە دەرێ.
ئەحمەد بێدەنگ بوو لەپڕ شتێکی وەبیر هاتەوە و پرسی:
- دادەی خاڵۆژن، خاڵم هیچی لێ قەوماوە؟
بەسەر وەڵامێکی نەرێیانەم دایەوە و گوتم:
- وەرە بابڕۆین لە رێیە هەموو شتێکت بۆ باس دەکەم.
ئەحمەد خودا حافیزی لە برادەرەکەی کردو ئێمەش کەوتینە رێ، کاتێ کەدڵنیابووم برادەرەکەی ئیدی گوێی لە دەنگمان نابێ بە پاڕانەوەوە گوتم:
- ئەحمەد گیان، تکات لێ دەکەم تا ماڵێ بابم دەگەڵ وەرە.
ئەحمەد بەسەیرێکەوە پرسی:
- خاڵۆژن ئەدی ئەوەنابێ بزانم چ قەوماوە؟ هەر نەبێ لەمن دڵنیابن و باس و خواسەکەم پێ بڵێن بەڵکە بتوانم شتێکم لە دەست بێ...
هاتمە نێو قسەکانی ئەحمەدیەوە و گوتم:
- تەنیا هەر ئەوەندەی بزانە کە خاڵت دەری کردووم.
ئەحمەد بەسەیرێکەوە تەماشای کردم بە هەراسانیەوە گوتی:
- چی؟ تۆی دەرکردووە؟ باشە بۆ؟ تکات لێ دەکەم بەسەرهاتەکەم بۆ بگێڕەوە بامنیش بزانم بەسەرهاتەکە چیە؟
هەروا بەدەم گریانەوە باس و بەسەر هاتەکەم هەموو بۆ گێڕایەوە، لە دوای مێردکردنێمەوە ئەو یەکەمین کەسێك بوو گوێ بۆ سکاڵاکانم شل کات و بزانێ کە دەو چەند ساڵەی

ـەریەتیە محەممەدیدا چ ئێش و ئازارو رەنج و ناخۆشیەکم کێشاوەو خۆم دە بنـدا ڕاگرتـووە.
- زۆر بە داخەوە سەرێکی لە قاندو گوتی:
- بە بۆچوونی من ئێستا و دەو سەعاتە وەختەی شەوێدا راست نیە کەسـوکاران نارەحـەت کەین، ئەو بەستەزمانانە هـەر هەترەشـیان دەچـێ واباشـترە بـچینەوە مـاڵی ئێمـە بـەیانیش کەسوکاران ئاگادار دەکەینەوە.
قسەکانی ئەحمەدیم بەلاوە لە جێی خۆی بوو هەر نەبایە خوشـکەکەی محەمـەدی ئاگـاداری رەفتارە دزیوەکەی برایەکەی دەبوو. دەودەم و سـەعاتەی شـەوێ تـەنیا هـەر لـەبن سـاپیتەکی دەگەڕام تا هـەر نـەبێ لـەو بـارو دۆخـە ناماقووڵـەم رزگارکـات و بـشارێتەوە. لەبـەر ئـەوە پێشنیارەکەیم قبوڵ کـرد و دەگـەڵ ئەحمەدیـدا چـوومە مالـێ دشـەکەم. هـەر چـۆنێکی بـوو لەسەرجادە و سەرگەردانیە چاکتر بوو.

* * *

دەوساتەیدا تەواوی بەدەنم دەلەرزی، هەر بەزیندانیـەکی دەچـووم کـە تـازەی لـە زینـدانێ ڕاکردبێ و ترسی ئەوەی هەبێ دە هەر ئان و ساتێکیدا بیگرنەوە. سەعات نزیکەی دووی بەیانی بوو کە گەیشتینە ماڵێ دشەکەم. ئەحمەد کلیلی پێ بوو بەلاّم زەنگی لێ دا تا دایك و بابی بێن دەرکەی بکەنەوەو ئاگایان لەهاتنێ من بێ. هەموو ئەوانەی ماڵـێ دەخـەوی شـیریندا بـوون و نووستبوون، ئەحمەد ناچار بوو چەند زەنگێکی دیش لێدا تا یەکێك هەستێ و دەرکەی بکاتەوە. چەند دەقیقێك رابرد گلۆپی سەر دەرکەی هەڵبوو. دەنگی خەواڵووی ئیبراهیمی مێردی دشەکەم هات کە پرسی:
- کێیەوە؟
ئەحمەد وەڵامی دایەوە:
- منم بابە، بە یارمەتیت دەرگاکە بکەنەوە.
دەنگی پێی برایاغای بەرز بۆوە کەبەرە و لای دەرکی حەسارێوە دەهـات و لـەبن لێوانـەوە دەیگرماند:
- سەد جارم گوتووە شەوانە هێندە درەنگ مەیەوە ماڵێ یا هەر نەبێ کلیلێ دەگەڵ خۆتدا بەرە تا بەو ناوەختەی شەوێ ئاسوودەیمو حەوانەوێ نەهەمووان تێك نەدەی.
ئەحمەد سەیرێکی منی کرد و زەردێکی هاتێ و لەسـەر خۆ گوتی:

- ئەوە چونکە لە خەوم کردووە  وانارەحەتە ئێوە نارەحەت مەبن مـن دەگـەڵ بۆڵـە بـۆڵی دایی و بابان ڕاهاتووم.

ئیبراهیم ئاغا  قفڵی دەرگا ئاسنەکەی بە دەنگێکی وشکەوە کـردەوە و دەرکـەی واڵا کـرد هەر کە چاوی بەمن کەوت ساتە وەختێکی کش و مات و هەوت تێمەوە ڕاماو سەیری کـردم و دوایەش چاوێکی لە ئەحمەدی کرد. زۆر بەشەرم و تەریقیەوە سەلاوم کرد و ئیبراهیم  ئاغا خۆی خڕکردەوە و بەمیهرەبانیەکەوە گوتی:

- سـەلاو لەمنەوە رەها خاتوون، زۆر زۆر بەخێربێی فەرموونە ژووریّ تکا دەکەم.

ئەوجا لەبەر دەرکیّ لاچوو و بەئاماژەی دەست منی بۆ ناوحەساریّ فەرموو کرد.

دوای چوونە ژوورەوەی من بۆ ناو حەساریّ ئەحمەدیش دوای من هاتە ژووریّ، ئیبراهیم ئاغا سەرێکی لە کۆلانیّ خوار کردەوە و گوتی:

- ئەدی محەممەد ئاغا تەشریفیان نەهێناوە؟ ئێوە هەر تەنیان؟

بەشەرمەزاریەوە گوتم:

- بەلیّ، کە بەو ناوەختەی نارەحەتم کردوون داوای لێبووردن دەکەم.

ئیبراهیم ئاغا کراسەکەی رێك خستەوە و خێرا خێرا قۆپچەکانی داخستن و گوتی:

- تکا دەکەم، ئەو قسانە چین دەیانکەی، مالیّ خۆتانە، فەرموون وەرنـە ژووریّ تـا دەچـم ملوکیّ هەلدەستێنم.

داوای لێبووردنم لە ئیبراهیم ئاغای کرد و چوومە ژووری  دانیشتنیّ و هەروەك منـدالێکی دوورە دایك و باوك لە غەریبییەدا لە کونجێکەوە بەماتی دانیشتم.

دوای چەند دەقیقێکان بە دیتنیّ ملوك خانمێوە غەم و کەسەری ناو دلّ و هەناوم وەك لافاویّ هەستانەوە و فرمێسکم بە لووزەو بە چاواندا هاتە خواریّ. لەجێی خۆم راسـتبوومەوە و چـووم خۆم دەئامێزیّ ملوك خانمیّ هاویشت و بە خوڕ گریام.

ملوك خانم بەسەیرێکەوە چاوێکی لەمن و ئەوجا چاوێکی لە ئیـبراهیم ئاغـای کـرد کەلـە دوای منەوە هاتبووە ژووریّ وبە دەنگێکی لەرزۆکەوە گوتی:

- چبووە، رەها خاتوون، محەممەد چی لیّ قەوماوە؟

بەسەر لەقاندنێوە وەلامێکی نەرێیانەم دایەوە. ملوك خانم کە دلّەراوکەو دلّـە خورپـەی دە دەنگیدا شەپۆلیان دەدا پرسی:

- ئەدی باشە چ قەوماوە؟ توخوا بلێ، تۆ، بەو ناوەختەی شەوێ چدەکەی لە دەرەوەی ماڵێ؟ ئەویش ئاوا بەتاقی تەنێ؟

بەدەم هەنیسك و قوڵپەی گریانێوە ناڵاندم:

- کام ماڵ، من خۆ ئیدی تازە ماڵم نیە، محەممەد هێلانە و ماڵی لێ تێك دام و کاولی کرد و منیشی لەو کاولەی وەدەرنا و دەریکردم.

ملوك هێندێکی لە خۆی تەکاندمەوە و گوتی:

- دەڵێی چی؟ محەممەد ناماقووڵی کرد هەتا سەری هەڵدەگرێ تۆ لە ماڵێ دەرکا، وەرە دانیشە بابزانم چ روویداوە و چبووە و چ قەوماوە؟

هەروا کە دەستی گرتبووم و لە پەنای خۆیەوەی دادەنام بە ئەحمەدی کەتازە هاتبووە ژوورێ گوت:

- رۆڵە گیان بێ زەحمەت پەرداغە ئاوێکی بۆ خاڵۆژنێ بێنە و ئاگری بن کتریەکەش هەڵکەوە تا چایەکی لێنێم.

ئەحمەد دەستبەجێ راستبۆوە و لە ژوورێ چووە دەرێ. ملوك خانم بە میهرەبانیەوە رووی لەمن کردەوە و گوتی:

- تووبی ئەو خودایەی ئەوا مەگری، محەممەد ئەوەی ناهێنێ تۆ خۆی بۆ نارەحەت کەی جا چ جای ئەوەی بۆی بگری، دەی جا هەر کاتێ ئارام بوویتەوە بۆم بگێڕەوە چ قەوماوە و چ روویداوە و تۆ و محەممەد لەسەر چیتان شەڕو هەرا بووە.

ملوك خانم و ئیبراهیم ئاغا هەردووکیان بە بێدەنگیەوە سەیری هەڵوەراندنی فرمێسکەکانی منیان دەکرد و ئیبراهیم ئاغا جارجارێکانیش لە رووی بەزەیی و داخەوە سەرێکیشی بادەدا.

ئەحمەد بەخۆو بە پەرداغە ئاوەوە هاتەوە ژوورێ و ملوك خانم ئاوەکەی هەڵگرت و فەرمووی پێ لەمن کرد. زۆرم سوپاس کرد و پەرداغە ئاوەکەم لێ وەرگرت. دەستم وا دەلەرزی کەبڕە ئاوێك بەسەر چارشێوەکەم و سەر عەردیدا رژا، دوای خواردنەوەی قومێکی هەناسێکی قووڵم هەڵکێشا. چەند دەقێقێکی برد تا توانیم دەست بە گێڕانەوەی مەسەلەکان بکەم. ئەوجا بە ئارامیەکی تەواوەوە کێشەکانم هەر لەو رۆژەوەی خەسووم و جەمیلە بە میوانیمانەوە هاتبوون تا دوایین شەڕی ئێستامانم هەموو لە هەموو گێڕایەوە. جاری وابوو لەبەر نارەحەتیان لە پڕمەی گریانێم دەدا و قسەم پێ نە دەکرا. سەر سوڕمان و هەوتی بەئاشکرا بە دەمو چاو و سەر و رووی ملوك خانم و ئیبراهیم ئاغایەوە دیاربوو و دەبینرا.

ئەوان بەزاری بەشەوە کش و مـات گوێیـان بـۆ قـسەکانی مـن ڕاداشـتبوو و لـە کۆتـایی قسەکانیشمدا گوتم:

- من هەر لە سەرەتاوە دەمزانی کە محەممەد مەبەستی من نیە و دوایـیش مەبەسـتەکەی لەو هاوسەرگیریەی بۆ روون کردمەوە و پێی گوتم.

- لەوانەیە تۆش هەر هەڵـە بیـت و محەمـەد ئـەو مەبەسـتەی دەو هاوسـەرگیریەیدا هـەر نەبووبێ؟

هەناسێکم هەلکێشا و گوتم:

- هەڵەی چی! کاتێ کە ئەو بە زمانی خۆی بەمن بلێ کە بە چ هۆیەکەوە منـی هێنـاوە و مەبەستی چ بووە، هیچ دەمێنێتەوە، و ئەوە هیچ هەڵەیەکی تێدایە؟

ئیبراهیم ئاغا خرپشکنانە پرسی:

وەگری هاتمەوە و گوتم:

- حەزدەکەم ئێوە بۆ خۆتان داوەرییەکەی بکـەن و ڕای خۆتـان بـدەن داخـوا ئـەوە راسـتە مێردێك ئاوا بە ژنەکەی بلێ...

پەرداغە ئاوەکەم لەسەر مێزەکەی هەلگرت و قومێکی دیکەم لێدا ئەوجا درێژەم دایە:

- زۆر چاکم دەزانی کە محەممەد لووت بەمندا ناهێنێ ومنی نـاوێ و دوایـیش هـەر خـۆی رانەگرت و پێی گوتم کە تا بابت موغازەکە نەخاتە سەر من و بە ناوی منیەوە نـەکات هـەر ئەوە حاڵتە، بۆ پێتوایە من عاشقی چاو و ئەبرۆی تۆ ببووم کە هاتوومە خوازبێنیەت؟

ئیبراهیم ئاغا و ملوك خانم ناباوەڕانە سەیرێکی یەکتریان کرد. ئیبراهیم ئاغا لـە رووی داخ و دڵسۆزیەوە سەرێکی بادا و گوتی:

- ئەوەیە کە دەڵێن کەس دڵی کەسی پێ ناخوێندرێتەوە، ئەوە نزیکەی سـێ سـاڵە کـەمن زاوای ئەو بنەماڵەیەم کەچی هێشتا محەممەدم هەر نەناسیوە.

بەنیگەرانییەوە پرسیم:

- ئێوە پێتانوایە بتوانم پشتی پێ ببەستم؟ چـۆن بتـوانم بـاوەڕ بـە قـسەکانی بکـەم، کـێ دەتوانێ گرەنتی ئەوە بدات کە دوای بەناو کردنێ موغازەکەش من تەلاق نـادا و موحتـەرەمێ ناهێنێ.

ملوك خانم بە ناقایلیەوە گوتی:

- ناماقوولّیە دەکا دەچیّ بێوەژنیّ دێنی. بەخودای قەسەم هەربیبینم ئەوەی لەزارم بێتەدەرێ پێی دەڵێم، بیّ غیرەتەی نا پیاوە، قوربەسەری کە ژنە جوان و نازدار و نەجیبەکەی خۆی بە بێوەژنێکی بدا، ئەمن هەر دەڵێم ئەو ژنە نووشتە و کشتەك و دوعایەکی بەزاریدا کردووە یا...

ئیبراهیم ئاغا بەبیّ حەوسەڵەییەوە قسەکەی پیّ بڕی و گوتی:

- ناباب ئەو قسانە چین دەیانکەی، محەممەد هەر بۆ خۆی لەو ژنەی دەوەشێتەوەو قابیل و شایان و شایستەی وییە چی بەسەر نووشتە وکشتەك و ئەفسوونانەوەیە! کچەکەم تۆش کارێکی چاکت کردووە کە هاتوویە ئێرە.

بەشەرمێکەوە گوتم:

- ئەوشۆ بەختم هەبوو کە کاکە حەمەدم دیت و هەر دەو ساتەشدا کە تووشی وی بووم زانیم کە خودا هێشتا ڕووی لەمنی بیّ دەسەڵات و بەندەی هیچی خۆی وەرنەگێڕاوە و بەرەڵڵای نەکردووە، ئیدی توانای ئەو هەموو سووکایەتیەم نیەو ئەو ژیانەم ئاوا پیّ ناچێتە سەریّ و لە توانای من بەدەرە بۆیە هەر چۆنێکی بووە دەبیّ سەرە پەتێکی ئەو گلۆڵەی ژیانەم هەر ببینمەوەو بەخۆم دابێمەوە و ئەگەر سەریش نەکەوتم ئیدی ئەوە هەرچی تانو پۆی ئەو ژیانەیە هەمووی دەپسێنم.

گریان ڕێی قسانی لیّ گرتبووم، نازانم چەند گریابووم کاتیّ کە سەرم هەڵێنایەوە چاوەکانی ملوك خانمیش لەبەر گریانیّ سوور هەڵگەڕابوون. دەستەکانیم خستنە ناو دەستەکانمەوەو پێم گوت:

- تکا دەکەم ببوورن، ئێوە و ئیبراهیم ئاغاشم بە قسەکانم نارەحەت کردن، ئەگەر بفەرموون هەرئەم شەو لێرە بم، بەیانی زوو دەچمەوە ماڵیّ بابم.

هەروا کە دەستەکانم دە دەستی ملوك خانمیدا بوون ئەو هەر دڵخۆشی دەدامەوە و هەوڵی دەدا بەقسەکانی بڕێکم لە ئێش و ئازارو ڕەنج و ژانەکان کەم کاتەوە.

سەرم بڵند کرد و دەچاوەکانیەوە رامام، ئەوجا بە دەنگێکی لەرزۆکەوە پرسیم:

- بەلای ئێوە لەکوێی ئەم ژیانەمدا بەهەڵە چوو وم، لە کوێم ڕیّ هەڵە کردووە و لاڕیّ بوو وم؟ ئایا بەڕاستی ژنێکی خراپی محەممەدی بووم؟ کەسوکارم دەرهەقی ئەو ژیانم کەمیان چاکە دەگەڵ کردووین؟ باشە دەبوو لەوە زیاتر چیان کردبایە کە کردوویانە و چ ماوە نەیکەن؟ محەممەد چی لە گیانی من و کەسوکارەکەم دەویّ! ئەو ژنە تەڵاقدراوە چی پێوەیە وا محەممەدی شێت و

شەیدا و شیفتەی خۆی کردووە؟ تەواوی هەمووی ئەو پرسیارانە، پرسیارگەلێکن کە خەریکن من شێت دەکەن کەچی وەلامێکیشیان بۆ نا دۆزمەوە. ئەوەش نە لەبەر ئەوەی کە وەڵامەکانیان نازانم، نا، من هەر ئەوەی نازانم کە محەممەد بۆ بەرامبەر تەواوی خۆشەویستیە کەسوکارەکانی من لالووت و دڕدۆنگە، باشە ئەو لە ژیاندا چی دەوێ کەمن ناتوانم بیدەمێ؟ دووبارە گریامەوە، بە دەنگی بەرزەوە دەگریام و شانەکانم لەبەر هەنیسکی گریانێ هەڵتەك هەڵتەکیان بوو. ملوك خانم و ئیبراهیم ئاغاش هەر دڵیان دەدامەوە. ئیبراهیم ئاغا پێی وابوو کە لە دوا دواییەکەیدا محەممەد ڕۆژێك هەردێ سەری لەبەرد بدات و ئەو دەمی پەی بە هەڵەکانی خۆی بەرێ.

ملوك خانم بە دەنگێکی توورەوە گوتی:

حەزدەکەم ئەو سەرەی بەو لەشەیەوە نەمێنێ بەڵام پەی بە هەڵەکانی خۆی ببات و هەر ئەوەندەش بزانێ کە ئەو منداڵە بەستەزمانە بێ گوناهە جوانی و جاحێڵی و مێشکی خۆی بە قوربانی ئەو ژیانەی کردووە و هیچی پێ نەماوە دەگەڵ ئەوەشدا کە برامە بەڵام پێم کەسروکەمایەسییە برایەکی ئاوا لاسار و بێ غیرەتی وەکو ئەوم هەیە.

ئەوجا رووی دەمن کرد و بەمیهرەبانییەوە گوتی:

- تکات لێ دەکەم هەر ئارام و لەسەرخۆبە. دوایە هەموو شتێك چاك دەبێت، ئێستا تۆپێویستیت بە خەو و حەسانەوەیە. خوا رەحمێ بە تۆو بەو کۆرپەڵەی بکا کە دەزگتدایە بەڵکە ئەو هەتیوە بێ ئەقڵەی بێێتەوە سەر هۆش و ڕێی خۆی، هەستە بچۆ ئاوێکی بە دەست و دەموچاوتدا بکە هێندە گریاوی ڕەنگت بە ڕووانەوە نەماوە، ئازیزەکەم ئیش بە گریانێ پێك نایەت و چاك نابێ، محەممەد شایانی ئەو لێهاتوویی و قوربانیانەی تۆ نیە و لێی نایە. بەراستی تۆ لەونان و نمەك بەحەرام و بێ غیرەتە خەساری.

بە زۆریە ملوك خانمێ هەستام و چوومە حەسارێ، دەسەرەتای زستانێدا بووین و بەو بایە ساردەی لە دەموچاوی دام فێنکایەتیم پێداهاتەوە و هێندێکم دڵ دامرکایەوە.

ئاوێکم بە دەموچاوامدا کرد و هاتمەوە ژوورێ. ملوك سینی چا و میوەی هێنابوونە ژوورێ. چونکە زۆریش لە شەوێ رابردبوو هەستم بە برسییەتیەکی زۆر دەکرد. تکام لە ملوك خانمێ کرد کە ئەگەر چێشتی ئێوارێ هیچ ماوە بۆم بێنێ بیخۆم. ملوك خانم کە بۆ خۆشی هەر برسی بوو پێشنیارەکەمی زۆر پێ خۆش بوو و هێندێکی چێشت گەرم کردەوە و هەموو لە هەموو لە دەوری سفرەی خڕبووینەوە و نانمان خوارد.

دوای نانخواردنێ و چا خواردنەوێش دوو دەستە نوێنی هەر دە هەمان ژووردا راخست. سەرم لە دەستە نوێنەکان سوورِما. کە بەسەرنجە پرسیاراوییەکانی من زانی بەرلەوەی مـن قـسەیەك بکەم گوتی:

- ئەوە جێیەکیان بۆ تۆو ئەویدیش بۆخۆم، پێموابوو رەنگە بە تەنیا نووستنێ دەو ژوورەیدا بترسی، بۆیە لەلای تۆ دەنووم تا بە ئاسوودەیی و بێ غەم و خەیاڵ بنووی و بحەسێیتەوە.

سوپاسی ئەو هەموو دڵسۆزییەیم کرد و چوومە سەرجێی بەڵام تـا سـبەینێم خـەو نەچـووە چاوان و تا بەیانی چاوم لێك نەنان.

بەیانی زوو لەجێی هاتمەدەرێ و بەو سەرمای زستانەی کەوتـە راوێـچکان لـە حەسـارێ، دەهەناوی خۆمدا وا دەسووتام کە هەستم بە سەرمای زستانێ نەدەکرد. سەعاتێك چوو تاملوك خانم و ئەوا نیدیکەش لە خەوێ هەستان.

کە ملوك خانم هەستاو منی لە حەسـارێ دیـت راوێـکچان دەکـەم بەنیگەرانیـەوە هاتـە حەسارێ و گوتی:

- رەها گیان، ئەوە بـۆ بـەو کـەرِی بەیانیـەو بـەو سـەرمایەی لـە دەرێـی؟ وەرەوە ژوورێ سەرمات دەبێ، هەر ئێستا قاوەڵتییە ئامادە دەکەم، دەکـەم، وەرە ژوورێ بـە پیاڵـە چـایەکی سەرمای لە لەشت دەرکە.

بەرەولای ملوك خانمێوە چووم و سڵاوم لێ کرد، ملـوك خـانمیش بـە میرەبانیـەوە وەڵامـی سڵاوەکەی دامەوە و دەستێکی بەرووەمەتێش داهێنا و لە دیتنێ دەموچـاوم کـە بـە سـەرمایە سوور هەڵگەرابوو زەردێکی هاتێ و گوتی:

- وەرە لەبەر ئاوێنەی سەیرێکی خـۆت کـە، راسـت وەك ژنـە دیهاتییـان لێوەکانـت وەك غونچەی پشکوتوون! نازانی کە بەو جۆرە چەند جوانتر دەبێ.

ملوك خانم بەردەوام سەری دەکردمە سەرێ تا تۆزێ لەو غەم و خەفەتانـەی دەدڵمـدا بـوون سـووك بکـا. بـە زۆریـە ملـوك خـانم و ئیـبراهیم ئاغـا و ئەحمـەدی قاوەڵتیمـان دەکـەش و دەوروبەرێکی گەرموگورِ و پرسۆزدا خوارد. دوای قاوەڵتیە مۆڵەتم لە ملـوك خـانم و ئیـبراهیم ئاغای خواست تا دەگەڵ ئەحمەدیدا بچمەوە ماڵێ بابم بەڵام ئیبراهیم ئاغا نەیهێشت و رێی نەدا و داواشی لەمن کرد هێندێك راوەسـتم بەڵکـە ئـێ بتـوانن بـەبێ ئـەوەی کـە کەسـوکارەکەم نارەحەت و نیگەران کەن دەگەڵ محەممەدیـدا قـسان بکـەن و وای لێ بکـەن کـە دەسـتبەرداری موحتەرەمێ بێت و خانووێکی بگرن و لەوێ بگوازنەوە.

دەگەڵ ئەوەشدا کە وەڵامەکەی محەممەدیم دەزانی و شارەزای دژەکردارەکەی بووم بەڵام لەبەر ئەوەی ملوك خانم و هاوسەرەکەی وابیرنەکەنەوە کەمن هەڵناکەم و دەگەڵ مێردەکەمدا ناگونجێم و نایەمە ڕەدایە و هەر ئەو کەللەرەقیانەی من بووە کەژیانی بەو ڕۆژە گەیاندووین قبوڵم کـرد. ئیبراهیم ئاغا خۆی ئامادەکرد و دەگەڵ ئەحمەدیـدا چـوونە موغازەکـەی محەمـەدی تـا قـسەی دەگەڵدا بکەن و ئەویش دەگەڵە خویاندا بێننەوە ماڵێ خۆیان. بەو هیوایەی بتـوانن بـە قـسان وای لێ بکەن بێتەوە سەر هۆش و دەگەڵ ماڵ و ژیان وژن و کۆرپەکەیدا بسازێ.

چەند سەعاتێك بەسەر چوونێ ئیبراهیم ئاغا و ئەحمەدیدا دەچوو و من وملوك خانم ئـارام و ئۆقرەمان لێ هەڵگیرا بوو. بە باشی دەمزانی کە محەممەد چۆنیان ڕووبەڕوو دەبێتـەوە و ئـەوەش هەردەبووە مایەی شەرمەزاریە من.

ماوەیەك رابرد بەڵام ئیبراهیم ئاغا و ئەحمەد و محەممەد چ هەواڵێکیان نەبوو، هەوا بەتەواوی تاریك ببوو کە ئیبراهیم ئاغا و ئەحمەد بەسـوور هەڵگەڕاوییەوە هاتنەوە ماڵێ ملـوك خـانم بـە دیتنێ دەموچاوی ئەوان هەموو شتێك تێگەیی و بەبێ تاقەتیەوە لەسـەر موبێلەکـە دانیـشت. من هەر لەسـەرەتاوە هەوڵ و کۆشش و دەست پێشخەریە وانم بۆ ناو بژیو ئاشتبوونەوێ دەزانی کە بێ ئەنجامە. زۆر چاکم دەزانـی کـە محەمـەد واشـێت و شـەیدا و شـیفتەی موحتـەرەمێ و دەگەڵەویدا بووە کە ئەستەمە هەروابەئاسانی و بە چەند قسێکان، عیشقی وی لەبیر بـچێتەوە. ئیبراهیم ئاغا بە روخسارێکی سوور هەڵگەڕاو و تووڕەوە و بێ یەك وشە دانیـشتبوو و سـەیری ئەو هەڵمەی دەکرد لە پیاڵەی چایەکەوە هەڵدەستا. ملوك خانم خۆی ڕانەگرت و پرسـی:

- باشە دەی، دە شتێکی بڵێ پیاوەکە، ئەوە نەبووە ئیش، لەوەتەی هاتوویەوە هەر قسێکی ناکەی هەر نەبێ بڵێ چبوو چ نەبوو؟ محەممەدت دیت قسەت لەگەڵ کرد؟ یان نا؟ وەڵامی چبوو؟ ڕاستیەکەی محەممەد ئەو جۆرە ئیشانە بۆ دەکا؟ مەبەستی چیە؟ ئیـبراهیم ئاغـا سـەری بـەرز کردەوە و بەتووڕەییەوە گوتی:

- چ بڵێم خانم؟ وەڵـڵا هـی ڕاسـتیەکەیت دەوێ بێدەنگیەکـەی مـن لەبـەر خـاتری ڕەهـا خاتوونێیە، من شەرمەزاری ئەوەیم کە تەنانەت قسەکانی برایەکەت هەر بکەمەوە، ئەو پیـاوە چەند نزم و بێ ئابڕوو بووە و ئێمە نەمانزانیوە. راستیەکەیت دەوێ من پێموایە ئەو ژنە فریشتە بووە کە تا ئێستا توانیویەتی دەگەڵەویدا بژی لە ڕاستیدا ئەو کێوێك بوو کە تـا ئێـستا خـۆی ڕاگرتووە و ورد و خاش نەبووە.

ئیبراهیم ئاغا کەمێك وەستا و دەستی پێکردەوە:

کاتێ کە برایەکەت زانی رەها خاتوون لێرەیە و دوێنێ شەوێ ئەحمەد هێناویەتەوە ماڵێ خۆمان دەستی بەشەڕ و هەرایە کرد دەگەڵ من و ئەحمەدیدا و بەگژمان داهات کە بەقسەی کێ هێشتوومانە یا هێناومانەتەوە ئێرە. من و ئەحمەدیدیش هەرچی کردمان و کراندمان و لە هەر لایەکیەوە بۆی چووین نەمانتوانی دەگەڵە خۆمانیدا بێنینەوە ئێرە، هەرگیز قسەی ناچێتە مێشکی و هیچ وەرناگرێ و هەر لەسەر سێ جار بیستەی خۆیەتی و ئەو هەموو زۆری و پێداگرتن و سووربوونانەی من و ئەحمەدی بێ ئاکام بوو و نەهات و نەهات.

ئەوجا ئیبراهیم ئاغا رووی دەمن کرد و گوتی:

- من شەرمەزاری تۆشم کچەکەم کەبوومە مایەی ئازاردانێت بەڵام دەبێ ئەوەی هەر بڵێم کە محەممەد هاتۆتە سەر ئەوەی کە تۆ هەر تەڵاق بدات، و زۆریش رژدە لەسەر ئەوەی کە تازووە دەبێ ئەو کارە ئەنجام بدرێ و تەواوببێ. بەکوڵ دەگریام و لە ناخی دڵەوەم تووك لە محەممەدی دەکرد کە ئاوا شەو و رۆژی لێ کردوومە گریان. بەبیستنێ قسەکانی ئیبراهیم ئاغام هەست بە سوکایەتیە کرد، دارِمام، ورد و خاش بووم، حەزم دەکرد سەرم لە دیواری دابایە و بە هەموو هێزی خۆشم هاوارم کردبایە، نەفرەتت لی بێ محەممەد، نەفرەت لە تۆش ژیانی...

ملوك خانم بەسپایی دەستێکی بەسەریدا هێنام و بەرقێکی ئاشکراوە گوتی:

- مەگری ئازیزم، محەممەد لە تۆ ناوەشێتەوە، پێت وانەبێ بۆ دڵدانەوەو هێورکردنەوێت وادەڵێم، نا بە خودای هەر بەراستی لە تۆ ناوەشێتەوە، لەوەی چاکتر کەناوی پیاوێکی وات لەسەر نەمێنێ، بە خودای من شەرمەزاری تۆ و کەسوکارەکەشتم. هەروەك ئاگاداریشی من زۆر دەمێکە وازم لێ هێناون و هاموشۆیەکی واشم دەگەڵدانین، پێتوایە لەبەر چی؟ چونکە لەبەرەڵڵاییە یان بێزارم، پێتوایە پیاوەکەی مەنیژەی ، مەنیژەی بۆ تەڵاق دا؟ هەر لەبەر ئەو بەرەڵڵایی و بێ بەند و باوییەی نەبوو، وەڵڵاهی ناچار نەبم هەر بە زمانیشم دانایە کەمن خاوەنی ئەو کەس و کارو بنەماڵەشم.

دوای سەعاتێك باس و گفتوگۆ دەربارەی محەممەد و رەفتارە نالەبارەکانی داوام لە ملوك خانم و ئیبراهیم ئاغای کرد تا بچمەوە ماڵێ بابم. ملوك خانم زۆری پەلە کرد کە ئەو شەوەش هەر لە ماڵێ وان بم و بەیانیش بچمەوە ماڵێ بابم بەڵام ملم نەدا.

حەزم دەکرد تا زووە پەنا بەرمەوە بەرو باوەشی دایکم.

کە ملوك خانم منی بەو حاڵە پەشێوەوە دیت ئیدی چیدیکەی پێ دانەگرت و منی دەگەڵ ئیبراهیم ئاغایدا ناردەوە و بۆ خۆی لە شەرمێ رووان رووی نەدەهات چاوی بە چاوی باب و

دایکم کەویٚ بۆیە بۆ خۆی نەهات. ئیبراهیم ئاغا بە درێژایی ڕێیە بەردەوام دڵـی دەدامـەوە و داوای لیٚ دەکردم تا دەکریٚ هەر لەسەرە خۆو ئارام بم و بە غەمان خۆم لە ناو نەبەم چونکە هیچ کارێك بە غەمان پێك نایە و لەو باوەڕەشدابوو دواییەکەی محەممەد هەر دێتەوە سەر ماڵ و حاڵ و ژیانی خۆی. دوای گەیشتنەویٚ ماڵە بابم، ئیبراهیم ئاغـا بـە شـەرمەوە و بـەکورتی شـەوی پێشوو و چوونیٚ منی بۆ ماڵە خۆیان بۆ باب و دایکم گێڕایەوە و دوای سەعاتێك قسەو باس و گفتوگۆ دەگەڵ باب و دایکمدا خوا حافیزی کرد و چۆوە ماڵیٚ خۆیان.

باب و دایکم هەردووکیان بە داخەوە لەوەی کە ڕوویداوە کەوتنـە دڵدانـەوێم و داوایـان لیٚ کردم کە هەرچی بووە و ڕوویداوە هەموویان بە دوور و درێژی بۆ باس بکەم و بۆیان بگێڕمەوە. منیش بەدەم لشمەلشمی گریانێوە هەرچی هەبوو هەموویم بۆ گێڕانەوە و لە کۆتایی قسەکانمدا گوتم:

- هۆی هەموو ئەو بەد بەختی و ڕەنج و ناخۆشیانەی کەتووشی من هاتن تەنیا ئێوە و بابە گەورەن، ئەوە هەر ئێوە بوون کە تەنیا حیسابتان بۆ ڕووالەتی دەرەوەی کەسانێك کـرد و بوونـە هۆی هەموو ئەو ناخۆشیانەی من. بیرتانە چۆنتان گویٚ نەدایە داد و بڕۆ و گریانی من ومنتـان وەك شتێکی زیادە سـەیرکرد؟ ئێستاش ئەگەر جێیەکم هەبایە هەر نەدەهاتمەوە ئێـرە و ئـەوەش چاك بزانن هەتا مابم و بمێنم گەردەنی ئێوە و بابە گەورەی هەرگیز ئازاد ناکەم و ناتان بەخشم.

بابە سەری بەردابۆوە و هیچی نەدەگوت و دەبیرو خەیاڵانەوە چوو بوو. دایکم بە کوڵ دەگریا و بەناڵە یەکەوە گوتی:

- باشە تۆ چۆن ئەو هـەموو ماوەیـە ئـەو ئـێش و ئـازارو ڕەنجەشـت کێـشاوەو قـسەشت نەکردووە؟ ئەوە ئێستا بزانم بۆ تا دەهات ڕۆژ بـە ڕۆژ هـەرکز و لاوازتـر دەبـووی و دەبنیـٚسای دەزانم من و بابت بەرامبەر تۆ و ژیانی تۆ زۆر کەمتەرخـەم بـوو ویـن بـەڵام سـوێندیٚ دەخـۆم کەلێرە بە دواوە هیچ کاتیٚ بە تەنیات جیٚ ناهێڵم، ئێستاش نەچـووە بـچیٚ و درەنـگ نـەبووە، غەمیٚ مەخۆ هەستە بچۆوە ژوورەکەی جارانت و هێندێك وەحەسیٚ و ئیشەکانی دی بـۆ بابـت لێگەڕیٚ. چەند ڕۆژێك بەسەر ڕۆیشتنیٚ مـن وهاتنـەوێم بـۆ ماڵـیٚ بـابم کەچـی محەمـەد هـەر مێشیشی لیٚ میوان نەبوو و هیچ هەنگاوێکی ئاشتبوونەوێی نەنا. چەند جاران بابم چوو بوو تا بیدوێنیٚ و قسەی دەگەڵ بکات بەڵام چ جارانی نەدیبۆوە و وەك بڵێی بووبێتـە دڵۆپـە ئاوێـك و عەرد قووتی دابیٚ.

دایکم دەیگوت:

- کچەکەم دەنێو بنەماڵەی مەدا وا باوە کە ژن بە جلی بووکێنییەوە دەچتە ماڵە مێـردی و هەر بەکفنی سپییەوەش لـە ماڵـە مێـردی دێتـە دەرێ، ژن نابـێ لەسـەر هـەموو نـاکۆکی و کێشمەکێشێکی لە ماڵ و حاڵ و ژیانی خۆی بتۆرێ، ئێستا ئیدی ئەو ژیانە هەر تەنیا ئی تـۆو محەممەدی نیە بەڵکە ئەو کۆرپەی دەزگیشتدایە ئەویش مافی ژیانی دەگەڵ دایك و بابیدا هەیە و هەقی بەسەرتانەوە یەو خواش هەڵناگرێ لەبەر خۆتان ئەو هەقەی لـەو منداڵـە بـێ گوناهـەی بستێننەوە. محەممەد ناڵێ ئەو ژنەی دێنێ ئەدی کوا؟ ئەدی بۆ نایهێنێ؟ ئەگەر ئەو راسـتدەکات ئەدی بۆ نایە تۆ تەڵاقدا؟ ئەوە نزیکەی پازدە رۆژە تۆلێرەی ئەدی بۆ ئەو تا ئێستا هەنگاوێکی نەناوە؟

وبابەکە بەسەر قسەکانی دایکەکەی پشت راست دەکردەوە بـەڵام مـن دوو دڵـی قـسەکانی دایکم بووم راستبن و یا ئەوەی کە محەممەد بەڕاستی نیازی جودابوونەوەی لـە مـن هـەبێ ئیـدی ئەوەم بە یەکجاری لەلا سـاغ بۆوە کە مەبەستی محەممەدی لەو هەمووئێش و ڕەنج و ئازاردانـەی من تەنیا هەر ئەوەیە کەسوکارەکەم ناچارکا موغازەکەی بەناو کەین.

نزیك نیوەڕۆی حەڤدەهەمین رۆژی مانگی زستانێ بوو کـەزەنگی دەرکـی حەسـارێ لێیـدا، سالار رایکردە حەسارێ و دەرکەی کردەوە و دوای چەند دقیقێکانی بانگی دایکەی کرد. دایکە سەرپۆشی بەسەری دادا و چـووە بـەر دەرکـی حەسـارێ. دوای چـەند دەقیقێکـان دایکـە بـە ڕەنگێکی پەڕیوەوە هاتەوە نێو ماڵێ ئەو نامەیەی پۆستەچی هێنـا بـووی دایـە دەسـت بـابم. ئاگاداریە دادگای بوو کەمنیان بۆ دادگای پێ داواکرد بوو، تەواوی دنیام بەسەردا ڕما. محەممەد شکایەتی لەمن و ئەحمەدی کرد بوو کە ئێمە هەردووکمان پەیوەندی ناڕەوامان دەگەڵ یـەکتردا هەیە و بەگوێرەی بڕیارێکی پێشتر کە دەگەڵ ئەحمـەدی دراوە، مـن دەگـەڵ محەممـەدیم شـەڕ و هەرابووە و لە ماڵێ چوومەتە دەرێ. بابە دوای خوێندنەوەی راگەیاندنەکە زۆر بەسەختی لەرزی و لە تووڕەییان و لەرقان ددانی دەچیرەوە دەبردن و لەبن لێوانەوە دەیگرماند. سەرنجێکم دایـە ڕەنگە پەڕیوەکەی روخساری دایکم و پشتاو پشت کشامەوە و پاڵم وە دیواریەوە دا. دنیـام لـە پێش چاوان تاریك و نووتەك بوو و ئیدی ئاگام لە هیچ نەما.

کاتێ کە وەئاگاهاتمەوە و چاوم هەڵێنانەوە بابم سـەری دەنـاو دەسـتەکانی خـۆی گرتبـوو و بەسپایی لە دەمووچاوی دەدام. دایکم لەسـەر و رووی خۆی دەدا و دەیزریکاند، فرمێسك بەچاوە پیاوانەکەی بابمدا هاتبوونە خوارێ و بەئارامی دەیگوت:

سویند بەو خودایەی هەر کارێکی لە دەستم بێ بۆت دەکەم هەر ئەوەندە تۆ بڵێ تا من بۆت ئەنجام بدەم.

بە گریانەوە گوتم:

- بابە من شتە لە دەست چووەکانم لە تۆ دەوێتەوە شتی ئەو رۆژە خۆش و شادیە بێ ئاگاییانەی هەمبوون برۆ و ئەوانەم بۆ لە بابە گەورەی بستێنەوە.

بابە منی بەسینگی خۆیەوە گوشی و بەکوڵ گریا و بەدەم گریانێشەوە هەر دەیگوت:

- من و بابە گەورە تەنیا و تەنیا هەر ئارەزووی بەختەوەری و خۆشی تۆمان دەکرد، باوەڕکە.

ئەو ماڵە پڕ هەیباهووە جەنجاڵە ببووە پرسە و ماتەم. هەریەکە بەدوای کونجێکی چۆڵدا دەگەڕا تا لە خەڵوەتگای خۆیدا بەگریانێ غەم و کەسەرە دڵ پڕووکێنەکانی خۆی دامرکێنێتەوە.

دایك وباب لەحەزمەتی چارە ڕەشیە جگەر گۆشەکەیان کە بۆ خۆیان هۆی راستەقینەی بوون فرمێسکیان دادەباراند. راحیلە کە تازە سەروەختی شۆڕو شادی و جموجۆڵی بوو لەبەر غەمە گیان پڕوکێنەکەی خوشکی فرمێسکی دەڕشت و منیش بۆ چارەنووسی ئەو منداڵەی دەزگمدا بوو غەمبار بووم.

سالاریش ئیدی دەستی لەبزۆزی و جەنجاڵی و شەیتانییە هەڵگرتبوو و بە زۆری لەلایەکی ژوورێوە بێ دەنگ و سەنگ یاری بە ئوتۆمبێلۆکەکانی دەکرد، جاری وابوو کە دایکەی بەچاوی گریانەوە دەدیت خۆی داویشتە کۆش و باوەشیەوە و بەچاوە جوانەکانی بەنیگەرانیەکەوە دەیڕوانیە دەموچاوە غەماوییەکەی دایکە و ئەوانیدی.

تا لە رۆژی دادگا نزیکتر دەبووینەوە من دڵە خوتە و غەمەکانم زۆر تر دەبوون.

ترسی ئابروو چوونێ منیان هێنابووە نزیکی شێت بوونێ. نەمدەزانی دەبێ چبکەم و چۆنا وچۆن چاوم لەبەر ملوك خانمێ و ئیبراهیم ئاغای هەڵێنم، چوونی من بۆ ماڵێ وان وایکرد ئەوانیش ئابروویان لەکەدار بێ. ئەو پیاوە چەند پیس وبێ شەرم و ئابڕوو بوو کە ئامادە بوو تۆمەتێکی ئاوا وەپاڵ خوارزاکەی خۆی بدا؟ ئەوە منی خۆش نەدەویست و لەبیانوویێکی دەگەڕا تاله من جودا بێتەوە، ئەدی ئەحمەد دەو نێوەیدا گوناهی چبوو؟ ئەدی گوناهی ملوك خانم و ئیبراهیم ئاغای کە هەوڵیان دەدا پێکمان بێننەوە و ئاشتمان کەنەوە چبوو کە مۆری ناپاکییەی بەکوڕە ئازیزەکەیانەوە لکاندبوو؟

دواییەکـەی ئـەو رۆژە دیـاریکراوە هـەر هـات. مـن دەگـەڵ دایـك و بابـدا لـە دادگـای ئامادەبووین. محەممەدیش بە تەنیا هاتبوو و وچەند مەترێك بەو لاوەتـرەوە وەسـتابوو. سـەرەی دادگاییەمە هاتبوو و ئێمەیان بانگ کردە دانیشتنیّ دادگایە. هەر لە چـوونە ژوورەوێـوە مـن شێتانە دەگریام. لەبەردەمی قازیم سوێند خوارد کە قسەکانی محەممەد درۆیە و راسـتیە بەسـەر هاتەکەم گێڕایەوە بەڵام نەشاهیدێکم هەبوو نەبەڵگەیەك.

دادگا ئەحمەدیشی هێنابوو و من بە دیتنیّ ئەحمەدی دەگەڵ دایك و بابیدا ئەوەندەی دیکەم کوڵی گریانیّ هەستا و هەرلەبەردەمی قـازیش داوای لێبـووردنم لیّ کـردن کەچـوومەتە مـاڵی ئەوان و بوومەتە هۆی ناو زڕانی کوڕەکەیان. قازی داوای لە محەممەدی کرد تـا قـسەکانی خـۆی بکا و محەممەدیش بە تەواوی بیّ شەرمیەوە گوتی:

- جەنابی قازی ماوەیەکە ئەو ژنە دەگەڵ خوارزایەکەمدا پەیوەندییـەکی نارەوایـان هەیـە. ئەو شەوەش بە گوێرەی بڕیارێکی پێش وەختە کردیە هـەراو زەنـا و شـەڕو ناخۆشـی، چـەندی هەوڵم دا نەهێڵم بچتە دەری ماڵیّ نەمتوانی وئیدی دەستم لیّ هەڵێنا و کەوتمە لێـدانی هـەر بۆ ئەوەی رێی دەرێی لیّ بگرم. نەهێڵم ماڵیّ بەجیّ بێڵیّ بەڵام دیسانەوەش هەر نـەمتوانی و لە ماڵیّ چووە دەریّ و ئەوەی منیش تێیگەیشتووم شەویّ دەگەڵ خوارزایەکەمدا بووە و پێکەوە شەویان رۆژ کردۆتەوە.

ئەحمەد خۆی پیّ رانەگیرا و لەجێی خۆیەوە هەستاو هاواری کرد:

- بەسیەتی خاڵە، تەریق بەرەوە و شەرم بتگریّ، کەمتر درۆیان بکە.

قازی داوای لە ئەحمەدی کرد تابێتە جێیە تایبەتییەکەی راوەستانیّ. ئەحمەد مەسـەلە کـان چۆن بوون وچۆنیان روودابوو وەکو خۆی گێڕانەوە و لە دواییشدا گوتی:

- ئەمین برادەرم و ماڵەوەشیان هەموو شاهیدن کەم تا درەنگانێکی شەویّ لە ماڵی ئـەوان سەعیم کردووە و کـاتێکیش کـەمن تووشـی خـاڵۆژنم بـووم لـە سـەرجادەی سـەرگەردان بـوو ئەمنییشم هەر لەگەڵ بوو و شاهیدە.

ئیبراهیم ئاغا لەجێی خۆیەوە هەستا و رووی کردە قازی و گوتی:

- ئەگەر رێم بدەن، جەنابی قازی من بۆتان دەسەلمێنم کە ئـەم خاتوونـە و کوڕەکـەی مـن راستیە دەڵێن. و ئەو کەسەی کە پەیوەندی نارەوا و نا بەجێی دەگەڵ ژنە خاوەن ماڵەیدا هەیـە ئەوە ئەم پیاوەیە.

بە پەنجە ئاماژەی بۆ محەممەدی کرد و بە قیژەوە تێی روانــی. محەممەد لــە جێــوە راپــەڕی و هاواری کرد:

- سەیرکە جەنابی قازی، باوکێك کە پەردە پۆشیە بۆ کوڕەکەی دەکات و ئیشە چەوتەکانی بۆ راستدەکاتەوە کوڕەکەی ئەو جۆرە ناماقوولیانەی لێ دەوەشێتەوە.

ملوك خانم لە جێوە راستبۆوە و هاواری کرد:

- بیبڕەوە پیسابییە زارت بگرە، ناماقوولیە دەکەی کە لەکەی ئەنگ و شوورەییە بەو ژنە نەجیب و پاکەت و بەو کوڕە لە گوڵ خاوێنترەمەوە بنێی!

قازی داوای بێدەنگیەی لە ئامادەبووانی دادگایە کرد. بە یارمــەتی قــازی ئیــبراهیم ئاغــا چەندین کەسی هاوسێیەکانی ماڵێ موحتەرەمی کە دەنگی شەڕ و هەرای من و محەممەدیان گوێ لێ بووە و ئاگایان لەو هەموو پارانەوانەی من بووە لە محەممەدی کە داوام لێ کردووە دەرگاکــەم لێ بکاتەوە هەمووی دەگەڵە خۆیدا هێنابوونە دادگایــە. بــە شــاهێدیە هــەموو ئەوانــە قــازی فەرمانی بێ گوناهیە من و ئەحمەدی دا و بەمن و ئەحمەدیشی گوت:

- لەبەر ئەوەی بێ گوناهی ئێوە ســەلما مــافی راســتەقینەی ئێوەشــە کــە بــۆ گێڕانــەوەی ئیعتیباری خۆتان داوا لەو کابرایەی بکەنەوە و شــکات بکــەن و ئەگــەر واشــبکەن ئــەوا ئــەو تۆمەتبار دەبێ و دەچێتە زیندانێوە.

سەیرێکی دەموچاوی دایك و بابەم کرد و پێش ئەوەی قسەبکەم بابە گوتی:

- نا جەنابی قازی ئێمە هیچ شکایەتێکمان لەو نیە تەنیا هیوامان ئەوەیە کە ئەو بــەخۆی دابێتەوە و هەڵەکانی خۆی چاك کاتەوە.

قازی بەمحەممەدی گوت:

ژن و کەسوکارەکانی تۆ ئەوەندە مرۆڤن بەڵام تۆ لە بەرامبەر ئەواندا...

قازی بە داخێکەوە سەرێکی لەقاندو درێژەی نەدایە.

دوای ساتێك بێدەنگی قازی رووی دە ئەحمەدی کردەوە و گوتی:

- ئێوەش ئەگەر شکایەتێکتان لەو ئاغایەی هەبێت دەتوانن ڕادەستی دادگای کەن.

ئەحمەد سەرنجێکی پڕ بە زەبییانەی دایە محەممەدی و سەرێکی بادا و گوتی:

- نەخێر جەنابی قازی، دەبێ هەموو کەسێکی بە ئەندازەی هەست و ئەست و تێگەیشتنێی هەڵسەنگێنی، کەسێك کە هەست و ئەستی نەبوو شکایەت و شکایەتکاریش ناهێنێ، من خۆم بەشتی ئەواوە ماندوو ناکەم.

ئەوجا قازی گوتی:

- دەگەڵ ئەوەی کە داوا کراوان هیچ داوایەکیان لەسەر تۆ نیە بە فەرمانی دادگا ئێوە لەسەرتان پێویستە بە زووترین کات لەو گەڕەکەی بگوازنەوەو ئیدی بۆتان نیە پێ دەو گەڕەکەی نێنەوە و هەروەهاش بۆتان نیە و بە هیچ شێوەیەك هیچ جۆرە لێدان و جنێو و قسەی سووك و ناشیرین دەگەڵ هاوسەرەکەتان بەکاربێنن و ئەگەر واتان نەکرد ئەوە هاوسەرەکەتان بۆی هەیە شکاتتان لێ بکاو ئەو دەمی دەکەونە زیندانێوە.

دوایەش کۆتایی دانیشتنەکەی دادگای ڕاگەیاند. دوای تەواو بوونی دانیشتنەکەش باب و دایکم سوپاسێکی زۆری ئیبراهیم ئاغا و ملوك خانمێیان کرد. محەممەد مات و سەر کزەڵە لەلایەکیەوە بێدەنگ ڕاوەستابوو و دەنوختەیەکیەوە ڕاما بوو. بەو هەموو هەوڵ و تەقەللا و کۆششەیەوە هەر دۆرابوو و هەر بۆ خۆشی هۆی ئەوە بوو من بیبەمەوە و دەمەیدا نێدا سەرکەوم.

محەممەد کەوتە ڕێ و بە تەنیشت ئێمەدا ڕابرد بێ ئەوەی تەنانەت چاوێك هەڵبڕێ و سەیرێکی ئامادەبووان بکا. ملوك خانم بانگی کردەوە محەممەد ئاوڕی دایەوە دەگەڵ ئاوڕدانەوێیدا تا دەستی هێنا زللەیەکی لەلا ڕوومەتێ دا و گوتی:

- هەر لێرەوە خوشك و برایەتییە من و تۆ تەواو بوو. من ئیدی برایەکم نیە بە ناوی محەممەدیەوە، تۆ تازە بەلای منەوە کەوتوویە چاڵە گوویەوە و دەوێدا خنکاوی و تۆپیوی، چونکە حەیفە بە تۆ بڵێم مردووی. ئەوجا تفێکی کردە عەردی. محەممەد سەیرێکی قووڵی ملوك خانمێی کرد و بێ ئەوەی یەك وشەشی بەسەر زمانی دابێ لە دانیشتنەکەی دادگای چووە دەرێ. لە دادگایەوە چوومەوە ماڵێ بابم، ئیدی حەزم نەدەکرد دەگەڵ محەممەدیدا بژیم، تازە ئیدی محەممەد ئەوەی نەدەهێنا غەمی لێ بخۆی و بۆی بە داخەوە بی.

## (٨)

دوو ڕۆژ پاشتر محەممەدبەخۆ و بە چەپکە گوڵێکی گەورەوە هاتە بەر دەرکێ ماڵە بابم.

بابم نەیهێشت بێتە ژوورێ و هەرچی ناگوترێ پێی گوت و دەرکەشی لێ نەکردەوە بەڵام ئەو هەر وازی نە دەهێنا و دەستی لەسەر زەنگی دەرکەی هەڵ نەدەگرت و بەردەوام هەر لێی دەدا و بە دەنگێکی بەرزیشەوە دەو کۆڵانەیدا داوای لێبووردنی لە من و لە بابم دەکرد. و بێ وچان هاواری دەکرد:

- بەڵێن دەدەم هەموو شتێکی قەرەبوو بکەمەوە. ئیدی بەسە پەیم بە هەموو هەڵەکانی خۆم بردووە و بە خودای سوێند دەخۆم کە ڕابوردووی هەموو قەرەبوو بکەمەوە. ڕەها تکات لێ دەکەم بمبوورە...

هێندەی لە دەرکێ دا و هێندەی لە کۆڵانێوە هاوار کرد تا خەڵکێکی زۆری لێ خڕبوونەوە بەڵام واش بابم دەرکەی هەر لێ نەکردەوە.

بابم لە ڕقان بەگژ عەرد و ئاسماناندا دەچوو و جنێوی دەدان و ددانی دەچیڕەوە دەبردن و ڕەنگی سپی هەڵگەڕابوو. کە دایکم ئاوای دیت چۆوە مەتبەخێ و بە خۆ و بە پەرداغێك قەنداوەوە هاتەوە لای بابم، پەرداغەکەی دایە دەستی و بە زۆری ناچاری کرد هەمووی بخواتەوە.

ئەوە محەممەدیش هەروا لەبەر دەرکێ ڕاوەستاوە و هاوار دەکا:

- ئاغای مولکی تکا دەکەم بهێڵن با دەگەڵ ڕەهایدا بژیم، ڕەها بەڵێن دەدەم هەرچی هەڵەکانی پێشوومە هەمووان قەرەبووکەمەوە, تەنانەت ئامادەم هەموو ئەوانەت بە نووسین بۆ بنووسم...

بەڵام بابم هەر لەسەر قسەی خۆی بوو و نەیهێشت بێتە ژوورێ. محەممەد چەندین سەعاتان هەروا لە پشت دەرکێ ڕاوەستا بوو و دەپاڕایەوە کە زانیشی پاڕانەوەکانی دادی نادەن و بێ سوودە، لەو ڕێیەی لێوەی هاتبوو گەڕایەوە. بەیانی و دوو بەیانیەکەی ئەو ڕۆژەش ئیشی هەر

ـ بێتەوە پشت دەرکی ماڵێ و بەداد و هاوار و بڕۆوە داوا لە من و بابم بکا بیبەخشین.
. . م بابم تا دەهات کەللە ڕەقتر و تووڕەتر دەبوو. ڕاست (دە) ڕۆژی تەواو محەممەد ئەوە کاری بوو هەر لەپشت دەرکێوە ڕاوەستێ و بپاڕێتەوە. دە ماوەی ئەو (دە) ڕۆژەشدا بابم وازی لەهەموو ئیشەکانی خۆی هێنابوو و هەر لە ماڵێ بوو تا نەکا محەممەد ئاڵۆزو بلۆزییەکی بکا. ڕۆژی یازدەهەم بە ناوبژیوانیە دراوسێ بێ ئاگا لە هیچەکان، محەممەد هاتە ژوورێ تا چ قسەیەکی هەیە بەمن و بابی بڵێ، بەلام تازە چی، پێشینان گوتوویانە ((تۆبەی گورگ مەرگە)).

❊ ❊ ❊

ڕەها بێدەنگ بوو و ڕەبابە خانم بە پشتە دەستی فرمێسکەکانی سڕینەوە. ڕەها سەیرێکی من و ڕەبابە خانمێی کرد و گوتی:

- لەوەی کە بەگێڕانەوەی ڕابوردووی خۆم و هێنانە ناوەوەی ئەو ڕۆژە پڕ ئێش و ئازار و ڕەنج و ناخۆشیانەم دەو چەند ڕۆژانە دا ئازارم دابن و نارەحەتم کردبن داوای لێبووردنتان لێ دەکەم بەلام چبکەم کەمنیش حەزم نەدەکرد دایك و بابێکی نەزان و بێ بیرو لێکدانەوە ئاوا ببنە هۆی بەدبەختی و چارە ڕەشی کچەکەیان. ڕەبابە خانم لە جێوە هەستا و گوتی:

ئەگەر بفەرموون شتێکی خواردنێتان بۆ بێنم تا هەم ئێوە دەمێك بجووڵێنن و هەم سپێدە خانمیش تاوێك وە حەسێن و پشوویەك بدەن.

هەردووکمان سوپاسی ڕەبابە خانمێمان کرد و ئەویش چۆوە مەتبەخێ.

ڕەها دەموچاوی سوور هەڵگەڕابوو. دەگەڵ ئەوەشدا کە ڕۆژە ناخۆش و نالەبارەکانیش بەسەرچوو بوون و تێپەڕیبوون بەلام یاد و بیرەوەرییەکانیشیان بۆ ئەو هەر ئێش و ئازار و ڕەنج و ناخۆشی بوون و گرژ و تووڕەیان دەکردەوە.

لە عەسرانەی دەستی ڕەبابە خانمێمان خوارد و لەسەر داوای ڕەهاش بۆ پیاسەی لە ماڵێ چووینە دەرێ. لە نزیك ماڵەکەی ڕەهاشەوە پارکێکی تا بڵێی جوان هەبوو و چونکە جێیەکی باشیش بوو بۆ پیاسەی چووینە ئەوێ. لە نزیك شوێنی یاریکردنی منداڵانەوە لەسەر لاتەختێکی دانیشتین و ڕەها سەرنجە پڕ حەسرەتەکانی دەو منداڵانەی لەناو پارکەکە یارییان دەکرد بڕیبوو. هەستم کرد چاوەکانی پڕبوو ون لە فرمێسك. دە دڵی خۆمدا گوتم: یانی دەبێ لە تەواوی ئەو دنیایە پان و پۆڕو هەراوەدا شوێنێك نەبێ ڕەها هەستی دڵنیایی و ئارامی و

ئاسوودەیی تێدا بکات و ئەگەر بۆ ساتێکیش بێ ئێش و ئازار و ناخۆشییەکانی تێدا لەبیر بچێتەوە؟

سەعاتێك لەوێ بە تەنیشت شوێنی یاریی مندالآنەوە بەتەماشای یاری و شەیتانی و هەڵبەز و دابەزی ئەوانەوە دانیشتین، ئەوجا کەوتینە پیاسەی دەپارکێدا. کاتێ هاتینەوە ماڵێ بۆن چێشتی رەبابە خانمێ ئەوەی تێریش بایە برسی دەکرد. رەبابە خانم سفرەیەکی رەنگینی رازاندبۆوە و ئەو سەوزییە تەڕو تازە و ئەو تووره ئەلۆدانە ئەوەندەی دیکەیان سەرمێزەکە گەشاندبۆوە و. رەها بە دیتنێ مێزە رەنگین و. رازاوەکە چەپڵەیەکی لێداو گوتی:

- بەه بەه! هەر بە دیتنێ مێزێکی وا ڕازاوە ئادەمیزاد تێریش بێ برسی دەبێتەوە. دوای نانخواردنی ئێوارێ رەبابە خانم داوای لە رەهای کرد پاشماوەی بەسەرهاتەکە بگێڕێتەوە.

رەها پێکەنی و گوتی:

- وا دیارە کە ئێوە لە سپێدە خانمێ زیاتر بە تاسەی بیستنێ قسەکانی منەوەن بەلآم رەنگە ئەم شەو سپێدە خانم ماندووبێ، ئەگەر یارمەتی هەبێ بەیانی پاشماوەی داستانەکە دەگێڕمەوە.

رەبابە خانم بەتاسەوە سەیرێکی دەموچاوی کردم تابزانێ من دەڵێم چی و چوون منیش بە تاسەوە بووم گوێم لە درێژەی بەسەرهاتەکە بێ گوتم:

- ئەگەر ئێوە ماندوو نەبووبن من ماندوو نیم و ئامادەشم گوێ لە درێژەی بەسەرهاتەکە راگرم.

رەها زەردەیەکی کرد و گوتی:

- ئەویش ئەگەر بفەرموون دوای ئەوەی رەبابە خانم قاوەیەکمان لەقاوە بەناوبانگەکەی خۆی بداتێ بیخۆینەوە ئەودەمی دەکەوینەوە درێژەدانێ بەسەرهاتەکەی. رەبابە خانم وەك منداڵان چاپوکانە لە جێوە قیت بۆوە و گوتی:

- بۆ ئەوەی کە ئێوەش بیانووتان نەمێنێ هەر ئێستا قاوەکەی لێ دەنێم.

من و رەها هەردووکمان لەقاقای پێکەنینمان دا و رەبابە خانمیش چووە مەتبەخێ قاوەی لێ بنێ. رەها هەروا کە چاوی بەدوای رەبابە خانمێوە بوو گوتی:

- نازانی چ ژنێکی دڵسۆزە هەروەك دایکێك ئاگادارییەم دەکات و چاوی لێمەو بە قسەی خۆشی وەك دەڵێ ئەگەر خوداوەند منداڵێکیشی نەداوەتێ لەجیاتیان منی داوەتێ. ئەویش دە ژیانی خۆیدا زۆری رەنج کێشاوە و دیارە هەر ئەوەشە کەمن ئاوا بە باشی دەرك دەکا چونکە دیارە پێك دەچین. خراپ نیە ئەگەر رۆژێکیش دانیشین و گوێ لەویش بگرین.

لە دە دەقیقێکان کەمتری قاوەکە ئامادەکرد و هاتەوە گەلیّ. دوای قاوە خواردنـەوێ رەهـا هەروەك بەلّێنی بە رەبابە خانمیّ دابوو دەستی بە گێڕانەوەی درێژەی باسـەکەی کردەوە.

* * *

هیچ ئاەزوویەکی ژیانێکی تازەم دەگەڵ محەممەدیدا نەبوو، هەر نیگەرانی ئەو منداڵەی بـووم دەزگمدابوو، تەنیا دڵە خوتەی ئەو و ژیانی ئایندەی وی بووم. نەمدەزانی چـبکەم لەلایەکیـەوە ژیان دەگەڵ محەممەدیدا هەمووی دەرد و ئازار و ناخۆشی بوو و لەلایـەکی دیـشەوە ئـەدی ئـەو منداڵەی چ لێبکەم کە دەزگمدایە و سەرەنجامی بە چ دەگا؟

تەواوی ئەو قسانەی محەممدیش دەیکردن هەر هەمووی بۆنی درۆ ودووڕوویییان لێوە دەهـات هەروەك لە پێشینانیشەوە گوتوویانە، قسەیەك لەدڵەوە بێت دەچـێتە نێـو دڵانـەوە جـا لەبـەر ئەوەی قسەکانی محەممەدی هەمووی درۆ و دەلەسەو فێڵ و تەڵەکەبازی بوون تۆزقاڵێك بـە دڵـی من و بابمەوە نەدەنووساو شوێنەوارێکی نەبوو. هەموو لە هـەمووومان وەکـو یـەك سـووربووین لەسەر جودابوونەوێ و کۆتایی هێنانی یەکجارەکی بەژیانی هاوبەشیمان.

ناڵەو هاوار و پاڕانەوەی محەممەدی نەیانتوانی لەبڕیارەکەی خۆمم پاشگەزکەنەوە هـەر بۆیـە بە هاریکارییە بابم بە دوای وەرگرتنەوەی تەڵاقەکەمدا کەوتمە هەوڵدان و بەدواداچوونێ و دوای ماوەیەك لە محەممەدی جودا بوومەوە. لە رۆژی دادگایە محەممەد ئامادە نەبوو و لەبەر ئەوەش کە دادگا چەند جارێکی دیشی داوا کردبوو ئامادەی دادگا بێـت و ئـەو هـەر نـەهاتبوو بـەبێ وی تەڵاقەکەم وەرگرت.

دوای جودا بوونەوەم لە محەممەدی هەناسـەیەکی قووڵی ئاسوودەیییەم هەڵکێـشا.وامـدەزانی تازە لە دایکی خۆم بوومەتەوە بەڵام هەر چەند جارێکیش چاوم بـە زگـە هەڵپۆزیوەکـەی خـۆم دەکەوت هەرچی ئۆقرە و ئارامیێکی کەبووم نەدەما و یەکسەر دەبوونە تـۆف و زریـانێکی دڵـە ڕاوکە و ترس و لەرزو نیگەرانی.

کە بابم حاڵ و باڵی گۆڕاو و شێواوی منی وادیت بۆ ماوەی سێ هـەفتانی دەگـەڵ دایکمـدا ناردینە ئەو ویبەللایەی باکوور تا بەڵکە مێشکم برێك بێتـەوە سـەر خـۆ و بحەسـێتەوە. دوای تەواو بوونی سێ هەفتەکەش هەروا بەگیانێکی ماندوو و ئاڵۆزەوە هاتینـەوە تارانـێ. دایـك و بابم هەر چییەکیان لە دەست هاتبایە بۆ دەرهێنان و دوور خستنەوەی مـن لـەو بـارو دۆخـەی درێغیان نە دەکرد و دەیانکرد بەڵام هەموو هەوڵەکانیان بەفێرۆ و بێ سـوود بـوو دەگـەڵ ئـەو

گیانە تێکشکاوەی مندا. هەموو رۆژەکانم هەر بە چاوەروانییە هاتنـە دنیـای کۆرپەکەمـەوە بەسەر دەبرد و تاسەی دیتنی کۆرپەکەم چارەنووسی منی بەژیانەوە خۆشەویست و گەرموگورتر دەکردەوە.

رۆژێکیان دوای نیوەڕۆیە تازە لە خەوی پاش نوێژان هەستا بووم کە زەنگی دەرکـێ لێیـدا. لە پەنجەرەی ژوورێمڕا تەماشا نێو حەسارێ کرد تا بزانم کێ لە پشت دەرکێوەیە. هەمدیس بـۆ جاری دووەم دەنگی زەنگی دەرکێ لێدرایەوە. بەڵام نە دایکم و نەسـالار بۆ دەرکە کردنـەوێ لـە ماڵێ نەهاتنە دەرێ. لە ژوورێ هاتمە دەرێ و بانگی دایکم و سالارم کرد:

- دایکە، سالار، لە دەرکەی دەدەن ئەوە بۆ کەس ناچێ دەرکەی بکاتـەوە؟ کـەس وەڵامـی نەدایەوە. بێدەنگییەگی گران ئاسمانی ماڵەکەی داگرتبوو. زانیم کەس لـە ماڵـێ نیـە چـوومە حەسارێ دەرکێ بکەمەوە. پێموابوو یا دایکمە یا سالارە لەپشت دەرکێن دوای دەرگا کردنەوێ لە پڕ هەموو لەشم یەکپارچە گڕی گرت. بۆ ساتە وەختێك سەرنجەکانمان لێکیان دا و هەمدیس جارێکی تریش دوو پات بووەوە. هەردووکمان سەرنجەکانمان لە یەکتر دزینەوە. بەڵێ ئومێد بـوو لەبەر دەرکێ راوەستا بوو و بە چاوێکی پڕ لە حەسـرەتەوە سـەیری دەکـردم. ئومێـد چـاوێکی بەزگە هەڵپۆزیوەکەمدا خشاند.

بەڵام هەر دەستبەجێ سەرنجەکەی لادا و سڵاوی کرد.

بەدەستە پاچەییەوە هەردوولامان سڵاوو ئەحواڵپرسـییەکی سـەرپێیانەمان کـرد و ئومێـد کارتێکی بووکێنیەی بۆ راداشتم و بە دەنگێکی لەرزۆکەوە گوتی:

- هیوادارم ئێوە و ماڵەوەتان تەشریف بێنن و خۆشحاڵمان کەن.

بەدەستێکی لەرزۆکەوە کارتی بووکێنیەکەم لە ئومێدی وەرگرت و گوتم:

- پیرۆزە ئیشاڵڵا ئەوە کارتی بووکێنیە کێیە؟

ئومێد رووی بەلای کۆڵانێدا وەرگێڕا و بە دەنگێکی هەنیسکاوییەوە گوتی:

- کە کارتە کەت کردەوە تێیدەگەی. خودا حافیز.

بەر لەوەی قسەیەك بکەم ئومێد بە پەلە لەبەر دەرکـێ دوورکەوتـەوە و رۆیـی. بـەڵام لـە دوایین ساتدا کە کارتەکەی دایە دەستم چاوەکانی تەڕ کرد بوو کە ئەوەش منی لـە جێـی خـۆم وشك کرد.

ئومێد رۆیشت و منیش لە دواوە سەیری دوور کەوتنەوەکەیم دەکرد. هەڵوێستەیەکی کرد و ئاورێکی لێ دامەوەتا قسێکی بکا. بەڵام وەك بڵێی پەشیمان بوو بێتەوە دووبارە کەوتەوە رێ.

سەیرێکی کارتەکەم کرد بە خوێندنەوەی ناوی زاوای بێ ئیختیار فرمێسکم بە چاواندا هاتنە خوارێ. بەڵێ کارتی بووکێنیە و زاوایەتییە خۆی بوو. چوومەوە حەسارێ و دەرکەم داخستەوە و پاڵم وە دیواریەوەدا. کارتەکەم بەسینگی خۆمەوە گوشی و فرمێسکم دابارانەوە، هێشتاش هەر عاشقی وی بووم، لە دڵەوە هاوارم کرد:

- ئومێد، من کە رووبەکی بەختەوەری و خۆشیەم نەدیت بەڵام لە کرۆك و ناخی دڵمەوە ناواتە خوازم تۆ خۆشبەخت و شاد و کامەران بیت.

بەدەنگی بادانێ کلیلی ناو قفڵی دەرکەی لە دەرکێ کشامەوە. دوای دەرکە کردنەوێ رەیحانە هاتە حەسارێوە. ریحانە بە دیتنێ چاوە فرمێسکاوییەکانم پرسی:

- چبووە رەها، چ قەوماوە؟

بە پەلە فرمێسکەکانم سڕینەوە و وەڵامم دایەوە:

- نا، پێش هاتنەوەت ئومێد لێرە بوو.

رەیحانە سەرێکی بادا و گوتی:

- بەڵێ، دیتم، هاتبووە ئێرە؟

خێرا فرمێسکەکانم سڕینەوە و وەڵامم دایەوە:

- بەڵێ کارتی بووك و زاوایەتییەی هێنابوو. نازانم بۆ هەر بە دیتنێ کارتی بووك و زاوایەتییە ئومێدی بێ ئیختیار بووکێنیە خۆمم وەبیرهاتەوە.

رەیحانە بە ئاوازێکی دڵسۆزانەوە گوتی:

- خوشکە باشەکەم، ئەوەی رۆیی، رۆیی، تازە غەم و حەسرەت و ئەفسوس خواردن بەکەڵکی چی دێ... بەڵام زگم بە ئومێدی دەسووتێ، دیارە دواییەکەی هەر ناچار بوو مل بۆ ویستی باوکی شۆڕکا؟

بەسەر سامییەوە پرسیم:

- بۆ؟ مەگەر ئومێد چی لێ قەوماوە؟ بۆ مەگەر ئەو نیازی ژن هێنانێی نەبوو؟

رەیحانە دەستی گرتم و گوتی:

- وەرە بابچینە سەر پلیکانەکان دانیشین تا بۆت باس کەم.

بە بیستنێ ئەوەی کە ئومێدیش تووشی ژن هێنانی ناچاری بووە غەم لێوانلێوی دڵی داگرتم. هەر بۆ ئەوەی زووتریش لە بەسەرهاتەکە ئاگاداربم بە پەلە وە دووی رەیحانەی کەوتم و لەسەر پلیکانەکان بە تەکیەوە دانیشتم و بەتاسەوەچاوم دەدەمیەوە بڕی.

ڕەیحانە زەردەیەکی کرد و گوتی:

بە نەزانیە کاری بابە گەورەی، هەم تۆ و هەم ئومێدیش ژیانتان لـە کـیس چـوو. ڕاسـتیت دەوێ باب و دایکم هەردووکیان ئەم مەسـەلە و باسـەیان لە تۆشاردەوە نەوەکو نارەحەت بیـت و بتۆرێی.

ڕەیحانە سەرنجێکی ورد و قووڵی دامێ و پرسی:

- بەڵێن دەدەی لەوەی کەدەیبیسی نارەحەت نابی؟

بەبێ حەوسەڵەییەوە وەڵامم دایەوە:

- دەی، دەخێراکە قسەکەت بکە بزانم دەڵێی چی!

ڕەیحانە تەماشایەکی پڕ بەزەییانەی کردم و گوتی:

- بەڵام تاگفت و بەڵێن نەدەی هیچم لێ نابیسی.

بەنیشانەی ڕازیبوونێم سەرێك بادا و گوتم:

- بەڵێن دەدەم، دەی قسان بکە ئیدی نیوە گیانت کردم.

ڕەیحانە هەناسێکی قووڵی هەڵکێشا و گوتی:

- نازانم بەوەی کە ئەوەت پێ دەڵێم کارێکی چاك دەکەم یانە نـا، بـەڵام هـەقی ڕاسـتەکی خۆشتە ئاگاداری هەموو شتێکیش بی.

ڕەیحانە هەڵوێستەیەکی کرد و بەردەوام بۆوە:

- دوای دەزگیرانیە تۆ، بابی ئومێدی کە ئاگای لەو دەزگیرانیەی تۆ نابێ، داوای تۆ لە بابم دەکاتەوە بەڵام بابم پێی دەڵێ کە چەند ڕۆژێکە ڕەها بە دەزگیران چووە.

بابی ئومێدی کە گوێی لەو قسەی دەبێت دەگەڵ بابەیدا لێیان دەبێتە دەمـەقاڵێ وبەبابـەی دەڵێ خۆ ئێوە بە چاکیتان ئاگا لە پەیوەندییە ئومێـد و ڕەهـای بـوو و تەنانـەت بـە ئێوەشـم گوتبوو کە ڕەها بووکی خۆمە و داواشم کرد تا بە فەرمی بێمە خوازبێنیەی بەڵام ئێوە گوتتـان ئێستا کاتی تاقیکردنەوەکانی ڕەهایە و حەزناکەین بیرو هۆشی مژوول کەین. ئەدی بۆ بـەمنت نەگوت تا ڕەها خوێندنەکەی تەواو نەکات ئێمە بە مێردی نادەین ودەبێ تا ئەو کاتی ڕاوەستن، کەچی بەمیردیشتان دا. کە دەشتانزانی ئومێد و ڕەها پەیوەندییان هەیە و ئێمەش هـەر لەبـەر ئەوەی کە ڕەها خاتوون هێشتا خوێندنەکەی تەواو نەکردووە و لەسەر داوای ئێوەش بڕیارمان دا تاهاوینێ ڕاوەستین، کەچی ئێستا ئەوە چ دەبیسم؟ ڕەهاتان بە مێرد داوە! و بەدەزگیران چـووە؟ بەلای ئێوەوە دەبێ چ وەڵامێکی ئومێدی بدەینەوە؟

بابیشم کە بە هەقی وی دەزانی دە وەلامی ویدا گوتبووی:
- بەخودای من و خێزانم بێ گوناهین. ئەوە بابم بوو رەهای بەمێرد دا و بەڵێنی دابووە زاوایەکەم دەنا تەنانەت رەها بۆ خۆشی بەو مێرد کردنەی رازی نیە و نەبووە.
دوای ئەوەی کە بابی ئومێدی بەوەی دەزانێ تۆ بەو مێردکردنەی رازی نەبوو ویت و تۆیان بە زۆر بەمێرد داوی دووبارە دەمەقاڵییەکی تەواویان لێ پەیدا دەبێتەوە.
هەناسێکم هەڵکێشاو بە داخێکەوە گوتم:
- بەڵام چ سوود کە ئەو درەنگی خوازبێنیە تازەکە وەبیرهاتبۆوە. ئەگەر ئەو چەند رۆژێک زووتر منی لە بابم خوازتبایە تووشی ئەو هەموو دەردەسەری و ناخۆشیانە نەدەبووم و ئەو هەموو ئێش و ئازارو دەرد و رەیحانەشم نەدەچێشت. رەیحانە؟ بەڵای تۆوە بۆ خوو وخدە و نەرێت وایە کە هەر دەبێ کوڕ و پیاو بچنە خوازبێنی ژن و کچان؟ ئەدی بۆ ژن و کچانیش ئەو هەقەیان نیە کە بەهەر پیاو وکوڕێکی کە جێ پەسەندیانە خۆشەویستی خۆیانیان بۆ دەربڕن و یا چووزانم ئەوانیش بچنە خوازبێنیە کوڕ وپیاوان؟
رەیحانە بە دەنگێکی بەرزەوە پێکەنی و گوتی:
- دە تۆ بیری لێ بکەوە، ژمارەیەکی زۆر دانیشتوون و کاکی زاوا وەك بووکێ سینی بەدەستەوە دێتە ناو مەجلیسەکەوە بەڕاستی پێکەنین ئاوەرە.
منیش بە بەرجەستەکردنێ دیمەنێکی وا قاقا پێکەنیم بەڵام چونکە باوەڕیشم هەر وابوو کە هەموو کچێك دەبێ هەقی ڕا دەربڕینی خۆی هەبێ و بەسەربەستی بیروبۆچوونەکانی خۆی بڵێ دووبارە گوتم:
- سەیرە چۆن تا ئێستا شتێکی وا نەبووە بەڵام خۆ ئەگەر هەر لە زووەوە بۆ نموونە هەر لەو زەمانەوەی کە خوازبێنیە کچان و ژنان بوو بە باو هەر ئەو دەمیش بە پێچەوانەوە خوازبێنی کوڕو پیاوانیشیان کردبایە باو ئەوڕۆ نیدی بەرجەستە کردنێ ئەو دیمەنانە هێندە سەیرو پێکەنین ئاوەر نەدەبوون.
- رەیحانە بە دەم درێژەی قسەکانیەوە گوتی:
- بابی ئومێدی دوای دەمەقاڵییەکی گەرم بە تووڕەیی لە بابم جیا دەبێتەوە تەنانەت کاتی رۆینێشی خودا حافیزیە لە بابم ناکا و دەڕوا. دوای گواستنەوەی تۆش، دایك و بابی ئومێدی زوری کچی خزم وخوێش و ناسیاو و ئاشنا و رۆشنایان بۆ هەڵدەدەن بەڵام ئەو هەر قبوڵ ناکا تا ئەوەی کەبابی بە ئومێدی دەڵێ، تاکەی هەروا چاو لە دووی رەهای دادەنیشی ئەو تازە مێردی

کردووه و هەر بینە لەو رۆژانەشدا منداڵێکیشی بوو ئیدی نەخۆشت فریو دەو نەحەسرەتیش بەدڵی ئێمەوە بنێ. ئومێد لە وەڵامی بابیدا دەڵێ کە نیازی وایە خوێندنەکەی درێژە پێ بدات بەڵام بابی پێشنیار دەکات ژن بێنێ وئومێیش بە خەیاڵی ئەوەی کە بابی تا دوای تەواو کردنی خوێندنەکەی واز لە بڕیارەکەی دێنێ قبوڵی دەکات بەڵام هەر دوای تەواو کردنێ خوێندنەکەی سەیر دەکات کە بابی هەروا لەسەر قسەی خۆیەتی و تا دێ پێ دادەگرێ و سووره لەسەر گفتی خۆی تا لە دواییدا ئومید رازی دەبێ و قبوڵی دەکا.

ئەوانە هەمووئەو قسانە بوون کە لە پووره (پلك – میمك) فرانکم بیستوون هەر ئەویشە کە باس و خواس و هەواڵان بۆ دایە و بابەی دێنێ.

رەیحانە قسەی دەکردن و ئەمنیش دەگریام. کاتێ کەقسەکانی رەیحانەی تەواووبوون ئەگەر لەبەر خاتری کۆرپەڵەکەم نەبایە خۆم هەر دەکوشت، بەتایبەتی کاتێ کە بیستم ژن هێنانەکەی ئومێدیش هەر نا بەدڵە و لەبەر ئەو بەڵێنەی کە بە بابی داوە ئەو کارەی دەکا.

رەیحانە کە لە تەواوی ڕووداو وبەسەرهاتەکان بێ ئاگابوو زۆر بە دڵسۆزی و گەرموگوڕیەوە نارەزاییە ئومێد و مل نەدانی بۆ ئەو ژن هێنانەی باس دەکرد و دەیگێڕایەوە بەڵام نەشیدەزانی کە دەگەڵ هەر رستەیەکیدا کە دەیگوت خوێیە بە کۆنە برینەکانی منەوە وەردەکا. ئەو بێ پسانەوە قسەی دەکرد و دڵی دەئاوری داویشتم. ئیدی خۆراگرتنێ ئەو ژیانەی بەو هەموو ناخۆشی و نا لەباریانەوەی بۆ من زۆر سەخت و دژواربیوو. لە رەیحانەی جیابوومەوە و وەك شێتان پەنام بردەوە بەر ژوورەکەم دەرگاکەم لەسەر خۆم داخست و لەسەرجێی راکشام و بەکوڵ گریام.

دایکم هاتەوە ماڵێ و لەو گۆڕانەی حاڵی من سەرسام بوو و هاتە پشت دەرکێ و بانگی کردم. بە ناچاری لەسەرجێی راستبوومەوە و دەرکەم کردەوە. دایکم بە دیتنێ فرمێسکەکانم کە بە پانایە دەموچاومدا دەهاتنە خوارێ هەناسەیەکی هەڵکێشا و بە میهرەبانیەوە گوتی:

کچەکەم، ئازیزی دڵم، تۆ هەر خۆت کوشت، تاکەی دەتهەوێ شەو و رۆژت هەروا بە گریانێ بەسەربەری؟ هەر بیرێك لە خۆت و ئەو منداڵەی بکەوە کە لە تۆ زیاتر کەسی دیکەی نیە، ئەو منداڵە بێ گوناهە بۆ دەبێ هەمیشە دەزگتدا هەر ئازار بچێژێ؟ باشە بۆ بەگریانی وەخت و ناوەخت خۆت و ئەو منداڵە بێ گوناهەی ناو زگت وا ئازار دەدەی؟ هەروا کە دەگریام گوتم:

– ئێوە و بابیشم دوو درۆزنی بەڕاستی کارامەن، باشە بۆ بەمنتان نەگوت کە بابی ئومێدی خوازبێنی کردووم؟

دایکم هەناسێکی هەڵکێشاو هاتە ژووریٚ. لەسەر لێوی تەختە بەندەکەی نووستنێم دانیشت و بە ئارامی گوتی:

- دواییەکەی هەرزانیت؟ بە خودای من ئاگادار نەبووم دوای بە دەزگیرانیە محەمەدیت ئەوجا بابت بەمنی گوت و ئەویش ئەو دەمەی بوو کە قسەکانت بە من گوتبوون و منیش چووم بۆ بابتم گێڕانەوە. هەر دووکمان نارەحەت و بە داخەوە بووین بەڵام چ نەدەکرا. کار لەکار ترازا بوو و بە گێڕانەوەشی بۆ تۆ ئەوەندەی دیش دەبووینە مایەی نارەحەتیە تۆ. لەبەر ئەوە من و باوکت هەردووکمان وامان بەباشتر زانی کە هیچ شتێك لەم بارەیەوە بەتۆ نەڵێین. دیسانەوەش دەڵێم کە تۆ و ئومێد چارەتان لێکدی گریٚ نەدرابوو دەنانەگەر وانەبایە ئەرزو ئاسمانیش سەریان لێك دابایە هەردەبوو بۆ یەکتربان و پێکەوەتان زەماوەند کردبایە. واباشترە تازە ئومێدی لەبیرخۆت بەریەوە وبیر لە ژیانی خۆت بکەیتەوە دایکم بەبیٚ گوێدانە هەست و نەستەکانی من لە جێوە هەستا و منی بەکۆڵێك غەم و خەفەتەوە بەتەنیا جیٚ هێشت. چەندین سەعاتان دە ژوورەکەمدا دانیشتم وبیرم کردەوە. ئاگام لە تێپەرینیٚ وەخت و دەم وکاتان نەبوو وەك لە دنیای دەورو بەری خۆم دابڕابم و دە دنیایەکی دیدا بخولێمەوە. کاتیٚ کە ڕەیحانە هاتە ژوورەکەم و بۆ ئاخواردنی ئێوارەی بانگ کردمە سەرمێزیٚ ئەو دەمیم سەر بلند کرد و تەماشایەکی دەرێم کرد. هەوا بە تەواوەتی تاریك ببوو دەو چەند سەعاتانەی کە بەتەنیاش دەگەڵ خودی خۆمدا دەخەڵوەیدا بووم سالاریش نەهاتبووە سۆراغێم و تەنیاییەکەی لیٚ تێك نەدابووم. ڕەنگە هەر دایکم نەیهێشتبیٚ و ویستبێتی دەگەڵ بیرکردنەوەکاندا تەنیابم.

تەواوی ڕۆژەکانی دواتریشم هەربیر لە ئومێد و بووك و زاوایەتییەکەی دەکردەوە. حەزم دەکرد تا زووە ئەو کچە بەختەوەرەی بڕیارە ببێتە هاوسەری ئومێدی ببینم. ئیرەییم پیٚ دەبرد و خۆزگەم پیٚ دەخواست. حەزم دەکرد سەرم لە پێناو دانابایە بەڵام لە جێی وی بام. ڕۆژانە ئومێدم بە تەك بووکە جوانەکەیەوە بەرجەستە دەکرد و بیٚ ئیختیار فرمێسکم لەچاوان دەهاتە خواریٚ.

ڕۆژی زەماوەندی ئومێدی هات و بەپرکێشیە ڕەیحانە و ڕاحیلەی ناچاری ئامادەبوونی زەماوەندەکە بووم. دەستێك جلم هەڵبژارد و هەروا بەبیٚ تاقەتیەوە دەستێکیشم بە سەرو کۆڵی خۆمدا هێنا. جوانترین جلیشم لەبەر سالاری کرد دەگەڵ بابم و دایکم و خوشکەکاندا بەرەو لای زەماوەندی بووکێنیەکەی ئومێدیەوە چووین. لە ڕێیە دایکم دەساتێکی گونجاودا بە پاڕانەوێوە سەری دەبن گوێی نام و گوتی:

- ڕەها گیان، ئەگەر دەزانی هاتنت بۆ زەماوەندەکەی ئومێدی ئازارت دەدات تا بیانووێکی وەبینم و هەر دووکمان بگەڕێینەوە ماڵێ؟

بەسەر بادانێکی وەڵامێکی نەرێیانەم دایەوە و بە حاڵەتێکی تا دارانەوەگوتم:

- نا بەلانی کەمەوە دەمەوێ شاهیدی خۆشبەختیە ئومێدی بم.

دایکم ئیدی قسەی نەکرد و تەنیا بە سەرنجێکی بەزەیی ئامێزەوە وازی هێنا:

چوینە زەماوەندەکەوە هەر دەگەڵ هەنگاوی چوونە ژوورەوێمان دایکی ئومێدی بەپیرمانەوە هات و بە دیتنێ من یەکسەر چاوی پڕبوون لە فرمێسك و بە دەنگێکی بەسۆزەوە بەخێرهاتنی هەموومانی کرد و بەسەرنجە حەسرەتاوییەکانیەوە هەمیشە دەمنیەوە دەڕوانی. لە لایەکیەوە دانیشتم و کەوتمە تەماشاکردنێ میوانان. سالار هەمیشە بە کورسییان هەڵدەگەڕا تا دەستی بگاتە سەر مێزەکە و میوەو شیرینیان هەلگرێ و منی ناچار دەکرد تا تەواوی هۆش و گۆشم بەلای ئەوەوە بێت و هەر خەریکی ئەوبم و ئاگام لێی بێت و دواییەکەی خۆم ڕانەگرت ودەنگم دا و گوتم:

- تۆ ئیدی منداڵ نیت ئاوا وەك منداڵان بزۆزی و شەیتانیان دەکەی!

سەعاتێکمان بەسەرهاتنێدا رادەبرد کەچی هێشتا بووك وزاوا هەر نەهاتبوونە هۆڵێوە. هەموو هەر چاوەڕوانی هاتنی ئەو دوو کۆترە سپییانە بوون. نەمدەتوانی بەرگەی کەش و هەوای زەماوەندەکە بگرم. هەرکە بووك و زاوا دەست لە ناودەست هاتنە ناو هۆلێوە هەموو لە خۆشیان هاواری پیرۆزبێیان لێوە بەرز بۆوە بەڵام من تەنیا یەك شتم دەبیست و ئەویش هاوارێك بوو کە لە قووڵایی بوونمەوە هەڵدەستا:

- بابە، دایە تەنیا ئەوەتان دەویست؟ تەنیا دەتانەویست من دە ڕۆژێکی وادا شاهیدی مەرگی حەزەکانم بم؟ بۆ نەدەبوو من لە جیاتی ئەو کیژە شان بەشانی ئومێدەوە ڕۆیبامایە و وەڵامی دەربڕینی شادییەکانی ئەو خەڵکەم دابایەوە؟ بۆ دەبوو ڕۆژی بووکێنیەم تاڵترین ڕۆژی ژیانم بێ؟ ئەو ڕۆژەی کە هەموو کچ و کوڕێك چاوەڕێی هاتنی دەکەن؟

ئیدی تین و توانای خۆ ڕاگرتنی زەماوەندەکەم نەما. ژانە زگم کردە بیانوو و لەهۆڵەکە چوومە دەرێ. لە حەسارێ لە پێش هەیوانێ ڕاوەستابووم و سەیری ئاسمانم دەکرد. دەدنیای خەیاڵدا خۆم دەجلی بووکێنییەکی سپی و دامەن درێژدا بەتەك ئومێدیەوە دەدیت کە هەردوکمان خۆشحاڵ و شاد وخەندان بەڕووی یەکتردا دەتریقاینەوە و دەست لەناودەست دەستی یەکتری دەچووینە ناوکۆڕی زەماوەندی بووك و زاوابییەمانەوە و بۆ وەڵامدانەوەی دەربڕینی

هەستی ئامادەبوونیش دەستمان هەڵدەتەکاند. نەمزانی چەند دەقوڵاییە دنیای حەزو ئارەزووەکانمدا سەرگەردان و وێڵ و وەیلان بووم کە دەنگێك منی هەڵداشتەوە ناو دنیای تاڵی وسوێری راستەقینەوە. بەتەکانێکی کەدام لە دنیای شیرین هاتمەوە دەرێ و دووبارە خۆم دەدنیای ناخۆشی و نالەبارییەکاندا دیتەوە، بەلای دەنگەکەمدا ئاوڕدایەوە. ئومێد بوو بەرامبەرم ڕاوەستا بوو. دە چاکەت و پانتۆڵێکی تووسیدا ئەوەندەی دی جوانتر و سەرنجڕاکێشترم هاتە بەرچاوان. هەروا بۆ چەند ساتێکی وەك رۆژانی رابردوو دڵم بۆی کەوتەوە پەلە و بەڵام هەروا لە خۆوە و بێ ئاگایانە بەخۆ هاتمەوە و زانیم کە ئەو ئی من نیە و ئی یەکێکی دیکەیە. ئومید نیازی بوو بچێتەوە ناو پیاوان.بە دەنگێکی پیاوانە و پڕلە سۆز و میهرەبانیەوە هەر بەهەمان دەنگە بە ئەدەبەکەی هەمیشەیەوە کەمنی پێ شێت و شەیدا و شیفتەی خۆی دەکرد بەزەردەخەنەیەکەوە کە لە خۆشیان نا بەڵکە لە غەم و خەفەت و ژان و حەسرەتەوەکە هەر بەدەنگی نیوە گریانێك دەچوو گوتی:

- بەخێرهاتی رەها خاتوون.

بەدەنگێکی لەرزۆکەوە گوتم:

- زۆر سوپاس، پیرۆزە ئیشاڵڵا، ئومێدەوارم خۆشبەخت و کامەران بن و هەمیشە هاوبەشی خۆشی و شادیتان بم.

بێ ئیختیار فرمێسکم بە چاواندا هاتە خوارێ و بۆ ئەوەی ئومێدیش نەزانێ دەستبەجێ رووم وەرگێڕا و پشت لەوەوە ڕاوەستام. گەرمی سەرنجەکانیم بە باشی لەسەرپشتم هەست پێدەکرد ئومێد هەنگاوێك هاتە پێشێ و هەروا راوەستاو بە دەنگێکی تەواو لەرزۆکەوە گوتی:

- رەها!

گوتم:

- بەڵێ..، تووبی و ئەو خودایە ئومێداغا ببوورە، مەبەستم نارەحەت کردنێ ئێوە نەبوو.

ئومێد هەناسەیێکی هەڵکێشا و بەدەنگێکی لەرزۆکەوە گوتی:

نۆژداڕوویەکی و دوا بەدوای مەرگی سوهراب هاتی تازە چیت لێبکەم، ئەی دڵ ڕەق خۆزگە، زووتر دەهاتی دەنگی هەنیسك و پرمەی گریانێم بەرز بۆوە. دەستبەجێ دەستم بە دەممەوە گرت و لێوی خۆم گەزی تا دەنگی گریانەکەم زیاتر دەرنەیە. ئومێد بە پەلە لەمن دوورکەوتەوە و بە هەنگاوی خێرا منی بەجێهێشت و چووە ناو پیاوەکان. زانیم کە ئاگای لە تەواوی ژیانمە.

سالار کەبە دەورو بەرمەوە یاری دەکرد بەدەنگی گریانەکەم بەرەولام هاتەوە و قاچەکانی لە باوەش گرتم. دانیشتم و دە ئامێزمێم گرت و دەموچاوە جوانەکەیم ماچکرد.

ئیدی نەمتوانی بچمەوە ناو زەماوەندەکە و خۆم پێ ڕانەدەگیرا سالارم نەسپاردەوە دایکم تا ئاگای لێبێ. لەو ماوەیەی کەلە مالێ بابم بووم سالار بە تەواوەتی ئۆگری من ببوو و گرووی دەگرت تا هەمیشە دەگەڵە خۆمی ببەم ولێم جیا نەبێتەوە. بەڵام من لەبردنەوەی سالاری ملم نەدا و بەپەلە زەماوەندەکەم بەجێهێشت و بەرەو ماڵەوە هاتمەوە. هەرکە گەیمەوە مالێ وەك بڵێی دار ودیواری ماڵێش غەمی لێ ببارێ. ئەوێشم بەلاوە تەنگەبەرو هەوایەکی قورسی هەبوو. بۆ لە خۆ دوورکەوتنەوەم بەرەو لای مالی خاڵمەوە کەوتمە رێ. هەروەك شێتان بەرێیەدا دەرۆیشتم و خۆم بەو خەلکانەدا دەداکە بەلامدا تێدەپەرین. بەگریانەوە دەمگوت:

- دیدتان کە ئەورۆ من مەرگی حەزەکانم بە چاوی خۆم دیت! لە مرۆش بە دواوە دنیا هیچ مانار مەبەستێکی بۆ من تێدا نەماوە.

خەلکی بەسەرنجە پرسیاراوییەکانیانەوە بەرێیان دەکردم. گەیمە مالێ خالم و دەستم بەزەنگی دەرکێوە نا و تا دەرگاشیان نەکردەوە دەستم لەسەر هەلنەگرت. وەك بلێی تۆلەی هەرچی نارەحەتیەکانم هەیە لەزەنگەکەی کەمەوە. خالۆژن بە پەشۆکاوییەکەوە دەرگاکەی کردەوەو هەر هێندەش چاوم بە خالۆژنێ کەوت خۆم دەباوەشێ هاویشت و بەکولێ گریام. خالۆژن دەستێکی بەسەرو پرچی داهێنام و بەسۆزێکەوە پرسی:

- ئەوە چیە ناکا چووبیە زەماوەندەکەی ئومێدی؟

بەسەرسامیەوە سەیرێکم کردێ و گوتم:

- راستە تۆ لە کوێت زانی؟

خالۆژن زەردەخەنەیەکی کرد و بەمیهرەبانیەوە گوتی:

- چەند رۆژێك لەمەوبەر دایکت لێرە بوو باسەکەم لەو بیست. زۆر دەمێکە چاوەرێتم دەمزانی هەر دێی.

دەگەڵ خالۆژنێدا چووینە نێو مالێ. هێندە گریام تا کفت بووم. دوای ئەوەی هێندیك هاتمەوە سەرخۆ تازەم هەست بەیەکێکی غەوارە کرد لە مالێ خالم.

ئاغای کەنعانی برادەری خالم بوو و بەمیوانی هاتبووە مالێ ئەوان. لەبەر وەی کە نەمزانیبوو ئەولەوێیە و بەدەنگی بەرزگریا بووم تەریق بوومەوە و داوای لێبووردنم لەو و لەخاڵ و خالۆژنیشم کرد.

ئاغای کەنعانی پیاوێکی تەمەن نزیکەی چل ساڵانە بوو کە لەلایەنی داراییەوە، گوزەرانێکی زۆر باشی هەبوو. کەنعانی هەروا بەسەرسامیەکەوەی تەماشا دەکردم. کاتێ کە بڕێك هێورتری دیم داوای کرد کەمێك قسەم دەگەڵدا بکات و کە بێدەنگیەمنیشی دیت هاتە پێشەوە و چاك و چۆنی کرد و گوتی:

- ببوورن، من بەبێ ئەوەی ویستبێتم هەموو قسەکانی ئێوەم گوێ لێبوو. بەڵام بەلای منەوە هیچ شتێك دەو دنیایەیدا ئەوەی ناهێنێ کە ئاوا بەو جۆرەی گریە و زاری بۆ بکەی و خۆت ئاوا لاواز پێشان دەی و یا ئاوا خۆتان ئازار دەن. دەژیانی هەموو ئادەمیزادێکیدا ئاریشەی وا دێنە پێشێ کە زۆر ئەستەم و گرانە و هەموو ئادەمیزادێکیش گیروگرفتی هەر هەیە.

هەندێك گیروگرفتی زۆرترە و هەندێکی کەمتر. بەلای تۆوە هەموو ئەوانە دەکرێ شەو و رۆژ دەستەو ئەژنۆ هەر بگریەن و فرمێسکان بەردەنەوە؟ بۆ نموونە یەکێك لەو خاوەن گیروگرفتانە منم. من ئەوە نزیکەی دوازدە ساڵە لە هاوسەرەکەم جیا بوومەتەوە و بەتەنیا دەژیم، ئەوەش بەمانای ئەوەیا کە دەستمان لێك بەردابێ و تەڵاقم دابێ، نەخێر، بەڵکە بە زۆر هۆوە لەوانەش کە من بێ توانایی بەدەنیم هەیە و روونتری بڵێم هاوسەرەکەم ناتوانێ منداڵی لەمن ببێ و ئەو مەسەلەیەش گەورەترین گیروگرفتی ئیمەیە، ئیدی ئەوەی کەلە لایەنی رەوشتیەوە هەر دووکمان دوو جەمسەری جیاوازین و و هەرگیزیش تێك ناگەین هەر بۆ نموونە من رەنگی سەوزم حەز لێیە و پێم جوانە بەڵام هاوسەرەکەم رقی لێیەتی جا بە رێك کەوتنی هەر دوولامان وامان بەباش زانی کە دوور لەیەکتری بژین.

ئاغای کەنعانی زۆری دەربارەی ژیانی خۆی و نارەحەتی و ناخۆشییەکانی ژیانی هاوبەشیەی کە چەشتبووی زۆر دوا و لە رەفتارە ناشایستەکانی هاوسەری و پەیوەندییە لاوازەکەیان هەروا داد و بڕۆی بوو. جالەبەر ئەوەی زۆر لایەنی هاوبەشی دەگەڵەمندا هەبوو هەستم دەکرد بە چاکیم دەرك دەکات و تێم دەگات و ئەوم وەکو غەم رەوێنێکی بۆ خۆم دۆزیەوە. تەواوی ژیانی خۆمم هەر لەسەرەتاوە تا کۆتایی، هەموو لە هەموو بۆ باس کرد. ئەوکاتە هەردوولا هەستمان کرد کە چەند لێکەوە نزیکین و هەردووکمان چ بەڵایەکمان بەرگە گرتووە. زانیم چ ئازارو ناخۆشییەکی هاوبەشمان هەیە و دە زۆر شتانیشدا بیرو باوەڕ و بۆ چوونمان وەك یەکە. دوای سەعاتێك سکاڵاو دەردە دڵ ئاغای کەنعانی هەستا بڕوا. پێش خودا حافیزیە رووی لەمن کرد و گوتی:

- ڕەها خاتوون ئێستا کە ئومێدت لە کیس چووە، هەوڵدە ژیانی گەڵ محەممەدیت لە دەست نەدەی، هەوڵدە لەبەر کوڕیەکەتان هەر چۆنێك بووە دەگەڵ مێردەکەتان ئاشت ببنەوە.

زەردەیەکم هاتێ و گوتم:

- یانی بەلای ئێوەوە دەبێ جارێکی دیش بچمەوە ناو ئەو دۆزەخەی؟

ئاغای کەنعانی سەرنجێکی پڕ بە زەیییانەی لێدام و گوتی:

- حەزت لێیە ڕاستیت پێ بڵێم؟

بەئاماژەی سەر وەلامی ئەرێیانەم دایەوە. ئاغای کەنعانی گوتی:

- بەڵێ، دەبێ بچیەوە ناو ئەو دۆزەخەی و شانیشی بدەیە بەرێ و خۆشی بۆ ڕاگری ئەوەش نەك لەبەر خاتری خۆتان،بەلکە تەنیا و تەنیا لەبەر کوڕیەکەتان، دەبێ خۆ بۆ ڕەفتارە ناشایستەکانی هاوسەرەکەتان ڕاگری و هەوڵدەی بەلکە بتوانی بیگۆڕی. مافی ڕەوای کوڕیەکەتانە کە هەم بەتەك باب و هەم بەتەك دایکیەوە بژی.

بەناقایلیەوە قسەکەیم بڕی و گوتم:

- کام ژیان؟ ئەو ژیانەی کە سەرانسەرەکەی هەر جنێو وقسەی سووکە؟ ژیانێك کەهیچ سەرنجێکی دڵسۆزانەی تێدانیە؟ ژیانێك کەتەنیا وشەیەکی خۆشەویستی تێدا نایەو ناچێ؟ ژیانێك کە بەردەوام هەمووی هەر پێك هەڵپرژینە؟ تۆ لە قسەکانی منەوە چیت دەستکەوتووە؟

ئاغای کەنعانی زۆر لەسەرخۆ گوێی دایە قسەکانم و کەزانیشی بێدەنگ بووم گوتی:

- بڕیارەکە وابوو کەمن ڕاستییە بەتۆ بڵێم و هێوداریشم لێم زیز نەبێ‌بەلام لەوانەیە تۆش وەکو پێویست ژیانت دەگەڵ محەممەدی بەسەر نەبردبێ؟ بۆ؟ چونکە تۆ هەر لە سەرەتاوە لێی بێزاربوو وی. هەر لە سەرەتای دەست پێکردنی ژیانیشتانەوە هەریەکە و دڵتان لەلایەکی دیکەوە بووە، بەلام ئێستا کە ئومێدیش ژنی هێناوە ئیدی هیچ ئومێدێکت بەو عیشقە لە دەست چووەتان نەماوە زیاتر دەتوانن بێنەوە سەروەختی بەردەوامیە ژیان و گوزەرانتان.

هەرگیز وانیە، ئێوە چووزانن من چ هەول و تەقەللایەکم داوە تا بیگێڕمەوە سەر ڕێی ڕاستەکی ژیان، چووزانن چەندم زووخاو و خوێنی دڵی خۆم خواردۆتەوە تا ورەی وەبەرنێمەوە و بەژیانی هاوبەشیمانی هیوادارکەمەوە. بەلام ئەفسووس لەوەی بەنسیبم بوو، تووشی چبووم؟ دڵێکی پڕ غەم و خەفەت و قژی سپی بێوەژنێکی کە بەمنی گۆڕیەوە! بەڵێ ئەمانە هەمووی شتگەلێکن کە لە ژیانی هاوبەشیەماندا دەگەڵ ئەو ناپیاوەیدا بەنسیبم بوو. ئێوەکە باسی لە خۆبووردەیی و قوربانی و فیداکاریە دەکەن ئەدی بۆچی دەگەڵ خوو و ڕەوشتەکانی

هاوسەرەکەتان هەڵنەکرد و خۆتان لەبەر ڕانەگرت، لەقسەکانتاندا بە تەواوی ئەوە دەردەکەوێ کە نیوەی ناڵەباری و بەدخووییەکانی محەممەدیشی نەبووە، ئەدی ئێوە بۆ خۆتان ڕانەگرت و هەڵتاننەکرد و ئەوە دوازدە ساڵە بەتەنیاو جیا لەیەکتری دەژین؟

- چونکە من منداڵم نەبوو.

وەڵامەکەی وشکی کردم. دوا وتەکەی ئەو بە ڕوواڵەت قسەیەکی سادە و ساکار بوو بەڵام لە ناوەوە زۆر مانادار بوو. زەردەخەنەیەکم کرد و گوتم:

- بەڵێ هەقی ئێوەیە، ڕەنگە من تا ئێستا لەبەر هیوابوونم بەژیان دەگەڵ نومێدیدا وای لێ نەکردبم بێمەوە سەر ژیانی ماڵ و حاڵی خۆم بەڵام دڵنیابن کە هەر لە ئێستا بە دواوە، هەرچی هەوڵ و کۆشش و تەقەللایە دەیدەم تا دووبارە دەگەڵ محەممەدیدا بژێمەوە.

ئاغای کەنعانی سەرێکی لەقاندو بە ڕوو خۆشیەوە گوتی:

- تۆ ژنێکی تا بڵێی ئاقڵ و تێگەیشتووی ومن دڵنیام کە سەریش دەکەوی دوای ڕۆیشتنی ئاغای کەنعانی خاڵ و خاڵۆژنم زۆریان قسە دەگەڵ کردمەوە و هانیان دام سەر لە نوێ ژیانێکی تازە دەگەڵ محەممەدیدا پێکەوە نێمەوە. کە ماڵێ وانم بە جێهێشت ئیدی ژیانم لەلا هێندە بێزراو نەبوو. گەیشتمەوە ماڵێ و بۆ ئەوەش مێشکم کەمێك ئاسوودەبێ چوومە حەمامێ و ئاوێکم بە خۆمداکرد. تازە لە حەمامێ هاتبوومە دەرێ کەدایك و بابم و خوشکەکانم و سالار گەیشتنەوە، ڕەیحانە وراحیلە بێ ئەوەی هیچ حیسابێك بۆ گیان و ئاخ و دڵ و هەستەکانی من بکەن بەباس کردن و گێڕانەوەی زەماوەندەکە زۆریان دەردو ڕەنج و ئازار دام. ئەوان هەروا بەدرێژی ڕووداو و بەسەرهاتەکانی زەماوەندەکەو بەو قسانەیان چ ئاورێکی دە دڵی منیدا پێدەکەن و چۆنی خوێ بەسەر زام و برینەکانی دڵمدا دەکەن. ڕەیحانە بێ ئاگایانە لە هەستی دەروونم گوتی:

- ئای ئەفسووس کە تا کۆتایی زەماوەندەکە نەمایتەوە تا بۆ خۆت دڵبەریەکانی بووك و زاوای بەچاوی خۆت ببینی.

راحیلە وەك بڵێی لە ڕوخسارە ماتەکەی منەوە ئاگاداری هەستەکانم بووبێتەوە بەئاماژە ڕەیحانەی تێگەیاند کە قسەکانی بوونەتە هۆی نارەحەتیە من. ڕەیحانەش دەستبەجێ قسەکانی بڕین و ماندووەتی کردە بیانوو وچووە ژوورەکەی. دوای ئەوەی کە ریحانە و راحیلە وازیان لەباسکردن و گێڕانەوەی زەماوەندەکە هێنا چوومە مەتبەخێ تا پەرداغە ئاوێکی وەخۆم.

دایکیشم هەر هاتە مەتبەخێ کەمنیشی لەوێ دیت گوتی:

- نومێد بە دواتدا دەگەڕا و لێی دەپرسیت و کە زانیشی زەماوەندەکەشت بەجێ هێشتووە سەروچاوە تێك ناو و گرژەکەی ئەوندەی دیش تێك ناو گرژبوو. بەستەزمانە وەك لەپرسەی مەرگی خۆی دانیشتبێ بەشێوەیەکی وا گرژ ببوو کە کەسوکاری بووکێی وەدەنگ هێنا.

دایکم سەرنجێکی حەسرەتاویانەی دایە دەموچاوم و درێژەی دایە:

- دەزانی ئەودەمی چیم وەبیرهاتەوە؟

دەحاڵێکدا کە دە نوختێکیەوە ڕامابووم و نومێدم ئاوا بە ماتی و گرژییەوە لەبەرچاوی خۆم بەرجەستە دەکرد وەڵامم دایەوە:

- ڕۆژی شەکراو خواردنەوەی من و محەممەدی.

دایکم بەسەر لەقاندنێ قسەکەی پشت ڕاست کردمەوە و گوتی:

- ڕاستە. زەماوەندی شەکراو خواردنەوەکەی تۆ و محەممەدی و هەنیا گرژەکەی تۆم وەبیرهاتەوە. ئای خۆزگە قەڵەمی دەست و پێی ئەو ناپیاوەی دەشکا و بۆ هاریکاریە نەدەچووە لای بابە گەورەت و بەو خۆ ڕەپێشکردنەی، ئاوای ئەو پیرەمێردە سادە و ساکارە هەڵنەدەخەڵەتاند ئای خۆزگە گوێمان دەدایەی وبەقسەمان دەکردی و نەماندەدایتە ئەو. ئای خۆزگە تۆش نەدەچوویە ژێربارو ئەو مێرد کردنەت بە وی قبوڵ نەدەکرد.

بەئاخ و داخەوە هەناسێکم هەڵکێشاو گوتم:

- ئای خۆزگە، ئای خۆزگە.

دوایەش بێ ئەوەی قسەیەك بکەم لەمەتبەخێ چوومە دەرێ

* * *

ڕەها بێدەنگ بوو و چەند هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و لەپڕ هاواری کرد:

- ڕەبابە خانم، چێشتەکەمان سووتا.

- ڕەبابە خانمێ بەندەی خودای وا بەهەڵە داوانەوە لەجێ بەرز بۆوە و بەرەو مەتبەخێوەی ڕاکرد کەلە ساڵ و تەمەنی وییەوە زۆر دوور بوو. ڕەها زەردەخەنەیەکی هاتێ و گوتی:

ێندە چوو بووینە ناو ڕابوردووەوە خۆشمان لە بیرچوو بـووەوە, هیـوادارم هـەر بـێ
..ڕە نەمێنینەوە.
ڕەها بە دەنگێکی بەرزەوە بە ڕەبابە خانمیی گوت:
- ڕەبابە خانم، چبوو؟ چێشتەکە سووتا؟
ڕەبابە خانم لە نێو مەتبەخێوە وەڵامی دایەوە:
- بەڵێ.
ڕەها سـەیرێکی منی کرد ئەوجا بەدەنگێکی بەرزەوە پرسی:
- یانی شتێکی واشی لێ نەماوەتەوە نەفسی گوناهباری پێ کوێر کەینەوە؟
ڕەبابە خانم لە مەتبەخێ هاتە دەرێ و گوتی:
- بەداخەوە چێـشتەکە سـووتاوە و کـەڵکی بـڕاوە. دەبـێ بـۆ نیوەڕۆیـە غـەمێ لـە خواردنێکی دی بخۆم، و هەرواش کە بەرەو لای ئێمەوە دەهات درێژەی دایە:
- تکا دەکەم ببوورن، چونکە ناچارم بڵێم کە ئەو ڕۆ نیوەڕۆیە چەند سەعاتێك درەنگتر نان دەخورێ.
ڕەها لە جێوە قیت بۆوە و گوتی:
- من هەرگیز ناتوانم تا چەند سەعاتێکی دیکە خۆم ڕاگرم. بە یارمـەتی خـۆت ئـەو زەحمەتەی بکێشە و لە دەرەوەمان خواردن بۆ بێنە.
دوایەش چاوە جوانەکانی دەمنەوە بڕین و گوتی:
- سپێدە گیانیش دیارە دەمانبوورێ کە ئاوا بەو جۆرەی پێشوازی و بەخێر دێنین.
لەسەر مۆبێلەکە هەستام و گوتم:
- بەلای منەوە هیچ نەبووە بەڵام حەیف کەلە دەست و لێنانەکەی ڕەبابە خانمێ بووین.
ڕەبابە خانم سـ..اسی کرد و بەدەم داوای لێ بووردنێوە بەرەو ژوورەکەیەوە چوو بۆ ئەوەی زوو خۆی ئاماد و بۆ خواردن هێنانێ وە دەرکەوێ.
ڕەها ڕووی دەمن کرد و گوتی:
- من پێشنیارێك دەکەم و ئەگەر ئێوە و ڕەبابە خانم ڕازی بن هەموومان پێکـەوە لـە دەرێ نانی بخۆین تا هەر بەو بۆنەشەوە لەو چـوار دیـوارەی بـچینە دەرێ و بایـەکی بـاڵی خۆمان بدەین.

بە ڕازی بوونێ من و رەبابە خانمێ هەموومان ئامادەبووین و بۆ ئاخواردنـێ نیوەڕۆیـە چووینە یەکێ لەو رێستۆرانە جوان وبە ناوبانگانەی نزیك ماڵێ رەهای.

رەها نانێکی باشی راسپارد. سەعاتێکی نەبرد کە مێزەکە بە زەڵاتەو جۆرەها خواردنی ئێرانی رازایەوە. بەجەفەنگە خۆشەکانی رەها و رەبابە خانمێوە نانەکەی نیوەڕۆیەمان خوارد و هاتینەوە ماڵێ.

خەو چاوی هەرسێکمانی قورس کردبوو. هەریەکەمان چووینە ژووری خۆمان و کەوتینە پرخەی نیوەڕۆ خەوێکی شیرین و قووڵەوە.

لە بۆنی رۆن و پیازێکی داغ کە هەموو نـاو ماڵەکـەی داگرتبـوو وە ئاگـا هاتـمەوە و چوومە مەتبەخێ. رەبابە خانم خەریکی چێشت لێنانی ئێـوارێ بـوو و رەهـاش یـاری بـە فنجانی قاوەکەی دەکرد. چوومە مەتبەخێ سڵاوم کرد. رەبابە خـانم و رەهـا هـەردووکیان بەگەرمی وەڵامی سڵاوەکەیان دامەوە. رەها بۆ خۆی هەستا و فنجانێك قاوەی بۆ تێکردم و لەسەر مێزەکە لەبەردەمی دانام. سوپاسم کرد و قاوەکەم خواردەوە. رەبابە خانم گوتی:

- ئەگەر ئێوە و سپێدە خانم رازی بن بۆ ئەوەی وەك نیوەڕۆیە بێ شـێو نەمێنینـەوە و ئەم جارەش چێشتەکەمان نەسووتێ هەر لێرە پاشماوەی قسەکانتان درێژە پێبدەن تا منیش ئاگایەکم لە چێشتەکەوە بێ.

رەها ویستی نارازی بێ و من گوتم:

- بەلای منەوە پێشنیارێکی چاکە من حەز ناکـەم جـارێکی دی لـە چێـشت لێنـانی دەست و پەنجەکانی رەبابە خانمێ بێبەش بم.

رەبابە خانم بەمیهرەبانیەوە سەیرێکی کردم و گوتی:

- بەوەی کە ئێوە لوتفتان دەگەڵە مندا هەیە مەمنونم، تەنیا رازیبوونێ خانمێ ماوە.

رەهاش بە ناچاری رازی بوو و دەستی بە گێڕانەوێ کردەوە.

* * *

بۆ بەیانی ئەو رۆژە چوومە موغازەکەی محەممەدی بەڵام بە تەواوی سەرسامیەوە دیتم کە موغازەکە لەلایەن دادگاوە مۆر و مۆم کراوە. بەناچاری بەرەو ماڵەتازەکـەی محەممەدیـەوە

چووم و سۆراغی محەممەدیم لە خاوەن خانووەکە کرد. ژنی خاوەن خانووەکەش کەمنی ناسی بە دڵسۆزییەکەوە گوتی:

- ئەگەر راستیت دەوێ من حەز ناکەم ئەو هەواڵەت بدەمێ، بەڵام چارەنیە و هیواداریشم ببەخشی کە هەواڵێکی وا ناخۆشت دەدەمێ، چەند رۆژێك لەمەو پێش هاوسەرەکەتان دەگەڵ دەلاڵێکیدا هاتنە ئێرە و زۆربەی کەل و پەلەکەتانی بەنیوەی نرخی خۆی پێ فرۆشت تا کرێی خانووی پێ بدات و ئەوەی ماشەوە لەگەڵلابەیەکیان بارکرد و بردیان. چەندی من و مێردەکەم پرکێشیمان کرد کەل و پەلی ماڵەکە نەفرۆشێ کەڵکی نەبوو و ئەو گوتی:

- چارەچیە خۆ دەبێ قەرزی ئێوە هەر بدەمەوە، نا!

مێردەکەم لە وەڵامیدا گوتی:

- ئێمە هیچ پەلەیەکمان لە کرێی خانوو نیە، هەر کاتێ هەبوو ئەو دەمی بیدەن. دیسانەوەش محەممەد ئاغا هەر گوێی نەدایە مێردەکەم و کەل و پەلەکانی هەر فرۆشت. کە ئەوم ئاوا بە نارحەتیەوە دیت گوتم:

- ئێوە خۆتان نارەحەت مەکەن چونکە تازە ماڵ و حاڵم تۆزقاڵێك بەلاوە هیچ نیە کە ئادەمیزاد ژیانی لێ تێکچوو، ئیدی کەل وپەل و ماڵ وحاڵ بەکەڵکی چی دێ؟ بەناچاری بەرەو لای ماڵێ مەعسوومە خانمێوە چووم. مەعسوومە خانم ژنێکی میهرەبان بوو و هاوسێی ماڵێ موحتەرەمێ بوو و بۆ شایە دیەش هاتبووە دادگایەو دەشزانی محەممەدی خۆش ناوێ.

بەفەرموو فەرمووی ئەوەوە چوومە ژوورێ و هەر دوای تۆزێك مەبەستی چوونەکەمم بۆ ماڵەکەیان ئاشکراکرد و داوام لێکرد تا ئەگەر محەممەدی دیت ئاگادارم کاتەوە دوایەش ژمارە تەلە فۆنەکەی ماڵە بابیشمم دایە. مەعسووم خانم سەری بەردایەوەو بە دەنگێکی دۆستانەوە گوتی:

- لەوانەشە خۆتێ هەڵقورتاندنیش بێ بەڵام ئەگەر لەمنت دەوێ و بەقسەی من دەکەی واز لە محەممەد و ژیانی محەممەدی دێنی وتێی هەڵدەدەی.

لەقسە راشکاوەکانی مەعسوومە خانمێوە هەمرو لەشم لەرزی و زانیم کە ئەو شتگەلێکی دەزانێ و دەیهەوێ بیانشارێتەوە. بە پاڕانەوەوە گوتم:

- چبووە؟ تکات لێدەکەم هەرچی دەیزانی بەمنیشی بڵێ، چونکە هەقە بیزانم.

مەعسوومە خانم سەری بەردایەوە. کەمێکی خۆ هێنا و برد و کەزانیشی هەر چاوەڕێم گوتی:

- دەزانی وەکو من بزانم بە گوێرەی ئەو قسانەی موحتەرەم کەبەر لەچەند رۆژێــك لای من کردنی تێگەیشتم کەمحەممەد هەمدیس هاتو چۆی مالەکەی دەکاتەوە.

بەبیستنی قسەکانی ئەو، ئەو تەنیا تروسکە هیوایەی دەدلێشمدا دەدروشایەوە ئەویش نەما. زۆر بەسەختیم خۆ ڕاگرت و لە وەلامدا گوتم:

- ئەدی بۆ محەممەد وای خۆپێشان دەدا کەهیچ پەیوەندییەکی بەموحتەرەمیوە نەماوە؟ و چەندین رۆژ لەپشت دەرکەی مالێ بابەوە هەر خوازیاری ژیانی هاوسەری و هاو بەشیمان بوو؟

مەعسوومە خانم شانێکی هەلتەکاند و وەلامی دایەوە:

- تەنیا هەر خودا بۆ خۆی دەزانێ

هەرچەندە هیچ پەیوەندییەکیشم بە محەممەدیەوە نەبوو بەلام هەستی ئیرەییــەم چــنگی لەدلێ و دەروونم گیر کردبوو، ئیرەیی بە ژنێك کەجێی منی لە ژیانی هاوسەریەمدا گرتبۆوە. بەدەنگێکی لەرزۆکەوە گوتم

- تکا دەکەم ئەگەر محەممەدت دیت دەستبەجێ تەلەفۆن بۆ ئەم ژمارەیە بکە و ئاگادارم کەوە.

- مەعسوومە خــانم ســەرنجە پــڕ بەزەییەکــەی لەســەر مــن گواســتەوە و هــەولی دا فرمێسکی چاوە میهرەبانــەکانی کــە دەچــاویدا قــەتیس مــابوو لــەمن بــشارێتەوە بــەلام نەیتوانی. ئەو ژنە بێگانەیە ئەوەندە میهرەبان و خۆمانــە بــوو کــە بــەو خۆشەویــستی و دلسۆزیەیەوە منی شەرمەزاری خۆی کردبوو. دەستم خستە سەر دەستی و گوتم:

- سوێندت بۆ دەخۆم هەرگیز مەبەست و نیازم ئەوە نەبووە ئێوە دەو ژیانەی خۆمــەوە بگلێنم و ئاواتان نارەحەت کەم، بەلام چبکەم لەبەر خاتری ئەو کۆرپەی دەزگمدایە ناچارم.

مەعسوومە خانم زەردەخەنەیەکی هاکە زایانەی کرد و گوتی:

- خەتای ئێوەنیە، گوناه گوناهی مێردە بێ سۆزو بەزەییەکەتــە. مــن داخــی ئێــوەم ناچێت، کاتێ کە ئێوە دەبینم ئاوا دەگــەل ئــەو هــەموو دەردو رەنــج و ئــێش و ئــازارەی چەشتوشتانە کەچی دووبارە هەر هەولی پێکەوە ژیــانێکی هاوســەریتانە دلــم دەکولــێ و

دەروونم گڕ دەگرێ. بۆیەشم هێندە دڵ دەسووتێ کە کارێکم لەدەست نایە و ناتوانم هیچتان بۆ بکەم.

لەو جیا بوومەوە و هاتمەوە ماڵێ بابم. چەندین ڕۆژ دواتر کاغەزێکمان لە دادگاوە بۆ هات کە محەممەد داوای دووبارە ژیانی هاوسەریەمان دەکات و لەوەش بەولاوە هەڕەشەی کردبوو کە دوای لە دایکبوونی منداڵەکەم ئەوم لێ دەستێنێتەوە. بەترسێکەوە سەیرێکی دەموچاوی دایك و بابم کرد و پرسیم:

- دەکرێ بتوانێ منداڵەکەم لێ جودا کاتەوە ولێم بستێنێتەوە؟

- بەڵێ.

- کە هەر وایە من دووبارە دەچمەوە لای و دەگەڵیدا دەژیم.

- ڕەها ئەوکارەی تۆیانی چوونەوە ناو ژیانی دۆزەخی، یانی چەشتنەوەی ئێش و ئازارو ڕەنجێکی لە جاران زیاتر، هەروەك شارەزای ئەو پیاوەین ئەمجارەیان کەپەی بەنوختە لاوازیەکەی تۆ برد زیاتر ڕەج و ئێش و ئازار و دەردو غەمت دەداتێ.

بەلاّم من بەرگەی لە دەستدانێ کۆرپەکەم ناگرم. هەر بە هیوای نزیکیە لە کۆرپەکەمەوە ژیانەکە بەسەردەبەم و خۆ ئەگەر ڕۆژێکم کۆرپەکەم لێ دوورخەنەوە، دەمرم.

بەرواری دانیشتنێ دادگای لەچەند ڕۆژێکی بەولاوەتر نەمابوو ومن هێشتا هەر دوو دڵی ئەوە بووم کە هەروا بەجیا بژیم یا لەبەر خاتری بوونی کۆرپەکەم دەگەڵەویدا بژیم.

## (٩)

لە ڕۆژی دانیشتنێ دادگای ڕەزامەندی دووبارە پێکەوە ژیانم دەگەڵ محەممەددیدا ڕاگەیاندەوە و سەر لەنوێم ژیان دەگەڵە ویدا دەست پێکردەوە بەڵام ئەم جارەیان بەو پەڕی ڕق و دوو دڵییەوە. ئیدی هیچ متمانە و دڵنیاییەکم بەقسەو گفت و بەڵێنەکانی نەمابوو و چاکیشم دەزانی کە بێدەنگی ئەو وەك ژیلەمۆی بن خۆڵە مێشێیە. دووای چەند ڕۆژێکان کوڕەکەم هاتە دنیایە و ئیدی محەممەد ئەو تیرەشی هەر بەچەپەی هاویشت و ئەو بیانووەشی برا لەسەر ڕەگەزی منداڵەکەی گرەوێ بکاو بیانووان بگرێ و بڵێ:

- تۆش وەك دایکەکەت هەر کچ زای.

هێشتاش هەر لەلام شاراوە و مەسەلەیەکە کە محەممەد چۆنە وا خوازیاری دووبارە پێکەوە ژیانمانە، ئەوێك کە ئامادەبوو لەبەر موحتەرەمێ هەموو ژیانی ئێمە تێك وپێك دا چۆنە وا دووبارە بەدوا پەیسەری مندا هاتۆتەوە و ژیانی دەگەڵە مندا وا بەلاوە گرنگ بۆتەوە، ئەو مەسەلەیە تا دەهات هەر ئازاری دەدام. هەرچەندە هیچ ئارەزوویەکی پێکەوە ژیانێم دەگەڵە ویدا نەبوو بەڵام هەر لەبەر خاتری بوونی کوڕەکەم هەوڵم دەدا ڕابوردوو لەبیربەرمەوە و هەموو شتێکی سەر لەنوێ دەست پێ بکەمەوە و ژیانێکی تازە دەگەڵ محەممەد و کوڕەکەمدا بەسەر بەرم. هیواداریش بووم بوونی کوڕەکەم و یا ئەولێك دابڕانەی پێشووم لە محەممەدی بیهێنێتەوە سەر ئەقل وبە ژیانی ئاشناکردبێتەوە. چەند مانگێك ئاوا بە نیمچە ئارامی و ئاسوودەییەکەوە تێپەڕی و وردە وردە هەموو بەسەرهاتەکانی پێشووشم تا دەهات بە فەرامۆشی دەسپاردن و لەبیرم دەبردنەوە. تا ڕۆژێك مەعسوومە خانم هاتە ماڵێ مە و محەممەد بۆ خۆی دەرکەی لێ کردەوە. محەممەد بە دیتنێ مەعسوومە خانمێ نێو چەوان و برۆی تێکنان و بێ فەرموو لێکردنێی هاتەوە نێو ماڵێ و گوتی:

- ڕەها دیسانەوە ئەو ژنە حەیتەیە پەیدا بۆوە و والەبەر دەرکێ ڕاوەستاوە.

بەسەر سامییەکەوە پرسیم:

- حەیتە ژن کێیە؟

- چووزانم تۆ خۆت بچۆ بزانە چی دەوێ؟

لە ماڵێ هاتمە دەرێ و بەرە و دەرکی حەسارێوە چووم. بە دیتنێ مەعسوومە خانێ هەم سەرسام بووم و هەم خۆشحاڵ. بەگەرمیمەوە مەعسوومە خانم دەباوەش وەرێناو ماچم کرد و فەرمووی نێو ماڵێم لێ کرد. مەعسوومە خانم! بەزۆری پرکێشیە من هاتە ژوورێ و بە دیتنێ کەل و پەلی نێو ماڵێ گوتی:

- بەه بەه، پیرۆزە ئیشاڵڵا. ماڵێکی جوانکیلەتان هەیە.

- سوپاس، هەروەك ئاگاداری من و محەممەد لێك جودابیووینەوە و محەممەدیش هەموو نێو ماڵەکەی فرۆشتبوو بەڵام دوای پێك هاتنەوێمان بە هاریکاریە محەممەدی و بەیاریەبابم توانیمان دووبارە ماڵەکەمان بە تازەیی پێکەوە بنێینەوە.

- بەڵێ بەڵام زۆربەی کەل و پەلەکانتان جوان و لۆکسترن لە جاران.

دەحاڵێکدا کە بە قاپێك میوە و شیرینیەوە بەرەو لای مەعسوومەوە دەچووم سەرنجێکم دایە محەممەدی کە بەروویەکی گرژەوە گوێی بۆ قسەکانی ئێمە راداشتبوو و گوتم:

- دیارە من کەل و پەلەکانی پێشووم خۆشتر دەویستن چونکە ئەوان هەرچیەك بوون بەروجیازی خۆم بوون، با واز لەوانە بێنین ئەوە چۆنە وا وەبیرت هاتووینەوە؟

- راستیەکەی من هەمیشە ئێوەم هەر لەبیرە ، هەمیشە لە محەممەد ئاغام هەر لێ پرسیون و لێشتان دەپرسم، بەتایبەتیشم سلاو بۆ ناردوون.

سەرنجێکی سەیرم دایە مەعسوومە خانێ و محەممەدێ و پرسیم:

- لەمحەممەدیتان لێ دەپرسیم؟ باشە ئەوتان لە کوێ دەدیت؟

- زۆربەی رۆژان محەممەد ئاغای لە گەرەکێ خۆمان دەبینم بۆ مەگەر تۆ نازانی؟ کە بێدەنگیە منی دیت گوتی:

ئەی وای توخوا ببوورە، پێموانەبوو ئاگادار نەبوویی و نەتزانیبێ لەوەش کە هەواڵەکەم ئاوا بەدەم داهاتووە و لێم هەڵوەریوە داوای لێبووردنێ دەکەم. بەسەر سوڕمانێکەوە سەیرێکی دەموچاوی مەعسوومە خانێم کرد و ئەویش بە چاو داگرتنێکەوە تێیگەیاندم کە بە ئەنقەست لەلای محەممەدی ئەو هەواڵەی داوەتە من.

دوای چەند دەقیقێکان مەعسوومە خانم خودا حافیزی کرد و رۆیی. بە هەوتێکەوە سەیرێکی محەممەدم کرد کە هەروا مات و بێدەنگ دانیشتبوو و پرسیم:

- تۆ ئیشت چیە لەو گەرەکەی کە هەموو رۆژێ خوا دایناوە بچیە وێ؟

محەممەد هەروا بێدەنگە و وەڵامێکی نەدایەوە. هەروا کە بێدەنگییەکەی ویـم دیـت درێـژەم دایە:

- باشە تۆ لە ژن و مێردایەتیەتدا چت دەوێ کەمن نەمتوانیبێ بتدەمێ؟ ئیدی چـت دەوێ بێکەم تا تۆ وا لێبکەم و بتهێنمەوە ناو باوەشی گەرموگوڕی ماڵ و حاڵ و خاو وخێزانی خۆت، چیم نەکردووە تا بیکەم؟

محەممەد بە تووڕەییەوە گوتی:

- هەستە دەی، یاریِ منداڵانەی (دایە مەمدە بەگورگی) م دەگەڵ مەکە. تـۆ ئـەو ژنـەنی کەمن دەمەوێ. بە تووڕەییەکەوە تێمڕوانی و گوتم:

- من کە لەتۆ جیا بوومەوە ئەدی بۆچی چەندین ڕۆژانت پشت دەرکێ ماڵە بابم بەرنـەدەدا و دەپاڕایتەوە تا لێت ببوورم، باشە ئەی بۆ دوای لێك دابرانێمان شکایەتت کرد کە مەهدیم لێ دەستێنیتەوە. کە تۆ منت خـۆش نـاوێ ئـەدی ئـەو ئـۆقرە و ئـارامی و ئاسـوودەییەی ئـەو دواییەت بۆچی هەموو لێ تێکدامەوە کە دەگەڵی ڕاهاتبوومەوەو وەدەستم کەوتبۆوە؟

محەممەد زەردەیەکی ماناداری کرد و وەڵامی دایەوە:

- لەبەر ئەوەی جارێ ئیشم پێتە و هەر کاتێکیش ئەو شتەم دەستکەوت کە بۆ خۆم دەیلێم دڵنیابە چرکەیەکت دەگەڵ هەڵناکەم...

هاوارم کرد:

ئەوە هەر منم کە دەگەڵ تۆدا هەڵدەکەم هـەی پـیس، نـە ئـەوەی کـە تـۆ دەگەڵـە منـدا هەڵکەی، ئەوەیان تۆی کە تەنانەت تۆزقاڵە سۆزێکت بەرامبەر کۆرپەکەشت هەر نیـە، ئـەوە تۆی کاتێ کە دەڵێم سەوزە و گۆشتی بکڕە تا شـۆرباوێکی بـۆ منداڵەکـەی لێنـێم دە وەڵامـدا دەڵێی بۆ ئێمە بە چی گەورە بوو وین؟ دایکمان هەموو ڕۆژێ شۆربای بۆ لێ دەناین تا گەورەی کردین یا نا کا هەموو ڕۆژێ ماهیچەی مەڕێی دابینـێ دەنـا گـەورە نـە دەبـووین، پێـشینان گوتوویانە.. منداڵ بە چڵمی خۆی تێر دەخوا و گەورە دەبێ، ئەوەیە سۆزی باوکایەتی بەرامبەر جگەر گۆشەی، ئەوەیە مرۆڤایەتی؟

محەممەد لە جێوە هەستا و بەرەو لای منەوە هات و گوتی:

- هەر لەبەر ئەوەی گۆشت و سەوزەم بۆ تولەکەت (بێچووە سـەگ) نەکڕیوە بێ سۆزم، کـێ دەڵێ ئەوە لەمنە، کێ گرەنتی ئەوە دەدات ئەوە منداڵی منە ها!...

بەترسێکەوە سەیرم دەکرد، دەستم بە گوێیەکانمەوە نا و هاوارم کرد:

- بیبڕەوە، ئیدی نامەوێ گوێم لە قسەکانت بێ، تۆ شێتی، تۆ نەخۆشی، تۆ ساغ نی، تۆ هەر مرۆڤ نی، کام مرۆڤێکی ئاقڵ تەشوێ لە ڕەگی ژیانی خۆی دەدا؟

هەروەك شێتان قاقا پێکەنی و گوتی:

- من ، من ، من...

- بڕۆ دەرێ، بڕۆ دەرێ شێتە، بڕۆ دەرێ جادووگەر.

محەممەد دووبارە هاتەوە سەر موبێلەکە و دانیشتەوە و دەحالێکدا کە زەردەخەنەیەکی ئازار دەرانەی بە لێویەوە بوو گوتی:

- لێرە چاکتر بچمە کوێ، من تا بە مراز و نیاز و مەبەستی خۆم نەگەم هەرگیز لێرە ناچمە دەرێ...

- گوتم بڕۆ دەرێ، لە ماڵ و ژیانی من وەدەرکەوە و بچۆ دەرێ و ونبە لەبەر چاوم.

محەممەد بە تووڕەیییەوە هاواری کرد:

- دیسان دەستت کردەوە بەزمان درێژیە! باشە هەر بەو زووانە زمانت لە گەرووت دەردێنم.

منیش هاوارم کرد:

- هەرچی ناماقوولێەکی لە دەستت دێ بیکە، با بزانم چت پێ دەکرێ، ئەوەی نەتکردووە بیکە، لەوەی تەڕ تەڕ نەباشەد، زووکە دەی هەستە و بڕۆ دەرێ و هەر ناماقوولیەکت حەز لێیە بیکە.

لە بەرووەی لەدەست هەرەشەو گوڕەشەکانی وە زاڵە هاتبووم و ماندوو ببووم بەرەو لای دەرکێوە چووم و دەرکەم کردەوە و گوتم:

- زووکە بڕۆ دەرێ، پیاوێك ماڵ و منداڵی خۆی پێ بە خێو نەکرێ هەر بۆ پەناو پەسیوان باشە، تۆ لە پیاوەتیەدا بەس ملهوڕیەکەی فێربوو وی چ ناماقوولێەکی دەکەی دەو ماڵەیدا؟ نەوە هەر تۆ نیت کاتێ کە بابم موغازەکەی لێ ستاندیەوە وەسواڵێ کەوتی و بە پاڕانەوە و لالانەوەوە خۆت کردە مشکە تۆ پیو و موغازەکەت لەبابم بەکرێ گرتەوە، ئەگەر هەروا کەمێکت هۆش و گۆش و تێگەیشتن هەبێ و چاوت هەڵێنی دەزانی کە تەواوی ئەو ژیانەی هەتە هەمووێت لە بابمەوەیە و تۆ بۆ خۆت خاوەنی هیچ نیت.

محەممەد لە جارانی بەرزتر هاوار کرد:

- کام ماڵ و ژیان؟ دیارە لە گۆڕی بابتەوە هێناوە وادەم لە ماڵ و ژیانێ وەردەدەی...

بەتووڕەیییەوە سەیرێکیم کرد و گوتم:

- نا، تۆ ئەوانەت لە گۆڕی بابتەوە دەرهێناون، ناپیاوی هیچ و پووچ، دەو چەندین ساڵەی کەمێردم تێدا کردووە کام دەنکە شخارتەیەکت کڕیوە و هێناوتەتەوە و خستووتەتە سەر ماڵێ؟ تۆ بە پێچەوانەی هەموو پیاوانەوە لە جیاتی ئەوەی بۆ ماڵ و ژیانی خۆت خەرج کەی، تەواوی کەل وپەلی ژیانی ماڵێت فرۆشت و لەقەردیت دایەوە. باشتر کە ئەو چەند ساڵانەش هەمیشە هەر ناخۆری بابم بوو وی هەی بەد بەخت، بەخودای بەخودای ئەگەر یەك قسەی دیکەی بکەی هەر ئێستا تەلەفۆنێ بۆ بابم دەکەم بێت بە شەقانت لە ماڵێ وەدەرنێ. هەرچەندە چاکیشی لێ دەزانی خۆت بێنیە حاڵی جاوێ و هەر کە چاوت بە بابم کەوت لەترسان خۆ بمرێنی و بکەویە هاوارو ناڵە و دادو برۆیە و بلێی بەڵێ ناماقوولێم کرد و نەمزانی و لێم ببوورن. تۆ ئاگات لە چیە کە هەر بە چەند رۆژێکان جارێك دایکم دێتە ئێرە و هەرچی ناگوزووریمانە دەیبرێ و چی پێویستیمانە دەیهێنێ، رۆژێکیان دەڵێ چوو بووینە بازاری بابت چاوی بەو کراسەی کەوت و حەزی چوویەو بۆ نێوەی کڕی، رۆژێکی دی دەڵێ چێشتم لێنابوو بابت گوتی رەها حەزی لەو چێشتەیە بۆی هەڵگرە. هەموو جارێکیش کە ئەوانە دەبینم دەمرم و دەژیەمەوە. بەڵام تۆ چی؟ لەجیاتی ئەوەی بێی خەریکی ئیش و کارو ژیانی خۆت بی دەست لەو ژنە بێ سەرو پایەی هەڵناگری ئیدی ماندوو بووم. ئیدی دەگەڵتدا هەڵناکەم، تا ئەو رۆژە هەروامدەزانی لەوانەیە بێیەوە سەر هۆش و گۆش و ئەقڵی خۆت بەڵام ئەو رۆ تێگەیشتم تۆ ئەو پیاوە نیت شایانی ئەو ژیانە بیت و کەلکی ئەو ژیانەت پێوە بێ، پیاوێك کە بەر عۆدەی هیچ گفت و بەڵێنێك نەبێت دەژیانی خۆیدا هەر نەبێ باشترە، رەنگە پێتوابێ ئەوانە هیچیان ئەرکی تۆ نەبن و ئەوانە هەموویان ئەرکی بابم بن ئێمە بەخێوکەن!؟

محەممەد بەلێوە خەندەیەکەوە گوتی:

- نەك هەر ئەرکی من و لەمل من نیە و یا باشتر بلێم بەلانی کەمەوە تا کاتێکی بابت بەشە میراتی خۆتت نەداتێ منیش هیچ جۆرە ئەرکێکی ماڵ لە ئەستۆ ناگرم. با بابت دانیشێ و حیساب و کتابێ بکات و بەشەمیراتی تۆ پوختە و تەواو بەناوی منەوە بکات، ئەو دەمی منیش بە هەموو شێوەیەك بۆ ماڵ و حاڵ و ژیانێ خەرج دەکەم.

لەناباوەڕییان خەریك بوو چاوم لە قەپێلکی دەرپەڕێ بە نارەحەتیەوە گوتم:

- ئەرێ بەراست تۆ دەزانی دەڵێی چی؟ من بچم و بە بابم بلێم تۆ بە زیندیە چاوان هێشتا زیندوو و بە پێوەی ئەوە مێردەکەم داوای بەشە میراتێی کردووە؟

- جا بۆ هەر دەبێ دوای مردنێ بابت ئەوجا دەستمان لەنان و ئاو و نەوایەکی گیربێ؟ قەیدی چیە باتا بابت بۆ خۆی ماوە بوون و ماڵی منداڵەکانی بە چاوی خۆی ببینێ.

بەهەموو هێزی خۆمەوە پڕمدایە ئەو شەکردانە چینیەی سەر مێزەکەی بەردەمم و ڕێم هاڵاندێ و هاوارم کرد:

- پیسی بێ ئابڕوو لاچۆ لەبەر چاوم دوورکەوەوە.

محەممەد بە دەنگێکی بەرزەوە قاقا پێکەنی و لەماڵێ چووە دەرێ و هەروا بەدەم چوونە دەرێوە گوتی:

- پێتوابوو لەبەرچی دووبارە ئامادەبووم دەگەڵتدا بژیم؟ پێتوابوو هەروا لە خۆوە ئامادەم ئەو هەموو تڕو فیز و خۆ هێنان و بردنانە و خۆبادانێ کەسوکارەکانت هەلگرم، نەخێر خانم خەونت دیوە و خێربێ ئیشاڵلاّ. وا باشترە تۆ ئەقڵی خۆت خوردکەیەوەو داوا لە بابت بکەی تا زووە دەست بە حیساب و کیتابی ماڵ و سامانەکەی بکات.

ئەوە من ڕۆیشتم تۆش کاتی تەواوت بە دەستەوەیە حیسابێك و بیرێك لە قسەکانم بکەیتەوە.

محەممەد لە ماڵێ چووە دەرێ و منیشی دەگێژاوی سەرسامی و ناباوەڕیەدا ڕۆبرد. ئەو مرۆڤ نەبوو هەر ڕاست شەیتانێك بوو لە فێڵ و گزی و تەڵەکەبازی کە دەستی سەد جادۆوگەری لەپشتەوە بەستبوو. هەر جارێکی کە فێڵێکی سەری نەدەگرت لە ڕێیەکی دیکەوە و بە شێوازێکی دیکە دەهاتەوە مەیدانێ. ئەوەشم چاك دەزانی کە هەرگیز وازی لە موحتەرەمێ نەهێناوەو دەستبەرداری نەبووە و وازیشی لێ ناهێنێ تەنیا مەبەستیشی لە هێنانەوەی من و ژیانی دووبارەی پێکەوەمان هەر ئەوە بوو کە چاوی بڕیبووە بوون و سامانەکەی بابم و دەست گەیشتن پێی. لەبەر ئەوەش کە هەڵ خەڵەتابوومەوەو سەر لەنوێ چوو بوومەوە لای و دەگەڵی ناشت ببوومەوە بێزم لە خۆم دەبۆوە و ئەفرەتم لە خۆم دەکرد. هەر دەستبەجێ دوای چوونە دەرەوەی وی لە ماڵێ مەهدیم بە باوەشێ دادا و پاش ئەوەش کە ناسنامەی محەممەد و مەهدی و خۆمم هەڵگرت لە ماڵێ هاتمە دەرێ. بە دڵێکی شکاو و چاوی هەڵ پنماوەوە خۆم گەیاندەوە ماڵێ بابم و پاڵم بەزەنگەکەوە نا.

دایکم دەرگای لێ کردمەوە و هەر بە دیتنێ چاوی بەگریانەوە دە هەموو شتێکی گەیشتەوە بەپەلە مەهدی لە باوەشێ وەرگرتم. ئیدی هیچم بە بەرەوە نەمابوو و هێزم لێ بڕابوو

بن پیلی گرتم و یارمەتی چوونە ژوورەوێی دام. دایکم سالاری بانگ کرد و مەهدی بەو سپارد و گوتی:

- باجیت باش نیە، بە یارمەتی خۆت دەگەڵ مەهدی گەمان بکەو مەهێڵە بگریا.

سالار بەسەر سامیەکەوە دە دەموچاوە سوور هەلگەڕاوەکەمیەوە دەڕوانی و هەستی نەدەکرد و لە جێی خۆی نەدەجوولا. دایکم بە دەنگێکی بەرزترەوە گوتی:

- ئەوە هۆشت لە کوێیە کوڕە؟ ئەدی ئەوە نالێم مەهدی ببە ژوورەکەی خۆت؟

سالار بە خۆهاتەوە و مەهدی لە باوەشێ کرد و هەروا بەدەم چوونە ژوورێوە گوتی:

- وەرە، خالە گیان وەرە بابچینە ژووری خالی خۆت تا خالە هەرچی ئوتۆمبێلی جوانی هەیە هەموویت بداتێ یارییان پێبکەی.

مەهدی بەبێ هیچ نا و نایەك چووە باوەشی. سالار هەروا کە بەرەو ژوورەکەشیەوە دەچوو کە چی چاوی هەر لەسەر هەلنەدەگرتم. دایکم تەنانەت وشەیەکیشی دەربارەی شەڕی من و محەممەد و یان چبووە چ نەبووە نەپرسی.

هەرچەندە پێویستیش بە باس و دووبارەکردنەوەی شەڕو هەرایەکەمان نەبوو.

دەماوەی ئەو سێ ساڵەی ژیانم دەگەڵ محەممەدیدا لە تەواوی رەفتارەکانی شارەزاببوون. دایکم بە تەلەفۆن رووداوەکەی بە بابم راگەیاند. دوای سەعاتێکی بابم خۆی گەیاندەوە مالێ. بەدیتنێ دەموچاوە ماتەکەی بابم خۆم دەنامێزێی هاویشت و بەدەنگێکی بەرزەوە گریام و گوتم:

- بابە، هێشتاش محەممەد دەستبەرداری موحتەرەمێ هەر نەبووە، ئەورۆ لە رێی مەعسوومە خانمێوە زانیمەوە کە پەیوەندی هەر دەگەلدایە و هامووشۆشی هەر دەکات، ئەورۆم زانی کە هەموو رۆژێ بە بیانووی چوونە موغازەیەوە راست دەچێتە لای موحتەرەمێ.

بابم دەستێکی بەسەر و پرچی داهێنام و گوتی:

- تکا دەکەم نازیزەکەم، هەر لەسەر خۆبە و خۆت ڕاگرە، بلێ بزانم چبووە. بە پشتە دەستێم فرمێسکەکانی دەموچاوم سڕینەوە و گوتم:

- محەممەد ئەورۆ ددانی بەوە دانا کە مەبەستی لە دووبارە پێك هاتنەوەێمان تەنیا هەر بۆ وەچنگ کەوتنێ موغازەکەی بووە، ئەورۆش دەیگوت دەبێ بابت بەشە میراتی خۆت بداتێ، بابە من کە ئەو قسانەی ئەوت بۆ دووپات دەکەمەوە تەریق دەبمەوە بەڵام ناچارم هەر بۆ ئەوەی ئێوە ئەو مرۆڤە دێو سیفەتە باشتر بناسن ناچارم هەموو شتێکت بۆ بگێڕمەوە و پێت بڵێم.

بەدەم هەنیسکی گریانێوە تەواوی هەموو رووداوەکەم بۆ گێڕایەوە. گریان گەرووی گرتبووم و بە قورسی قسەم بۆ دەکرا ئیدی بەربەستی فرمێسکەکانم پێ نەکرا. دەحاڵێکدا کە فرمێسکم بەسەر و چاواندا دەهاتە خوارێ درێژەم دایەوە:

- تکاتان لێ دەکەم لە دەستی ئەو بەناو مرۆڤەم رزگارکەن. بیکەن لە راهی خوا لەو بەدبەختیەم دەربێننەوە، ئیدی من توانای خۆ ڕاگرتنێ ژیانم دەگەڵ ئەوەیدا نەماوە ئیدی لەوزەم دەرچووە و هەستدەکەم کوورِ بوومەتەوە و پشتم چەمیوەتەوە، دەماوەی ئەو پێنج ساڵەیدا وا دەزانم پەنجا ساڵ پیرتر بووم، تەنانەت لە ناوەکەشی دەترسم، ئامادەم قەرەواشیە تۆ و دایکم بکەم بەڵام نەم بەنەوە ئەو ماڵە دۆزەخیەی.

بابم نێو چەوانی ماچ کردم و بە دەستە لەرزۆکەکانی فرمێسکەکانی سڕینەوە و دەحاڵێکیدا کە دەنگیشی دەلەرزیەوە گوتی:

- قەرەواشی بۆ، تۆ تاجی سەری من و دایکتی، پێی خۆت و کوڕەکەت بان چاوەکان، ئەو ناپیاوە بێ چاو و ڕووە بۆ تازە بە هۆی منەوە بۆتە ماڵ و ژیاوە؟ کام ماڵ؟ کام ژیان؟ بۆ مەگەر قرانێکی دەو ماڵ و ژیانەیدا خەرج کردووە کە ئێستا ئاوا داوای ماڵ و سامانی من دەکا؟ئەو تەنانەت چڵمی لووتی خۆی پێ هەڵالووشرێتەوە چ جای ئەوەی بێت و ببێتە خاوەن ماڵ و سامان ودارایی. مەرجە دەبێ میراتێکی وای بدەمێ کەتا عومری ماوە لەبیری نەچێتەوە، تا ئێستاش کە دەنگم نەکردووە هەر لەبەر خاتری ئەو مندالە بووە کە گوتوومە بامن نەبمە هۆی بێ بابیەی، ئیدی لێرەوە بەسە هەرچی خوا لە چارەی ئەو مندالەشی نووسیوە هەر ئەوەیە و هەر ئەوەش باشە...

هاتمە نێو قسەکانی بابمەوە و گوتم:

- من هیچ شتێکم لەو ژیان و ماڵ و حاڵەی ناوێتەوە، حەز ناکەم بە دیتنێ ئەوانە بیرەوەریە دووجار تێکشکاوەکانم لە ژیاندا و ئەو رۆژە پڕئێش و دەردو نازارانا و پەشم زیندووکەمەوە تەنیا تکایەکم لە ئێوە هەر ئەوەندەیە مەهێڵن مەهدیم لێ وەرگرێتەوە. حەز ناکەم مندالەکەم لەبن دەستی پیاوێکی دڕندە ئاسا گەورە ببێ. بەرەزامەندیە دایك و بابم سەر لە نوێ داوای تەڵاقم کردەوەو چاوەڕێی پێ راگەیاندنەوەی دادگای بوومەوە.

* * *

ورده ورده تەواوی خزم و کەس و کارو بنەماڵە بەسەر گوزەشتەو بەسەرهاتی ژیان و تەڵاق وەرگرتنێمیان زانی. هەر رۆژەی هەندێکیان دەهاتنە سەر دانێم و تەواوی ئەو دۆست و ئاشنا و رۆشنایانەش هاوبەشیە غەمی خۆیان بۆ دەردەبڕیم.

بابە گەورە و دایە گەورەش بە هەواڵەکەیان زانی و بۆ دیدەنیەم هاتنە ماڵێ بابم. بەڵام من کە بابە گەورەم بەهۆی راستەوخۆ و راستەقینەی تەواوی هەموو ئەو بەدبەختی و رەنج و ئازارانە دەزانی کە چەشتبووم دەمزانی چاوم پێیان هەڵنایە و ناتوانم بیانبینم، بۆیە هەر بە گەیشتنێیان بۆ ماڵە بابم چوومەوە ژوورێ و دەرگاکەم لە پشتەوە داخست.

دوای چەند دەقیقێکان دایکم چەند جارێکی لە دەرکەی دا و بە خەیاڵی ئەوەی کەمن ئاگام لە هاتنێ بابە گەورەی نیە گوتی:

- رەها گیان ئاغای گەورە بۆ چاو پێکەوەتنێت هاتووە، بەیارمەتی خۆت وەرە هۆڵی میوانان، دەیانەوێ چاویان پێت بکەوێ.

بە نارەحەتیەوە گوتم:

- بەڵام من حەز ناکەم ئەوان ببینم.

دایکم بە دەنگێکی نووساوەوە گوتی:

- تکا دەکەم رەها، بابە گەورە نارەحەت دەبێ.

هاوارم کرد:

- نارەحەت دەبێ باشتریش، بۆ ئەو هیچ گوێی دایە نارەحەتیە من. هەروا بە خۆتێهەڵقورتاندنێکی بێ جێوە تووشی ئەو رۆژ رەشیەی کردم. بە یارمەتی خۆت لە زمانی منەوە پێیان بڵێ کە رەها حەز ناکات ئێوە هەر ببینێ و حەز ناکا چاوی بە چاوی ئەو کەسە هەر بکەوێ کە بووە مایەی پێنج ساڵی رەبەقی ئێش و دەرد و رەنج و ئازاری. هەرچەند دایکم پێی داگرت من زیاتر سوورتر بووم. ئەو رۆژە دەگەڵ ئەو هەموو پێداگرتنانەی دایك و بابیشم هەر نەچووم بیانبینم، بابە گەورە بە دڵی شکاوەوە ماڵی بابمی بە جێهێشت.

ئەو دەمی تابڵێی رق ئەستوور و تووڕە و تۆسن و داخ لە دڵ بووم, ئیدی حەوسەڵەی هەراو هوریاو دەنگە دەنگی زۆر و میوان رۆیشتن و فەرموو فەرموویانم نەبوو، هەر کاتێ ئەوەم بیردەهاتەوە کە سەر دەمانێك دەسکە گوڵی نێو ماڵێ بووم و لە هەموو دانیشتن و کۆڕ وکۆبوونەوە و میوانداریاندا باس هەرباسی جوانی و پتەوی و خڕو خەپانی من بوو و محەممەدیش لەبەر سامانی باوکم منی خواستووە و بێوەژنێکی تەڵاقدراوی بەسێ منداڵەوەی بەسەر مندا

شکاندۆتەوە بێ ئیختیار فرمێسکەکانم دەهاتنە خوارێ و دڵم دەبووبە ئاو. هەفتەیەك بەسەر ئەم ڕووداوەدا چوو ڕۆژێکیان عەسر بوو هەوای گەرمی مورداد مانگێ کلافەی کردبووم نەلە ماڵێم خۆ بەخۆ دەگرت و نە تاقەتی چوونە دەرەوەشم هەبوو لە ماڵێ. هەریەکجاری حەوسەڵەم نەمابوو کە ڕاحیلە بانگی کردم و گوتی:

- ڕەها یەکێك لە دەرکێ تۆی دەوێ.

بێ حەوسەڵە پرسیم:

- کێ هاتووە؟ بەیارمەتی خۆت بڵێ ڕەها لە ماڵەوە نیە.

ڕاحیلە زەردەخەنەیەکی شەیتانانەی کرد وگوتی:

- بەڵام من پێم گوتووە لە ماڵەوەیت، ئێستاش هەروا لەوێیە، بەیارمەتی خۆت تا دەرکی حەسارێ بچۆ بزانە چی دەوێ؟

هەروا کەلەسەر تەختە بەندەکەی هەڵدەستام پرسیم:

- کێیە؟

ڕاحیلە دەو حاڵەیدا کەلە ژوورێ دەچووە دەرێ وەڵامی دایەوە:

- نازانم قەتم نە دیوە.

سەرنجێکی قووڵم دایە ڕاحیلەی باش دەمزانی سەرم دەکاتە سەرێ. لەنێو ماڵێ چوومە دەرێ و بەرەو حەسارێوە چووم. مەهدی لە پشتەوەڕا دەستی دە لاقان وەرێنام و گوتی:

- دایە ئەوە دەچیە کوێ؟ منیش دێم.

ئەوم لەباوەشێ کرد و ماچم کرد. ئەوجا هەروا کە ئەوم دادەنایەوە عەردی گوتم:

- ناچمە چ جێیان ئازیزەکەم، هەتا حەسارێ دەچم، بە یارمەتی تۆ بچۆ دەگەڵ سالاریدا یاری بکە.

سالار بانگی مەهدی کردەوە و هەر بە دیتنێ ئوتۆمبێلۆکەکەی سالاری مەهدی بەرەو لای وییەوەی ڕاکرد و لە من دوورکەوتەوە. چوومە حەسارێ زۆر بە تاسەوە بووم بزانم کێیە لەبەر دەرکێ چاوەڕێمە. کاتێ کە گەیە دەرکی حەسارێ سەرنجە خرپشکنیەکەم بەسەر تاسەری کۆڵانێدا گێڕا کەسم نەدیت. سەرم لە دەرکێ بردە دەرێ و لە پڕ شیرینم بە هەمان پێکەنینە جوانە لە دڵان ئازیزەکەی جارانەوە دیت. بە دیتنێ شیرینی قریشکەیەکی شادیم لێدا و توندم دەئامێزێ گرت هەر دوو دۆست دوای پێنج شەشساڵان فرمێسکی تاسەو خۆشیەمان داباراند و زۆرمان یەکتر ماچ کرد. بە دیتنێ شیرینێ وەکەفوکوڵ هاتبووم و دەپێستی خۆمدا نە

دەحەجمیم. شیرین یادگاری رۆژانێکی خۆش و شیرینی پێشووم بـوو. راحیلـەش لـەلای دەرکـی حەسارێوە راوەستابوو و پێدەکەنی. بە کەفوکولێکەوە پێم گوت:

- ئای کە بەد فەسالّی راحیلە، بۆ زووتر پێت نەگوتم کە شیرینی ئازیزم هاتووە؟

راحیلە تەماشایەکی شیرینێی کرد و گوتی:

- من و شیرین هەردووکمان بڕیارمان دا جەفەنگێکت پێ بکەین.

دەگەڵ شیرین و راحیلەیدا چووینە هۆڵی میوانان و شیرینم لە جاران جوانترو تەڕ و پـاراوتر هاتە بەر چاوان. داوام لێکرد باسێکی باری گوزەران و ژیانی خۆیم بۆ بکا و بڵێ لەکوێ دەژی. شیرین بە کورتی بۆی گێڕامەوە کە مێردی بە پیاوێکی دڵخوازی خـۆی کـردووە و هـەروا بـەو زووانەش دەبێتە خاوەن منداڵ. هەروەها بەردەوامیشە لە خوێندنێ و خۆی و مێردەکەی ئێستا قوتابی دانیشگای پزیشکین ئەوجا شیرین هەڵوێستەیەکی کرد و دە روخسارمەوە ڕاماو گوتی:

- دەموچاو و روخسارت ئەو تەڕو تـۆڵی و گەشـیەی جارانیـان پێـوە نـەماوەو وەك پـیران دیاری، چ باسە وا بە هەر دوو دەستان بە ژیان و بە مێردیەوە نووساوی و خۆت والێکردووە؟

لە گەمەو جەفەنگ ولۆدەگییە شیرنێوە زانیم کەهیچ شتێك دەبارەی ژیانی من نازانێ بۆیە بڕیارم دا هەموو شتێکی بۆ باس بکەم و داواشی لێ بکەم کە قەدری مێرد و ژیانە خۆشـەکەی بەتەك ئەوەوە بزانێت.

دوای گێڕانەوەی بەسـەر هات و ژیانی تفت و تاڵی رابوردووم، شـیرین چـاوی پـڕ بـوون لـە فرمێسك و بەتوندی دەئامێزێی وەرێنام و بەکوڵ گریا. بە دەم گریانێشیەوە گوتی:

- بەڕاستی بە داخەوەم، هەرگیز پێموا نەبوو رۆژێك لە رۆژان ئەو ساتە وەختە تاڵانـە ئـاوا بە چاوی خۆم دەبینم. پێموابوو ژیانێکی ئاسوودە و خۆش و ئارامت هەیـە. ئـەورۆ کـە زانـیم لێرەی نازانی بە چ تاسەو خۆشی و شادییەکەوە هاتمەلات. حەزم دەکرد گوێ لەو قسانەت بگرم و تۆش باسـی ئەو رۆژە خۆشانەی گەڵ مێردەکەتم بۆ بگێڕیەوە کە دەگەڵە ویدا! و بەتەك ئـەوەوە بەسەری دەبەی و رینماییە منیش بکەی دەژیانی ژن و مێردایەتییەدا. بەراستی بە داخەوەم کە رۆژانێکی وا پڕ دەردو ئێش و رەنج و ئازارت بەسەر بردووە ئەوا ئێستا دەزانم ئەو رەنگەت بۆ وا پەرپوەو بۆ هێندە کزو لاواز بـوو وی. شـیرین دەگریـا و منیـشی وەگریـان خـستەوە. دوای سەعاتێکی دی ئەوجا هەستا و خودا حافیزی کرد و بە چاوی بەگریانەوە بەجێی هێشتین بـەلام پێش رۆیشتنێ گفتی دا کە سەرم هەر لێ دەداتەوە و بە تەنیاییم ناهێڵێتەوە.

رۆژەکان یەك بە دوای یەکدا تێدەپەڕین و ئەوە منیش هەر چاوەڕێی رۆژی دادگام.

زیندانییەکی دەچووم کە دوا رۆژەکانی زیندانییەکەی بەسەر دەبات.

رۆژەکان بەسستی تێدە پەڕین و من بۆ رۆژی دادگاو دەرچوونی فەرمانی تەلاقەکەم رۆژ ژمێریم دەکرد. شیرین هەروەك گفتی دابوو هەر چەند رۆژ جارێك دەهاتە سەر دانیم. چەندین جارانم دەگەڵ مێردەکەیدا هاتنە سەردان و دیدەنیە و دیاری جوانیان بۆ مەهدی هێنا بەلام چونکە مێردەکەی خەلکی مەشهەد بوو دوای چەند مانگێکان چوونەوە مەشهەد و رۆیشتن. بە رۆیشتنێ وان ئەو رۆژە خۆش و شادانەش کە دەگەڵ شیرین و هاوسەرەکەیدا هەبوون کۆتاییان هات وەك بڵێی رۆژی خۆشی و شادییەکانی من هەر لە هەوەڵێوە بە کورتی نووسرابن و غەمی رۆیشتنی شیرینێشم هاتە سەر غەمەکانی دی.

ئاخریەکەی رۆژی دادگایە هات. دەگەڵ دایکم و بابمدا چووینە کۆبوونەوەی دادگایەو لەوێ ئامادە بووین. بابم پارێزەری بۆ گرتبووم تا بتوانم بە خێوکردنی مەهدی بەلای خۆمەوە مسۆگەر بکەم و لەلای خۆمی بهێڵمەوە چونکە بابم چاك دەیزانی کە من بەبێ مەهدی هەڵناکەم. پێش دەستپێکردنێ دادگای دەحاڵێکیدا کە زۆر بەکوڵ دەگریام بە بابم گوت:

- تکات لێ دەکەم نەهێڵی مەهدیم لێ بستێننەوە، من دوای، لە دەستدانی ژیانم، ئیدی بەرگەی لە دەستدانێ مندالەکەمم نیە، چونکە لەوە دڵنیام کە محەممەد مەهدی هەر دەداتەوە موحتەرەمێ تا ئاگای لێی بێ، تەنانەت هەر بیر لێ کردنەوەشی دەیترساندم کە چۆناو چۆنی رەفتار دەگەڵدا دەکات لەتاوان هەموو لەشم دەلەرزی.

گریان نەیدەهێشت قسان بکەم، سەرم بە شانی بابم کرد و بە کوڵ گریام. بە وەبیر هاتنەوێ رەفتاری موحتەرەمێ کە چۆناو چۆنی دەگەڵ مندالەکانی خۆیدا رەفتار دەکرد کە هەر لەسەر شتێکی بچکۆلانە چۆنی وەبەر مست و پێلەقان دەدان هەموو لەشم دەلەرزی. یەکێك دەگەڵ مندالەکانی خۆی ئاوابێ و وا رەفتاربکا وەك رۆژی روونا کم لا روون بوو کە خراپتری لە مەهدی دەکرد. لە شێواوی ـ دڵە خوتەیدا زۆر نەمابوو دڵم راوەستێ. بەدڵدانەوەی دایك و بابم تۆزێك هاتمەوە سەر خۆ و ددانم بە خۆمدا گرت و لە دادگای ئامادەبووم. قازی دوای گوێ راگرتنێ لەمن و لە پارێزەرەکەم داوای روونکردنەوەی لە محەممەدی کرد و محەممەدیش هەموو قسەکانی ئێمەی بە درۆ خستەوە. لەبەر ئەو هەموو نەفرەتەی کە بەرامبەر بەو پیاوە هیچ و پووچ و بێ جێیەی دەدڵمدا بوو بە گرانیم هەناسە دەدا و تەنگە نەفەس بوو بووم.

قازی هەوڵی ئاشتبوونەوە و پێکهاتنەوەی من و محەممەدی دەدا بەلام محەممەد بەردەوام سوور بوو لەسەر لێك جودابوونەوێ. کاتێ کە محەممەدیش پێ داگریە پارێزەرەکەمی دیت بۆ مانەوەی

مەهدی و دانەوەی بەمن بە هیچ جۆرێك ئەوەی قبوڵ نەكرد كـە بیداتـەوە بـە مـن. داوام لـە پارێزەرەكەم كرد لە بەرامبەر دانەوەی مەهدی بەمن دەست لـە هـەموو مـافێكی رەوای خـۆم هەڵدەگرم. بەڵام ئەو جارەش محەممەد قبوڵی هەر نەكرد.

كاتێ كە بارو دۆخ و هەڵوێستەكانم ئاوا دیتێ پەشیمان بوومەوە و داوام كرد بـچمەوە سـەر ماڵ و حاڵ و ژیان و ماڵە مێردی خۆم چونكە نەمدەتوانی دەست لە مەهدی هەڵگرم و وازی لێ بێنم بەڵام محەممەد هەر سوور بوو لەسەر تەڵاق دانێم. جا لەبەر ئەوەی دادگاییەكەی هەڵگرتەوە بۆ دانیشتنێكی دی و بەرواری دانیشتنەكەشی بۆ ماوەی مانگێك دانـا و دەستنیـشانی كـرد. دوای تەواوبوونێ دادگای لە پارێزەرەكەمم پرسی:

- ئەگەر محەممەد قبوڵی نەكرد مەهدیم بداتەوە لای من بێ ئایا هیچ رێیەكی یاسایی دیكە هەیە بتوانم پێی لێ بستێنمەوە؟

ئاغای موسەوی كە پارێزەرێكی زێدە دانسقە و بە ئەزموون بـوو بـە داخێكـەوە سـەرێكی باداو گوتی:

- بەداخەوە نەخێر، چونكە مێردەكەتان هیچ بەڵگەیـەكی وای بەدەسـتەوە نیـە كـە دایـك دەتوانێ سەرپەرشتی منداڵەكەی پێ لە ئەستۆ بگرێ، ئێوەش لە رازیكردنی دڵی مێردەكـەتان بەو لاوە هیچی دیكەتان نیە.

بە دڵێكی مات و پرغەموخەفەتەوە دەگەڵ دایكـم و بابمـدا هاتینـەوە ماڵـێ. لـەو سـاتە وەختەوە كە زانیم هیچ رێیەكی دیم بۆ وەرگرتنەوەی نیە جگـە لـەوەی كـە بـچمەوە نـاو ئـەو دۆزەخەی و دەگەڵ ئەو پیاوە سووك و چرووك و هیچ و پووچەیدا بژیم، سەری دنیایـەم لێ وێـك هاتەوەو بەرچاوم تاریك بوو وژیانم لێ تفت و تاڵتر بوو.

لەبەر خاتری مەهدی ئامادە بووم گیانی خۆم بەخت كەم هەر هێندە ئەو لە دەسـت نـەدەم. دوایەش بڕیارم دا بچمە لای محەممەدو قسەی دەگەڵدا بكەم بەڵكە ئێ بتوانم رازی كەم و مەهدی لێ بستێنمەوە. بێ ئەوەی دایك و بابم ئاگادار كەمەوە لەو بڕیـارەی كـە دابـووم بەیانییەكـەی رۆژی دادگایە چوومە ماڵێ محەممەدی. ئەو ماڵەی كە ساتەوەختێكیشم شـادی و بیرەوەرییـەكی خۆش تێدا نەدیبوو، بەڵام محەممەد لە ماڵێ نەبوو سۆراغی محەممەدیم لە ژنی خاوەن خانووەكـەی كرد. بە بیستنێ ناوی محەممەدی شوێنەواری غەمێی بەروویـەوە لكـاو دەسـتی گـرتم و لەتـەك خۆیەوە داینام و گوتی:

- دانیشه با بۆت باس کەم. دەو ماوەیەیدا کە مێردەکەت تۆی ناچاری ڕۆینیٚ کرد لە ماڵیٚ بۆ خۆیشی هەر ناماقووڵیەکی پێی کرا و لە دەستی هات کردی.

بە تاسەوە دانیشتم و گوێم بۆ شل کرد. ئەویش بۆی گێڕامەوە:

- دوای ئەوەی مێردەکەت تۆی لە ماڵیٚ دەرکرد منیش داوام لەوی کرد خانووەکەی چۆڵ کا بەڵام ئەو بەداد و هاوار و بڕۆوە گوتی تا سەروەختی قەرارو بڕیە چۆلکردنێی چەند مانگێک ماون و لە ماڵیٚ چووە دەریٚ و لەو ڕۆژە بە دواوە شەوانەش هەر نەهاتەوە تەنیا ئەو جارانە نەبایە کە شتێکی پێویستبایە هەڵیدەگرت و دووبارە دەڕۆیشتەوە. هەرگیز دیارنیە بۆ کویٚ دەچیٚ و چ کار دەکا.

- ئەو بۆنە چیە وا بەماڵیٚ وەربووە؟

دەگەڵ مێردەکەمدا پێکەوە چووینەوە حەساریٚ ومێردەکەم زانی کە محەممەد ئاغا دەگەڵ چەند برادەرێکیدا هاتۆتەوە ماڵیٚ و سفرەی تریاك و خواردنەوەیان لیٚ ڕاخستووە. مێردەکەم خۆی پیٚ ڕانەگیراو بانگی محەممەد ئاغای کرد و هەرکە هاتیشە دەریٚ داوای لێکرد تا زووە ئەو بەرو سفرەیەی ڕای خستووە بیپێچێتەوە بەڵام محەممەد بەهات و هاوارەوە دەیکوت ماڵیٚ خۆمەو چی حەز بکەم دەیکەم.

لە هات و هاواری محەممەدیەوە برادەرەکانیشی هەموو هاتنە دەریٚ و بە مێردەکەم وەربوون و دەبن شەق و پێلەقانیان نا. لە داد و بڕۆ و هاوار هاواری منەوە دەرو دراوسیٚ هەموو وەسەر ماڵیٚ گەڕان و هێزی نیزامییان ئاگادار کرد بەڵام محەممەد و برادەرەکانی هەموو هەڵاتن. و چونکە شەڕەکەشیان گەیبووە ژوورەکەی ئێوەش مەقاڵە و شتەکانی دی هەروا دەژوورەکەتاندایە ئەگەر حەزت لێبیٚ دەتوانی بێی و بیبینی.

دەگەڵ ئەوەشدا کە چاوم بەرایی نەدەدا حاڵ و باڵی ماڵەکە ببینم بەڵام هەر بۆ ئەوەی بزانم محەممەد چ بەڵایەکی بەسەر ماڵەکەیدا هێناوە چوومە حەسارێوە وبە هەنگاوی لەرزۆکەوە لە حەساریٚ ڕەتبووم وچوومە ژوورەکەم. لە وەزعی ئەو ماڵ و حاڵەی دڵم تێکچووو فرمێسکم بە چاواندا هاتە خواریٚ. چەندین مەتری فەرشە بەنرخ وگرانەکەم سووتا بوو و خەڵووز و خۆڵەمێش بە تەواوی ژووریٚدا بڵاو ببۆوە.

لەبەر شووشەی خواردنەویٚ بۆنێکی ناخۆش هەوای ژوورەکەی داگرتبوو. بەدیتنیٚ ئەو دیمەنەی هەناسێکی قووڵم لە ناخەوە هەڵکێشاو بە ئەژنۆدا هاتم و لە دڵەوە ناڵاندم:

- خودایە ئەو بەختەڕەشە چبوو داتمیَ؟ خودایە ئەگەر هەموو ئەمانە تاقیکردنەوەن ئەوە هەر خۆت پشت و پەنا و یاریدەرم بە تا بەسەر بلّندیەوە لێی دەرچم.

هەروا کە فرمێسکم بە چاواندا دەهاتە خوارێ بەدەم سکالاّوە گوتم:

-بابە و دایە لە کوێن تا بە چاوی خۆتان تەواوی ئەو کەل و پەلانە ببینن کە ڕۆژێ لە ڕۆژان بە هەزار هیواو ئاوات و تاسە و ئارەزووی فراوانەوە بۆ ژیانی کچەکەتان کڕیبوو ئێستا ئەوەتا بۆتە خۆلّەمیش. بابە گەورە دە وەرە و بەختەوەرییە نەوەکەت ببینە. وەرە و بزانە ئەو لاوەی بۆ دابینکردنی ئاییندەت دۆزیمەوە چ بەلاّیەکی بەسەر ماڵ و حاڵ و ژیانی نەوەکەتدا هێناوە! خودایە من هەرگیز لە هۆکاری ئەو کارەی ئابوورم و تۆش لێی مەبوورە.

دوای تاوێك هەستم کرد سەرم دەگێژەوە دێ دە هەوای ژوورەکەیدا خۆ ڕاناگرم و تووشی تەنگە نەفەسی و پشوو سواریە هاتووم، بەگرانی لە جێوە هەستام و چاوێکی پڕ داخ و حەسرەتم بەسەر تاسەری ژوورەکەدا گێڕاو کە ژنە خاوەن خانووەکە ئەمنی ئاوا دیت بن باڵی گرتم و بردمیە ژوورەکەی خۆیان و فنجانە قەنداغێکی بۆ هێنام.

دوای خواردنەوەی چەند فڕە قەنداغێك، حاڵم هێندێك باشتر بوو بەلاّم دیسانەوەش نەمتوانی بەر بەدابارینی فرمێسکەکانم بگرم. دەستم بە دەموچاومەوە نا و لە بانگی گریانێم دا. خانمی خاوەن خانووەکە هەرچی بەسەر زمانیدا دەهات بۆ دلّدانەوەی من دلّی پێ دەدامەوە بەلاّم نەیتوانی تۆزقالێك لەو ئاگرە دامرێنێتەوە کەلە دلّم بەر بوو بوو.

دوای سەعاتێك گریان بۆ بەختی ڕەشم خودا حافیزیم لە ژنە خاوەن ماڵەکە کرد و هاتمە دەرێ. بە چاکی دەمزانی کە محەممەد دەو ماوەیەیدا شەوانە تا بەیانی لە کوێ بووە.

بەرەو لای موغازەکەی محەممەدیەوە کەوتمە ڕێ هەرچەندە دەمزانی لە موغازەکەش نیە بەلاّم هەر بۆ ئەوەی دلّنیابم چوومە موغازەکەی. محەممەد لەوێ نەبوو و شاگردەکەشی هەرکە منی دیت زۆر بەرێزەوە لەبەرم هەستاو بەگەرمی بەخێرهاتنی کردم و لەوەش کەمحەممەد بەڕاستی نیازی دەسبەرداری بوونی منی هەیە زۆری پێ ناخۆش بوو. لە ناخی دلّمەوە سوپاسی خۆی و هەستی ئەو هاودەردیەیم کرد و سۆراغی محەممەدم کرد. سەری بەردایەوە و گوتی:

- ڕاستیت دەوێ خانم، محەممەد ئاغا ئەو چەند ڕۆژانە بەرێکی نایەتە سەر ئیشێ هەر کاتێکیش کە دێنەوە موغازەکە لەبەرمەستی و سەرخۆشیان خۆ بە پێوە ناگرن. ئەلّبەتە هەر لە نێوان خۆماندا بێت، پێموایە ئالّوودە بوو بێ، هەر ئێستا کە لەبەردەمی تۆدام ئەوە چەند ڕۆژە ئەوم نەدیوە بەلاّم لەبەرەوەی من شاگردم و ڕۆژانە وەردەگرم هەموو ڕۆژێ لەکات و

سەعاتی خۆیدا دێم و دەرگای موغازەی دەکەمەوە و شەوانەش دەوەختی خۆیدا دەرگاکەی دادەخەمەوە و هەڵدەگرم. هەرچەندە ئەوە چەند رۆژێکە لەلای باوکتەوە لە دادگای داوای دەکەن، هەروەك کەدەشزانی محەممەد ئاغا تا ئێستا موغازەکەی چۆڵ نەکردووە بۆیە شکاتیشیان لێ کردووە.

لە خۆشیان چاوم دەبریسکانەوە، بابم هەرگیز لەم بارەیەوە هیچی بەمن نەگوتبوو دیاریشە کە دایك و بابم حاڵ و باڵ و رۆژانی من لە خۆم چاکتر دەزانن و شارەزا هەن و نەیانویستووە لەوەی زیاترم تووڕە و نارەحەت کەن. بەقسەکانی شاگردەکەی محەممەدی لە ناخەوە خۆشحاڵ بووم. زانیم کە خودا هەر لەسەر هەقەو محەممەد هەر دەبێ بەسزای کارەکانی خۆی بگا. ئێستا کە ئەو ئالوودە بووە بە دڵنیاییەوە موحتەرەمیش لە ماڵ و ژیانی خۆی دەرداوێ و بەم شێوە من دەمتوانی بەخێوکردنێ مەهدی بە ئەستۆوە بگرم و بیهێنمەوە لای خۆم.

هۆیەکی دیکەی خۆشحاڵیەم ئەوە بوو کە ئەگەر بابم موغازەکەی لە محەممەدی ستاندبایەوە ئیدی هیچ پارەو پوولێکی نەبوو تا بتوانێ موغازەیەکی دی بەکرێ بگرێ بەو هۆیەشەوە کار و سەرچاوەی دەستکەوتیشی لە دەست دەدا و بە لە دەستدانێ کارو ئیشەکەشی من هەنگاوێکی دیش بۆ وەرگرتنەوە و بەخێوکردنی مەهدی دەچوومە پێش.

بە خۆشحاڵیەوەم خودا حافیزی لە شاگردی موغازەکەی کرد و لە موغازەکەی هاتمە دەرێ. دوای خودا حافیزی لە شاگردەکەی محەممەدی بەرەو ماڵێ موحتەرەمیەوە چووم و نزیکەی سەعاتێك لە پەنایەکیەوە راوەستام تا بەڵکە ئێ محەممەد لە ماڵێ موحتەرەمێ بێتە دەرێ بەڵام چ سووسەیەکی نەبوو.

بڕیارم دا تا زووە ئەو گەڕەکە بەد ناوەی بەجێ بێڵم و بچمەوە ماڵێ بابم. زۆر لەوەی دەترسام بابم بەوەی بزانێتەوە کە چوومەتە ئەو گەڕەکە بەدناوەی.

هەنگاوم هەراوتر داویشتێ تازووتر لە کۆڵانەکە دەرچم کە لە پڕ مەعسوومە خانم بەرەو ناو کۆڵانێوەی بادایەوە و تووشی یەك بووین. هەرکە مەعسوومە خانم چاوی پێکەوتم لە خۆشیان هاوارێکی لێ بڵند بوو و بە توندی دەئامێزێی وەرێنام و ماچی کردم و بەمیهرەبانیەوە هەواڵی چاکوچۆنیەی پرسیم و خرپشکنانە گوتی:

- ئەوە ئیشێکت هەیە وا هاتوویە ئێرە؟

وبەر لەوەش من وەڵامێك بدەمەوە ئەو هەر بەردەوام بوو:

دەبێ ببووری لەوەی کە هاتمە ناو لێرە بوونەکەت بەڵام هەر بۆیەشم پرسی چونکە دەزانم هیچ خۆشیەکت لە موحتەرەمێ و لەو گەڕەکەی نەدیوە و ئەو پرسیارەشم هەر بۆیە کرد.

منیش بە حەوسەڵەیەکی تەواوەوە بەسەر هاتەکەم بۆ گێڕایەوە و داوای یارمەتیشم لێکرد. کە مەعسوومە خانمیش لەبەسەر هاتەکە ئاگادار بۆوە گوتی:

- کچەکەم، ئەگەر کەمێك دگان بەخۆتدا بگری ئێستا هەموو شتێکی تێدەگەی. مەعسووم خانم بەڵێنی دا تا بەبیانوویێکیەوە بچێتە ماڵێ موحتەرەمێ و مشومۆڵێکی بکا و بزانێ داخوا محەممەد لە ماڵێ موحتەرەمێیە یانە نا، و هەواڵێکم بداتێ. زۆرم سوپاسی مەعسوومە خانمێ کرد و ئەویش بەرەو ماڵێ موحتەرەمێوە چوو. منیش چووم لە پشت دارتێلی کارەبایەکە چەند مەترێك لە خوارترەوە بوو خۆم پەنادا. مەعسوومە لەبەر دەرکێ ماڵێ موحتەرەمێوە راوەستا و سەیرێکی ئەو لاولای کرد و لە دەرکێی دا. گوێم لە دەنگی کوڕە بچکۆلەکەی موحتەرەمێ بوو کە دەرکەی کردەوە و سڵاوی کرد. مەعسوومە خانمیش بە گەرمیەکەوە وەڵامی سڵاوەکەی دایەوە و زۆر میهرەبانانە پرسی:

- دادەی رۆڵە بزانم دایکت لە ماڵەوەیە؟

کوڕیژگەکە بە دەنگێکی منداڵانەوە گوتی:

- بەڵێ هەر ئێستا بانگی دەکەم.

مەعسوومە خانم گوتی:

- نا ئازیزەکەم، پێی ناوێ بانگی کەی من هاتبووم قسان دەگەڵ محەممەد ئاغایدا بکەم ئیشم بەوی بوو داخوا محەممەد ئاغا لەوێیە؟

دووبارە منداڵەکە بە دەنگێکی بەتام و چێژ و خۆشەوە گوتی:

- نەء ئیدی دایکم نایەڵێ محەممەد بێتەوە ئێرە، ئاخر ئەو لە دایکمی دا و لێی...

دەنگی موحتەرەمێ بەرز بۆوە کە منداڵەکەی بانگ دەکردەوە نەیهێشت قسەکەی تەواو کات. موحتەرەم هەر لە حەسارێوە پرسی:

- مەسعود ئەوە دەگەڵ کێدا قسان دەکەی؟

مەسعود دە وەڵامی داکیدا بە دەنگێکی بەرزەوە گوتی:

- یەکێك هاتووە ئیشی بە مامە محەممەدیە.

دەنگی هەنگاوە خێرایەکانی موحتەرەمێ بەرز بۆوە کە بە پەلە بەرەو دەرکی حەسارێوە دەهات هەروا بەدەم هاتنێوە بە دەنگێکی بەرزەوە گوتی:

- ئەو نا پیاوە ناما قوولّی دەکا مامی تۆ بێ، نا پیاوەی نامەردە, تۆش برۆ بـابزانم ئـەوە کێیە ئیشی بەو ناپیاوە خوێڕیە هەیە.

موحتەرەم هاتە بەر دەرکێ و بە دیتنێ مەعسوومەی وەك دەڵەشێری نەڕاندی:

- چیە، چتدەوێ؟ ئەوە چیە هەر کەسێکی ئیشی بەو ناپیاوە سەگبابە بوو روو لێرە دەکات و دێتە ئێرە بە دوایدا: بۆ مەگەر من لە لـەو قەرەواشـی ئـەوم کەسەروسـۆراغی لـەمن و لـە منداڵەکانم دەکەن؟

مەعسوومە خانم بە دەنگێکی بە ئەدەبانەوە گوتی:

- سڵاو موحتەرەم خانم،راسـتیەکەی مێردەکـەم دەیویـست کراسـێکی بـدروێ چـوو بـووە موغازەکەی لەوێ نەببوو، هەر بۆیە گوتم ڕەنگە هاتبێتەوە ئێرە، ئاخر بیستوشمە کـە بەتـەمان پێکەوە زەماوەند بکەن، پیرۆزە ئیشاڵڵا.

مەعسوومە خانم هێندێك راوەستاو ئەوجا درێژەی دایەوە:

- گوتم رەنگە هاتبێتەوە سەرێك لە ئێوە و لە منداڵەکان بدا.

موحتەرەم وەك بڵێی داغی دڵی تازە بوویێتەوە هەناسێکی هەڵکێشاو گوتی:

- کێ گوتی من دەمەوێ مێردی پێ بکەم؟ خەڵکی بێ ئیشن هەر دادەنیـشن و قـسان بـۆ ئیدی هەڵدەبەستن. بە خودای ئەگەر ئەو ناپیـاوە پـێ دێرەدەنێتـەوە وا دەکـەم هـەر دوو پێـی بشکێنن، نا پیاوێکی فێڵباز، پێپوابوو شەیداو عاشقی چاو و برۆی بوو وم و ئێرەش نوتێلە کـە هەردەم و ساتێك وەرێ کەوێ و بێتەوە ئێرە و داوای پووڵ و پارەی بکا. خوا بـۆ خـۆی دەزانـێ چەند رۆژێك لەمەوبەر هاتبۆوە ئێرە و داوای شتی لێ دەکردم، منیش منـداڵ و تـاڵ و کـوڕو کاڵی گەرەکێم لێ قاودا شتێکی وای بدەنی تا ماوە تامەکەی هەر دەبن زمانیدا بێ و لە بـیری نەچێتەوە. جا لەو رۆژەوەی کە منداڵـەکانی پـێ ڕاگەیـشتن ئیـدی لـەو دەمیـەوە بـەم نـاوەدا نەهاتۆتەوە و.

مەعسوومە خانم سوپاسی موحتەرەمێی کرد و پێش ئەوەی کە موحتەرەم دەرکێ داخاتەوە پرسی:

- ئێوە نازانن لە کوێی دەتوانین ببینینەوە؟

موحتەرەم زۆر بەبێ قەیدیەوە وەڵامی دایەوە:

- چووزانم رەنگە لە گۆرستانێی وە بینن، هەر چەندە پێم وانیە خـاکیش وەخـۆی بگـرێ و بتوانێ دەگەڵی هەڵکا.

دوایە موحتەرەم دەرگاکەی بە توندی پێکدادایەوە. مەعسوومە خانم بە لێوی پڕ لە پێکەنینەوە بەرەولام هاتەوە و گوتی:

- گوێت لێبوو؟ موحتەرەمیش دەریکردووە، هەرچەندە ئەو ژنە دەستی سیحربازانی لە دواوە بەستۆتەوە و نابێ نەبە خۆی و نەبەقسەکانی بڕوا بکەی بەڵام من هەر لەسەر هەستم و ئاگام لێیە تا ئەگەر دەو گەڕەکەمدا دیت دەستبەجێ ئاگادارت دەکەمەوە.

زۆرم سوپاسی هەموو ئەو هاریکارییانەی کرد کەبێ دریغیانە دەگەڵیدا کردووم و بەرەو لای ماڵێ بابمەوە کەوتمەوە ڕێ. لە ناخی دڵەوە بەو هەواڵانە خۆشحاڵ بووم کە وەدەستم هێنابوون و زۆرم سوپاسی خوای دەکرد کە محەممەد هەر بە زوویەکی زوو ڕووی ئەو دیوی دیکەی ژیان ببینێ.

گەیشتمەوە ماڵێ و چوومەوە ژووری و دایکم لە دەنگێ داخستنەوەی دەرکێ هاتە نێو حەساریوە و بە پەلە بەرەو لامەوە هات و بە دەنگێکی نیگەرانەوە پرسی:

- ڕەها، ئەوە دەزانی چوو بوویە کوێ؟ ئەو منداڵە هێندە گریاو و نارەحەت بووە هێزی تێدا نەماوە.

مەهدی کە بەڕاکردنەوە بەرەو لامەوە دەهات بە لوورەییەوە پرسی:

- لە کوێ بووی؟ ئەدی بۆ ئەمنیشت نەبرد؟

و بەدەنگی بەرزەوە لە بانگی گریانێی دا. بە میهرەبانیەوە بلندم کرد و بە توندی دەباوەشێ خۆم وەرێنا و بە خۆمەوەم گوشی و ماچم کرد. مەهدی هەروا بەرکەوە خۆی هاویشتەوە باوەشی دایکم و ڕووی لە من وەرگێڕا. خۆم بۆ نارەحەتیە وی ڕانەگرت بۆیە سەر لە نوێ لە باوەشی دایکمم کردەوە و دە باوەشێم وەرێنایەوە. دوو دانە شۆکۆلاتەم لە جانتایەکەم دەرێنان، و دامنە دەست مەهدی و گوتم:

- یەکیان بۆ کاکە مەهدی گوڵ و یەکیش بۆ خاڵە سالار.

مەهدی بە دیتنێ شۆکۆلاتەکان نارەحەتیەکەی لە بیرچۆوە. هەر دوو شۆکۆلاتەکانی دەمستی خۆیدا گوشین و گوتی:

- نەخێر، هەر دووکیان ئی خۆمن نایدەمە خاڵەی.

گوتم:

- ئەگەر بەڵێن بدەی کوڕی چاك بی و بە دوای دایەیدا نەگریەی ئەوە با هەردوو شۆکۆلاتەکان بۆ خۆت بن... باشە ڕۆڵە بەڵێن دەدەی؟

مەهدی بەجیا لە ئارەزووی ناخی ناوەوەی و هەر بۆ ئەوەی شۆکۆلاتەکان بینە ئی وی بەسەر ڕاوەشاندنێکەوە ڕەزامەندی دەربڕی. مەهدیم دانایەوە و گوتم:

- دەی ڕاکە بچۆ شوکۆلاتەکانت بخۆ تا من و دایە گەورەت هێندیك پێکەوە قسان بکەین.

مەهدی بەرەو ناو ماڵێوەی ڕاکردەوە و دایکم کە هەر چاوی بە دوایەوە بوو گوتی:

- لە بەیانییەوە تا ئێستا دڵم هەزار ڕێی کردووە، تووشی دڵە خوتەیەکی واببووم هێندەی نەمابوو دڵم ڕاوەستێ، ئێستا پێش هەموو شتێك جلەکانت بگۆڕە و ئاوێکی بە دەست و دەموچاوتدا بکە و وەرەوە مەتبەخێ منیش دەو نێوەیدا چایەکی لێ دەنێم.

سوپاسی دایکمم کرد و چوومەوە ژوورەکەم. لەبەر ئاوێنەی راوەستام و بە وردی دە ئاوێنەکەمدا سەیری خۆم کرد و دەستێکم بردە ناو قژەکانمەوە و بەلایەکمدا خستن و بە دیتنێ چەند تاڵە موویەکی سپی هەناسێکی قووڵم هەڵکێشا و بە خۆمم گوت:

- خودا هۆکاری زوو پیر بوونێم بە لەعنەت کا. باشە کام ژنێك دەو ساڵ و تەمەنەی مندا هێندە مووە سپییەی دەسەرو قژیدایە؟

بە دیتنێ مووە سپییەکانی سەرم نارەحەت بووم و ڕووم لە ئاوێنەکە وەرگێڕا.

جلەکانم بە پەلە گۆڕین و چوومە مەتبەخەکە. حەزم نەکرد دایکم ئەوەندە دەچاوەڕوانیدا بهێڵمەوە. دایکم بە پیالەیەك چای تازە دەم و قاپێك شیرینییەوە پێشوازی لێ کردم و منیش تەواوی بەسەرهاتەکانم بۆ گێڕایەوە. دایکم سەرێکی ڕاوەشاند و بە وردی گوێی دایە قسەکانم. لە کۆتایی قسەکانمدا لێم پرسی:

- ئەدی بۆچی تۆو بابم هیچتان بەمن نەگوت کە شکایەتتان لێ کردووە؟

دایکم سەرنجێکی میهرەبانانەی تێکرتم و گوتی:

- چونکە حەزمان نەدەکرد نارەحەتت کەین. پێمو بوو هەر بۆ خۆت لە نەگەری لە دەستدانی مەهدی نارەحەت بووی ئیدی من و بابیشت پێمان ڕاست نەبوو ئەوەندەی دیشت نارەحەتی بۆ زیادکەین.

زەردەخەنەیەکم بە ڕووی دایکمدا کرد و گوتم:

- تکا دەکەم لێرە بە دواوە هەر باسێك کە پەیوەندی بە محەممەدیەوە دەبێ بەمنیشی بڵێن، بەڵێن دەدەن؟

دایکم بە میهرەبانیەوە سەرێکی لە قاندو گوتی:

- بەڵێن دەدەم.

رەها لەقسان وەستایەوە و گوتی:

- ئێوە ماندوو نەبوو ون، من بەڕاستی خەوم دێت و ئەگەر قبـوولّ بفـەرموون پاشماوەکـەی بەیانی درێژە پێ دەدەین. من لەبەر ماندووەتیان بە زەحمەت چاوم بۆ هەڵدێن.

رەبابە خانم کە هەروا باوێشکی دەدان گوتی:

- من زۆر دەمێکە خەوم دێت بەلاّم پێم حەیف بوو بچم و بنووم.

منیش نووسینەکانم رێکخستنەوە و گوتم:

- بۆ ئەم شەو بەسـە چونکە پەنجەکانم توانایان تێدا نەماوە چەند دێڕێکی دیـیان پێ بنووسم.

هەر سێکمان لە جێوە هەستاین و هەریەکەمان چووینەوە ژوورەکانی خۆمان. ئـەو ژوورەی ڕەها دابوویە من تابلّۆی زۆر شیك و دیکۆرێکی جـوانی هـەبوو، کـە هـەر لـە یەکـەم چـوونە ژوورەوتـیمدا پێ خۆش بوو.

پەردە تۆڕییە سپییە ئەتڵەسیە بەنرخەکان ژوورەکەیان جوان و کراوە و شیکتر کرد بوو.

تەختە بەندێکی تاك کەسی بە چەرچەفێکی ساتانی گوڵداری کاڵەوە داوەتی هەر بینەرێکی بۆ سەعاتێك پشوو دەکرد.

لەسەر تەختەکە راکشام و هێندێکم دەنێو جێیەکەیدا ئەولاولاکرد و دەو نێو رووناکیە کـزو کەم رەنگیەو دەو نێو شەوە کەم تروسکاییەی خەوێدا کەوتمە سـەیر و تەماشـاکردنێ هـەموو کون و کەلەبەرو گۆشەو پەناو پەسیوی ژوورێوە.

تا بلۆیەکی چوار وەرزی بە دیواریـەوە خـۆی پێـشان دەدا. لەتەختەکـەی هاتمـە خـوارێ و گلۆپەکەم پێکرد. دەگەڵ ئەوەشـدا کـە زۆر جـاری دیـشم تەماشـای ئـەو تابلۆیـەی کردبـوو، دیسانەوەش هەر حەزم دەکرد چەند دەقیقەیەکی دیکەشی بەرامبەر راوەستم و بە وردی وەرز بە وەرزی تابلۆیەکە سەیرکەمەوە و خۆم دەنێو دیمەنـەکانی هـەر وەرزێکیـدا بەرجەسـتەکەم. بـێ ئیختیار دەبەر جەستەکردنێ خۆم دەدیمەنی وەرزی زستانێدا سەرمام دەتەواوی لەشی گەڕا و بێ راوەستان گلۆپەکەم کوژاندەوە و چوومە دەنێو جێیەوە و ڕاکـشام. چـاوم لەسـەر یـەك دانـان. هێندە ماندوو بووم بە پێچەوانەی شەوەکانی دییەوە دەستبەجێ کەوتمـە نـاو شـیرین خـەوێکی قووڵەوە.

(١٠)

بە چەند لێدانێکی نەرم و لەسەرخۆی دەرکێ چاوم کردەوە و بەسپایی گوتم:

- فەرموو بۆ ژووریّ دەرگا کراوەیە.

رەبابە خانم هاتە ژووریّ، لەسەرخۆ سەلامی کرد و گوتی:

- قاوەڵتی ئامادەیە بفەرموونە سەرمێزیّ، خاتوون چاوەڕێی ئێوەیە تا پێکەوە نان بخۆن.

- هەر ئێستا دێم.

لەتەختە بەندەی هاتمە خواریّ و سەیرێکی کاتژمێرە بچکۆلەکەی سەر مێزەکەم کرد سەعات (٩) نۆی بەیانی بوو.

جووتە نەعلێکی کولکنی وەك مشکێم لەسەر فەرشەکەی چاوەڕیّ بوو. بەپەلە نەعلەکانم بەسەر پێوە کرد و ئاوێکم بە دەست و دەموچاومدا کرد و دوای چەند دەقیقێکان خۆم ئامادەکرد.

کاتێ کە چوومە هۆڵیّ رەها لەویّ نەبوو. رەبابە خانم لە ناو مەتبەخێوە بانگی کرد و گوتی:

- سپێدە خانم، فەرموون، خاتوونیش هەر لێرەیە.

چوومە مەتبەخیّ و رەها بەگەرمیەوە بەرەو پیلم هات و فەرمووی سەرمێزی قاوەڵتییەی لیّ کردم. داوای لێبووردنم لە درەنگ هەستانێم لیّ کرد، رەها قسەکەی پیّ بریم و گوتی:

- منیش هەروا تازە لە خەویّ هەستاوم. گوناهی منە کە بەقسەکانم تا درەنگانێك نەمهێشتووە پشوویەك بدەن و بحەسێنەوە.

رەبابە خانم پرسی:- سپێدە خانم حەزت لە فنجانێك قاوەیە یا پیاڵەیەك چا؟

- بەیارمەتی خۆت فنجانێك قاوە.

رەبابە خانم ترك فنجانێك قاوەی لەبەردەمی دانام و مێزەکەشی بە قوتووە مرەباو کەرە و پەنیر... رازاندەوە. بە خواردنەوەی قاوەکە بە تەواوەتی خەوەکەم رەویەوە و یەکجاری هاتمەوە

سەر خۆ. دوای قاوەڵتییە دەگەڵ ڕەهایە چووینە شت کڕینێ و سەعاتێکمان پێچوو ئەوجا هاتینەوە ماڵێ. هەرکە چووینەوە ژووریّ ڕەبابە خانمان بە پیلەوە هات و زەرفی میوە و هەموو شتەکانی دیشی لە دەست وەرگرتین و بردنیە مەتبەخێ.

دوای خۆ گۆڕینێ دەگەڵ ڕەهایدا چووینەوە هۆڵێ و ڕەبابە خانیشمان بە پێشوازیەوە هات. ڕەها بە بێدەنگیەوە چاوەڕێ ما تا ڕەبابە خانیش کارەکانی دەستێك پێداهێنان و هاتەوە لای جەمێ. ڕەها دوای پێشەکییەکی کورت بەم جۆرەی درێژە بە قسەکانی دا.

* * *

ئەو ڕۆژە مەهدی ئاڵۆز بوو، چەند ڕۆژێك بوو نە دەحەوایەوە و هەر بیانووی دەگرت و بە قسە منداڵانەییەکانی دڵی من و هەموو کەسوکارەکانی هەڵدەپڕووکاند. مەهدیم دەنامێز گرت و ماچم کرد، ئەوجا لەسەر قاچەکانم دانا و لە سەرخۆ ڕامژاند تا بینوێنم کە دەنگی تەلەفۆنێ بەرز بۆوە و پاش تاوێك ڕەیحانە بانگی کردم و گوتی:

- ڕەها، خانمێك ناوی مەعسوومەیە و ئیشی پێتە.

بە پەلە مەهدیم دایە ڕەیحانەی و گوشییەکەم هەڵگرت. مەعسوومە خانم گوتی:

- ڕەها گیان، نزیکەی نیو سەعات لە مەوپێش منداڵەکان محەممەدیان دیوە چۆتەوە ماڵێ موحتەرەمێ، ئەگەر دەتەوێ بیبینی ئەوە زوو وەرە.

سوپاسیم کرد و تەلەفۆنەکەم دانایەوە. بەپەلە لە ماڵێ دەرچووم و خۆم گەیاندە ماڵێ موحتەرەمێ. مەعسوومە خانم لەسەری کۆڵانێ لە چاوەڕوانی خۆمدا دیت. چوومە پێشێ و سڵاوم کردنەویش بە میهرەبانیەوە وەڵامی سڵاوەکەی دامەوە.

ویستم بەرەو لای ماڵێ موحتەرەمێوە بچم و پاڵ بە زەنگی دەرکێوەنێم بەڵام مەعسوومە خانم نەیهێشت و گوتی:

-بەلای منەوە هەر لێرە چاوەڕوان بی باشترە، ئەگەر موحتەرەم بزانێ نیازی قسەکردنێت دەگەڵ مێردەکەتدا هەیە حەتمەن ناهێڵێ.

بۆچوونەکەیم بەلاوە پەسند بوو و دەچاوەڕوانیەدا ڕاوەستام. مەعسوومە خانم گوتی:

- مێردەکەت من بەلای تۆوە نەبینێ باشترە.

ئەوجا خودا حافیزی کرد و لەمن جودا بۆوە. سەعاتێکی چاوەڕوانیە تێپەڕی بەڵام محەممەد هەواڵێکی نەبوو. دەبیرو خەیاڵانەوە چوو بووم داخوا کە ڕووبەڕووی محەممەدی بوومەوە چی پێ

بلێم. جارجاره ڕاگوزەرانێك بەلامدا تێدەپەڕین و سەرنجێکی سەرتاپای منیان دەدا، وەك بپرسن کەمن بۆ لێرە وەستاوم.

بەدەنگی کرانەوەی دەرکەی ماڵێ موحتەرەمێ بە خۆهاتمەوە، هەر بەهاتنەدەرێ محەممەد هەستی منی کرد و پێی زانیم و بە سەرنجێکی ڕکاویەوە گوتی:

- مار سیری دەدزا سیریش دەچوو لە دەرکی کونێ شین دەبوو.

چوومە پێشێ و گوتم:

- محەممەد دەمەوێ هێندێکت قسە دەگەڵدا بکەم.

محەممەد بە توندییەکەوە گوتی:

- ئێمە هیچ قسەیەکمان دەنێواندا نەماوە بیکەین. ئێستاش تا زووە لە چ ڕێیەکیەوە هاتووی هەر بەوێشدا بگەڕێوە و برۆ حەزناکەم بە دیتنێ تۆ ماڵێ لە خۆم خراپ کەم و لەوەش زیاتر بەدبەخت و چارە ڕەشتربم.

بە پاڕانەوەوە گوتم:

- تکا دەکەم هەروا چەند دەقیقێکانم گوێ لە قسەکان ڕاگرە.

محەممەد بە دەنگێکی مەیلەو بەرزەوە هاواری کرد:

- ڕاوەستە باقسێکت پێ بلێم و خەیاڵت ئاسوودەبێ و دڵت داکەوێ، بەلای منەوە هەم تۆ و هەم مەهدی و هەم ئەو ژیانە هەموو لە هەموو مردوون. تێگەیشتی یانە نا؟ ئێستاش وازم لێ بێنە کە هەرگیز حەوسەڵەی تۆو گریانەکانتم نیە.

محەممەد کەوتە ڕێ منیش بەپەلە کەوتمە دوای. هەر محەممەد دەڕۆیی و منیش لە دواوەی دەرۆیشتم و لێی دەپاڕامەوە. ئیدی شانازییە خۆمم لەبن پێ نابوو و خۆم دە زەلکاوێ هاویشتبوو و لەو پیاوە هیچ و پووچ و ناکەس بەچەیە دەپاڕامەوە ئەویش هەر تەنیا لەبەر کوڕەکەم. بۆ ئەوەی هەر نەبێ سێبەری دایکی لەسەر نەبڕێ. هەرکاتێکی مەهدیشم وەبیر دەهاتەوە ئاگرم دە دڵ و هەناوان بەردەبوو، باشە بۆ دەبێ کوڕەکەم لە بابێکی دڵسۆز و میهرەبان بێبەش بێ، بۆ دەبوو هاتبایەتە دنیایە و بابێکی وەك محەممەدی هەبایە. پێموابوو ئەگەر بتوانم محەممەدی ڕازی کەم مەهدیم بداتەوە بەلانی کەمەوە دەتوانم هێندێکی لەو ناکامیانە بۆ پڕکەمەوە و هەر ئەوەش بوو هۆی ئەوەی هێندە لەو پیاوە چەپەڵەی بپاڕێمەوە. محەممەد تاوێك وەستا و ئاوڕێکی لێ دامەوە. سەیرێکی دەموچاویم کرد لەو سەرنج و ئەیما پڕ لە

هێمایانەی و لەو زەردە خەنە شەیتانیەی بە لێویەوە بوو یەکپارچە هەموو لەشم لەرزی. محەمەد سەرنجێکی سەر تاپای دام و بە ئاوازێکی تایبەتیەوە گوتی:

- تەنیا بەیەك مەرج رێ دەدەم مەهدی لای تۆبێ ئەویش ئەوەیە کە باوکت موغازەکەو نیوەی سامان و داراییەکەی بەناوی منەوە بکات.

لەوقسانەی ئەو هەنگاوێك بەرەو دواوە هاتمەوە. سوودی لە گریان و پارانەوەکانی من دیبوو و نیازی هەبوو بەوە ناچارم کات مەبەستەکانی بێنمە دی و پێیان رازیبم. بەسەرنجە ناباوەڕییەکانم تێمەوە روانی بەلاَم نەمدەزانی چ وەلاَمێك بدەمەوە. ئەگەر قبولَم کردبایە بە دەستی خۆم دەبوومە هۆی ئەوەی هەموو رۆژێ بەبیانووە جۆراو جۆرەکانیەوە خواست و حەز و ئارەزووەکانی بەسەر من و کەسوکارو بنەماڵەکەمدا بسەپێنێ. خۆ ئەگەر قبولیشم نەکردبایە دەبوو ئایندەی مەهدی بە کۆتایی و نابووتی و ناکامی ببینم و دەمدیت. کەمحەمەد بێدەنگیە منی دیت هێندێکی غیرەت بزووت. هەنگاوێك هاتە پێش و گوتی:

- ئەگەر رۆژی دادگا باوکت بەسەنەدو کۆمپیالە موغازەکە و نیوەی سامان و داراییەکەی بەناوکردم ئەوە باشە دەنا داخ و غەم و خەفەتی دووریە منداڵ و کچە دوردانەکەی هەلگرێ.

محەمەد کەوتەوە رێ و بێ ئەوەی هەر تەنانەت تیلە چاوێکیشم داتێ دوورکەوتەوەو لێیدا رۆیی. بە هەنگاوی شل و شۆقەوە هاتمەوە ماڵێ. هەمیشە لە هەلێکی دەگەڕام تا سەری باسەکە دەگەلَ دایك و بابدا بکەمەوە و بەسەرهاتەکەیان پێ بلێم. کاتێ کە هاتمەوە ماڵێ بابە گەورە لە ماڵێ مەبوو. بێ ئەوەی بچمە هۆڵی میوانان چوومەوە ژوورێ و دەرکەم داخست. دایکم هاتە پشت دەرکێ و داوای لێ کردم تا دەست لەو مانگرتنەی هەلگرم و واز لەو منداڵ بازاڕیەی بێنم و بچمە لای بابە گەورە. هەروا کە لە گۆشەیەکی ژوورەکەوە دانیشتبووم ودەستم دە ئەژنۆیان وەرێنابوو گوتم:

- تووبی و خودا دایکە وازم لێ بێنن، بە چ زمانێکی بێم و قسانی دەگەڵدا بکەم ئەوەش هیچ کە هەرگیز هۆکاری بەدبەختیەکانم ببوورم و گەردەنی ئازادکەم. ئەوە ئێوە ئاگاتان لە حاڵ و رۆژی من نیە و نابیینن؟ توو مەرگی خۆتان ئەو هەموو نارەحەتی و بێ ئۆقرە و ئارامیەی مەهدی نابینن؟ ئەوەکێ وەلاَمدەرەوەی من و مەهدیە؟ کێ بوو بلێ من دەبمە کەفیلی ئەو گەنجۆیە؟ ئەوەکێ بوو بێ ئەوەی من هەر بە مرۆڤیش دابنێ گفت و بەڵێنی منی بەو ناکەس بەچەیەدا؟ باشە جگە لەوەی کە ئەو رۆژانە بابەگەورە منی وەك شتێکی زۆر بێ نرخ تەماشا

دەکرد ومنی بەمێرددا هیچی دی هەبوو تا تووشی ئەو بەدبەختیەی کردم ورێی بۆ ئەوانیـدیش خۆش کرد؟

ئێستاکە بە نیاز و مەبەستی خۆی گەیوە چیدیکەی دەوێ؟ یـا دەیهـەوێ ئـێش و ئـازار و مەینەتییەکانم ببینێ و سەیریان کا؟ ئەوە ئێستا بۆیە هاتووە تاقەد و باڵاو پشتە چـەماوەکەی من ببینێ، پێی بڵێن ئەوە هەر جارێك بوو دەنگم نەکردو هیچم نەگوت و تاوانێکی گەورەم لـە خۆم کرد و باجەکەیم دا بەڵام هەرگیز ئامادەنیم جارێکی دی بیبینمەوە. پێشی بڵـێن کەئیـدی تازە ئەو نەوەیەکی نیە بە ناوی رەهاوە. رەها مردووە، مردوو.

بە دەنگێکی بەرزەوە دەگریام و لەسـەر و پۆتەڵاکی خۆمم دەدا، ئیدی خۆمم پێ ڕانەدەگیراو بەرگەی ئەو هەموو دەمارگرژیەم نـەدەگرت و لـە توانامـدا نـەمابوو. بەرگـەی ئـەو هـەموو ناخۆشیانەم نەدەگرت. دایکم بە دەنگێکی لەرزۆکەوە گوتی:

- تکات لێ دەکەم ئازیزەکەم، هەر چۆنێکی بێ خۆت ڕاگرە، باشە من بە بابەگەورە دەڵـێم کە رەها هێشتا نەهاتۆتەوە، بەس تەنیا ئەوەندە بەڵێن بدە کە ناگریەی.

دایکم رۆیی و سەر لە نوێ بێدەنگییەکی کشومات تەواوی ژوورەکەی داگرتەوە. فرمێسـکی چاوەکانیشم ئەوا هەر وەك دوو رووبار بە لووزەو دەهاتنە خوارێ. دوای سـەعاتێکی گـوێم لـە خودا حافیزیە بابەگەورەی بوو. ماڵێی بەجێهێشت و رۆیی و ئەوە منیش هـەروا لـە کـونجێکی ژوورەکەوە دانیشتووم و بیردەکەمەوە. لە هـەلێکی دەگـەڕام تـا سـەری قـسان دەگـەڵ بابمـدا بکەمەوە. دەمی نانی ئێوارێ دایکم بانگی کردمە سەر سفرەی ناخواردنێ.

بە چاوی هەڵاوساوەوە چوومە سەر سفرەی و لەسەرخۆ سڵاوم کرد. بابم و دایکم هەردووکیان بەسەرنجێکی غەماویەوە وەڵامی سڵاوەکەیان دامەوە. هەموو جارێ مەهدی لەسەر سفرەی نانی ئێوارێ ورك (گروو) ی دەگرت و دەگریا. بابم بەبێ حەوسەڵەییەوە گوتی:

- ئیدی تێماوم چبکەم تا بەڵکە ئێ بتوانم نەهێڵم رەها و کوڕەکەی لێك هەڵ ببڕێن.

هەروا کە سەرم بەردابۆوە گوتم:

- رێیەك هەیە بەڵام دڵنیانیم لەوەی کە قبووڵی کەن.

بابم بەسەرسامیەوە سەیرێکی کردم و گوتی:

- هەر چیەکی بێ قبووڵمە من بۆ گێڕانەوەی تۆ و منداڵەکەت بۆ سەر ماڵ و ژیانی خۆتان هەرچییەکم لە دەست بێ دەیکەم، ئێستاش تۆ پێتوایە دەبێ چبکەم؟

سەرم بەرزکردەوە و گوتم:

- ئەورۆ محەممەدم دیت و قسەشم دەگەڵ کرد.
بابم و دایکم هەردووکیان بەیەك دەنگ گوتیان:
- محەممەدت دیوە و قسەشت دەگەڵدا کردووە؟
وەڵامم دایەوە:
- بەڵێ قسەم دەگەڵ کرد، زۆریشی لێ پاڕامەوە تا رازی کەم مەهدیم بداتەوەو بەمنی بسپێرێ بە خێوی کەم بەڵام محەممەد دەوەڵامی مندا گوتی تەنیا بەمەرجێك ئەویش ئەوەیە کە بابت موغازەکەو نیوەی سامان و داراییەکەی بە ناوی منەوە بکات.
بابم سەرێکی لەقاندو گوتی:
- دەبێ بەو ئاواتەوە سەر بنێتەوە. هێندەی دەرەتێنم تا لە خۆی بێزار دەبێ.
شەوێ دەخەونێمدا دیتم کە دەست بە دەستی مەهدییەوە ئەوە لەبەر محەممەدی هەڵدێین.
بابم بەسواری فڕۆکەیەکەوە من و مەهدی لە دەست محەممەدی رزگار کرد. بە هەراسانیەوە لە خەو ڕاپەڕیم و ئەو خەونەی کە دیبووم هێنامەوە بەرچاوی خۆم. بۆ تا ئێستا بۆ ئەوە نەچوو بووم، بۆ لەجێی ئەوەی هێندە لە محەممەدی بپاڕێمەوە بیرم لە هەڵاتنێ خۆم و مەهدی نەکردۆتەوە. بە دۆزینەوەی رێگایەکی وا زۆر خۆشحاڵ و شادو شەنگوڵ بووم و تا ماوەی چەند سەعاتێکان تا بەیانی هەر خەریکی لێك دانەوەو نەخشەو پلان دانان بووم.
بەیانی رۆژی دواتر کەوتمە کۆکردنەوەی کەل و پەل و پێویستیەکانی خۆم و لە نێوان شتەکاندا ناسنامەی خۆم و مەهدیم دەرێنان هەر چەندە ئەوانە ئەو شتانەش نەبوون کەمن لێیان دەگەڕام. بە دوای ئەو پەساپۆرتەوە بووم کە دوای دووەم جاری چوونەوەم بۆ لای محەممەدی دەرم هێنا بووکە بە هیوای سەفەرێکی کورتیلەی دەرەوەی وڵات بووم.
وێنەی مەهدی بە پاسپۆرتەکەوە بوو و بەبێ هیچ بەربەستێك دەمتوانی لە وڵاتی دەرکەم.
ئەو رۆژەی کە بەنیازی دەرێنانی پاسپۆرتیش بووم محەممەد بۆ ئەوەی خۆی لە دەست ڕاکە ڕاکە و وەرە و برۆیە رزگارکا بە تەواوی رەزامەندییەوە هەرچی مامەڵەی کارەکان هەیە هەمووی دابوونەوە من و زۆر بە ئاسانی و بەبێ دەردە سەری وینەی مەهدیشیان لە پاسپۆرتەکەی من دابوو. دوای ئەوەی کە پاسپۆرتەکەم دۆزیەوە بەخۆشحاڵیەوە لە ماڵێ هاتمە دەرێ و بۆ بلیت کڕین و پەیدا کردنێ ویزەی هەنگاوم نا.
تەنیا چەند رۆژێکی مابوو بۆ فڕینێ کە ماڵەوەمانم لەو باسەی ئاگادار کردەوە.
باوکم و دایکم هەردووکیان بە هەوتیەوە سەیری منیان کرد و بابم بە سەیرێکەوە پرسی:

.تەوێ دەگەڵ مەهدیدا هەڵێی؟ باشە بۆ کوێ؟

ـ دەگەڵ مەهدیدا دەچینە دوبەی ولەوێشەوە بۆ وڵاتی...

بابم هاتە نێو قسەکانەوە و گوتی:

- بەڵام ئەمە کارێکی نایاساییە، تۆ ناتوانی ئەمە بکەی.

- کام یاسا؟ ئەو یاسایەی کە هەرچی مافێکی دایکە دەیخاتە ژێرپێ. یاسایەك کە نیازی هەیە من و جگەر گۆشەکەم لێکتر دابڕێ؟

- بەڵام ئازیزەکەم تۆ ناتوانی بەبێ ئەنجامدانی پێشەکیە کارەکان لە وڵاتی بچیە دەرێ.

- هەموو پێشەکییەکان تەواو بوو ون و سێ رۆژی دیکە دەگەڵ مەهدیدا دەفڕین.

دایکم بەنیگەرانیەوە سەیرێکی من و بابی کرد. سالاریش وازی لە یاری هێنابوو و سەیری ئێمەی دەکرد. دایکم بە پاڕانەوەوە گوتی:

- باشە لە وڵاتی غەریبایەتیەدا بە خۆت و بە منداڵێکیەوە، چدەکەی؟

- خوا گەورەیە، کارێکی هەر دەکەم.

- کارێکی هەر دەکەم چیە، ئەوە نەبووە وەڵام، ئەدی نابێ بزانین تۆ چیت دەمێشکیدایە؟

- کاتێ کەلە دوبەی جێگیر بووم ئەو دەمی پەیوەندیتان پێوە دەکەم و لە هەموو رووداو و بەسەرهاتەکانتان ئاگادار دەکەمەوە بەڵام بەر لەوانە تکایەکم لە بابم هەیە.

بابم سەرنجێکی ئاڵۆزکاوی لەمن دا و من درێژەم دایە:

- تکا دەکەم پارەم بدەنێ تا دوایی لە...

بابم قسەکەی بڕیم و گوتی:

- ئەوەی هەر دەکەین بەڵام تۆ بیرت لە دواییەکەی ئەم کارە کردۆتەوە؟

- تکا دەکەم بابە لێم گەڕێ با ئەو کارەی بکەم، بۆ خۆتان دەزانن کە بە هیچ شێوەیەك ناتوانم لە کوڕەکەم دوور کەومەوە و بەرگەی دووری وی ناگرم.

دوای قسە وباسێکی زۆر بابم و دایکم وا لێ کردن بەو کارەی رازی بن.

بەیانی رۆژی دوایی دەگەڵ دایکمدا بۆ کڕینی شتی پێویست چووینە دەرێ و بەرەبەری خۆراوایە هاتینەوە ماڵێ.

رۆژی دیاریکراو هات. داوام لە دایك وبابم کرد بۆ بەڕێکردنێمان نەیەنە فرۆکەخانە تا بتوانم ئاسوودەتر لە ئێران و ماڵەوەمان هەڵقەنێم و بەرەو دیاری غوربەت بچم.

دایك و بابم به پێچەوانەی حەزو ئارەزووی ناخی دەروونیانەوە وەك زۆر جاری دیش دەنگیان نەکرد و ملیان بۆ خواستەکانی مـن ڕاکێشا. سـەعاتێك دواتـر فرۆکەکـە دەفـڕی و منـیش دەمتوانی دەگەڵ منداڵەکەمدا بۆ تا هەتایـە ئاسـوودەی شـەڕی دەسـتی محەمـەدی بم. بـەوەی کەنەمهێشتبوو لە مەهدی دابڕێم خۆشحاڵ و ئاسـوودە بـووم و بـەردەوام سـەیری دەمـژمێرم دەکرد. میلەکانی سەعاتێ هەروەك جاران هیچ پەلەیان نەبوو و بـەکاوەخۆ دەگـەڕان و منیـان شێت و هار دەکرد.

بۆ وەرگرتنەوەی بلیت و مۆر کردنێ پاسپۆرتەکە چوومە بەشی پشکنین تا پێـشەکییەکانی فڕینێ ئەنجام دەم کە لەپڕ ئەو فەرمانبـەرەی پاسـپۆرتەکانی مـۆرلێ دەدا لەجێیەکـەی خـۆی هەستا و بەرەولای فەرمانبەرێکی دیکەوە چـوو و ورتـە ورتێکـی دەبـن گوێیـدا کـرد و هـەر دووکیان هاتنەوە لای من. ئەوجا فەرمانبەرێك لە پشت مێزەکەیەوە هاتە دەرێ و گوتی:

- خاتوون بە یارمەتی خۆت دەگەڵەمندا وەرە

-باشە بۆچی؟ تکا دەکەم ئاغا تـوو گیانی هەر کەسێکی کە خۆشتان دەوێ ئازارم مەدەن و لێگەڕێن با بڕۆم، درەنگ دەبێ.

- دڵنیابن فڕۆکەکە بەبێ ئێوە هەڵناستێ و نافڕێ.

- خۆ من منداڵ نیم، ئەوە لە کەیەوە فڕۆکەیەك سەعاتی هەستانێی لەبەر خاتری کەسێکی گۆڕیوە تا ئەم جارە بیگۆڕێ.

- بە هەر حاڵ خاتوون ئێوە هەر دەبێ دەگەڵەمەدا دبێن.

بەناچاری وە دوای فەرمانبەرەی کەوتم و ئەویش بردمیە نووسینگەیەکی ناوفڕۆکەخانەکەوە. ئەوجا لە پیاوێکی نزیك بۆوە کە لە پشت مێزێکیەوە دانیشتبوو و شتێکی بە گوێیدا چرپاند. دڵم وەك چوێلەکەیەکی هەراسان هەروا خۆی بەقەفەزەی سینگم دادەدا.

فەرمانبەرەکە بەمنی گوت:

- خانم ئێوە فەرمون بەخێربێن.

ئەوجا بۆ خۆی لە نووسینگەکە چۆوە دەرێ و دەرگاکەی بە دوای خۆیدا داخستەوە.

پیاوەکەی لەپشت مێزەکەوە دانیشتبوو گوتی:

- خاتوون تەشریف بۆ کوێ دەبەن؟

- دوبەی.

سەیرە دوبەی و دیارە دەگەڵ منداڵەکەتاندا؟

- بەڵێ بۆ چ عەیبێکی هەیە؟

- ئەڵبەتە عەیبێکی هەیە ئەویش ئەوەیە کە خاتوون دەگەڵ مێردی پێشوویدا لێک جودا بوونەتەوە و لەسەر وەخۆگرتنی منداڵەکەیان تا ئێستا کێشەیانە.

بەدەمی بەشەوە تەماشای پیاوەکەم کرد و گوتم:

- من دە قسەکانی ئێوە ناگەم، ئەوەکێ ئەو قسە هەللەق مەللەقانەی هۆندوونەوە، تا چەند دەقیقەیەکی دی فرۆکەکە هەڵدەستێ، تکا دەکەم ئازارم مەدەن.

- خاتوون ئێوە ناچنە چ جێیەکی. ئێوە چوونە دەرەوەتان قەدەغەیە.

- لەبەر چی؟

- لەبەر ئەوەی کە مێردی پێشووتان شکایەتی لێ کردوون و دەڵێن کە ئێوە نیازتانە منداڵە ساوایەکەی بفرێنن.

- میردی پێشووم ناماقووڵی کرد کە ئەو قسەیەی کردووە.

- بەهەر حاڵ خاتوون ئێمە ناتوانین رێی چوونە دەرەوەت بدەینێ.

هەر نەبێ خۆ دەتوانن رێم بدەن تا کەسوکارم ئاگادارکەمەوە.

- ئەڵبەتە فەرموون.

بە تەلەفۆن بەسەر هاتەکەم بە بابم راگەیاند و دوای چەند دەقیقێکان محەممەد هاتە نووسینگەکەوە زۆر بە رقەوە سەیرێکی کردمێ و گوتی:

- ئەو کارە نوێیەت پیرۆز، تازە کەوتوویە کاری منداڵ فراندنێ؟

- بیبرەوە.

- هەرچەندە ئەو کارانە لە تۆ بە دوورنین. بەڵام بەو کارەت دەبێ حەزی وەخۆگرتنێ مەهدی ببەیە گۆڕەوە.

دەنگی دەمەقاڵێی من و محەممەدی زیاتر هەڵکشی. پیاوەکەی کەلە پشت مێزەکەوە دانیشتبوو داوای بێدەنگییەی لێ کردین. ئەوجا لە محەممەدی پرسی:

- ئێوە چۆنتان بەو چوونە دەرەی خانمێ زانی دەگەڵ کورەکەتاندا؟

- لەو جێیەی کە خودای بەسەرەوەیە، چەند رۆژێك لەمەوبەر بەبەرماڵی باوکیاندا رۆیشتم تا پێیان بڵێم لەوەی کە هێندەم دەرەتێنن و هێندەم دێنن و دەبەن ماندوو بووم. لە دەرکەم دا و برا بچووکەکەی هاتە بەر دەرکێ و داوام لێ کرد تا خاتوونێ بانگ کا ئەو گوتی:

- باجی لە ماڵەوە نیە.

پرسیم:

- ئەدی لە کوێیە؟

گوتی:

- دەگەڵ دایکمدا چوون جل و بەرگ و پێویستی بۆ باجی و بۆ مەهدی بکڕن، ئاخر چەند ڕۆژێکی دی ئاجی و مەهدی دەچنە دوبەی.

لەقسەی براکەیڕا زانیم کە ئەو ژنە بە نیازی چیەو چی لەمێشکیدایە. بەسەردانی لایەنی پەیوەندیدار چووم شکایەتی ئەو نیازانەو ئەو هەوڵانەیم لێ کرد و نەمهێشت کوڕەکەم لە وڵاتی بچێتە دەرێ.

بیرم بۆ هەموو جێیەکی دەچوو سالار نەبێ، تەنانەت هەر بەبیریشمدا نەدەهات کە محەممەد بوێرێ بێتە ماڵێ مە و سالار هەموو ئەو شتانەی ئاوا بۆ باس بکا. بەو جۆرە محەممەد ڕێی نەدا من و مەهدی لە وڵاتی بچینە دەرێ.

بەکورتییەکەی بابم لەڕێی دۆستە دەست ڕۆیشتوو و دیار وخاوەن نفوزەکانیەوە سەری دە دوو محەممەدی ناو سەری لەسەر هەڵنەگرت تا ئەوەی کەمحەممەد بێزار بوو و کاسەی سەبری لێوەڕێژ بوو و نەیهێشت مەهدی بێتەوە لای من و هەموو داوا و تکایەکانی لەم بارەیەوە ڕەتکردەوە.

ڕۆژی دادگایە بە فەرمانی قازی لەبەر ئەوەی من داوای تەڵاق و جیابوونەوەم کرد بوو نەك هەر مارەیی و هەشتیەکیەکەم مەهدیشم کە چوار ساڵانە بوو نەیاندامێ و لێیان ئەستاندمەوە. شەو و ڕۆژم لێ بووە گریان. دوای جودا بوونەوەی یەکجارەکیم لە محەممەدی دابڕانێ مەهدی لە پەل و پۆی کردم و ژیانم لێ بەلاّبوو. هەروەك شێتان لە کونجێکی دادەنیشتم و دەنوختەیەکیەوە ڕادەمام. بابم و دایکم هەرچییەکیان بە بیرو خەیاڵاندا هاتبایە بۆیان دەکردم بەلاّم بێ سوود بوو. هیچ شتێك و هیچ کەسێك جێی مەهدی بچکۆلانەمی نەدەگرتەوە و جێیەچۆڵەکەی وی بۆ پڕنەدەکردمەوە.

تەواوی خزم وکەسە نزیکەکانم دەهاتن و دڵیان دەدامەوە و هەرکامێکیان شتێکی بە بیرو خەیاڵ و مێشکیدا هاتبایە دەیانگوت. بەلاّم تەنیا کاریگەرییەکی قسەکانیان کەلەسەر من هەبووبێ ئەوە بووکە فرمێسکەکانم دادەبارینەوە و ئازارەکانم دادەمرکانەوە و ئاورو بڵێسەی دەروونم دادەمردەوە.

هەفتەی یەکەم رابورد بە گوێرەی فەرمانی دادگا محەممەد لەسەری بوو کە رۆژانی کۆتایی هەموو هەفتەیەك مەهدی بێنێتەوە مالێ بابم و شەممانیش دووبارە بێت و دەگەڵە خۆیدا بباتەوە.

ئەو رۆژەی کە بڕیاربوو مەهدی بێنێتە ئەو پارکەی سەری کۆلانێ هەر بەیانی زوو لە خەو هەستام و خۆم شوشت و خۆم رێك و پێك وئامادەکرد چونکە حەزم نە دەکرد مەهدی بە ڕەنگ و ڕوویەکی پەڕیوەوە ببینێ. لە خۆشیان دەست و پێی خۆمم لێ ون ببوو. بە پەلە چوومە پارکەکە و بە چاوەڕوانیە مەهدییەوە دانیشتم. چەند سەعاتێك تێپەڕین بەلام مەهدی سووسەیەکی هەر نەبوو. ئەو رۆژەم لە پارکەکە گەیاندە شەوێ بەلام محەممەد مەهدی هەر نەهێنا. ئەو پیاوە هێندە لاسار بوو کە تەنانەت گوێی بە فەرمانی دادگاش هەر نەدەدا. بەیانی ئەو رۆژەش سووسەیەك لە محەممەد ومەهدییەوە هەر نەبوو. بەناچاری دەبوو تا هەفتەی دادێ راوەستم. بەلام ئاخۆ خۆم رادەگرت هەفتەیەکی دیش مەهدی نەبینم. هەر رۆژێکم بە قەڕنێك لێ دەرۆیی. جارەهای جار دەهاتمە سەر ئەوەی بچمە سەر محەممەدی و هۆی ئەو نەهێنانەی مەهدی لێ بپرسمەوە بەلام هەر دوای تاوێك بڕیارەکەم دەگۆڕا و پەشیمان دەبوومەوە. وام بە چاك تر زانی ڕاوەستم و چاوەڕێی پەرچەکرداری محەممەد بم. ئیدی چەندین جار بابە گەورە هاتەوە سەر دانیم بەلام من هەر نەچووم بیبینم. ئەوەندەم ڕق لێ هەستابوو و هێندەم دەدزا تەنانەت نەمدەتوانی بۆ چرکەیەکیش بیبینم. نەمدەتوانی ئەرگەی دیتنێ پیرەمێردێکی لە خۆ ڕازی و خۆپەرست و خۆسەپێن بگرم کە ژیانی منی لەناو بردبوو و ئاگری تێبەردابوو و سووتاند بووی.

وردە وردە لە زمانی دایکم و بابم و ئیدیکەم دەبیستەوە کە بابە گەورە لەبەر ئازاری ویژدانی کە رۆژی منی بەو رۆژە گەیاندووە تووشی نەخۆشی دەروونی و نەخۆشی دڵ بووە. ئەو رۆژانەش وا دڵ ڕەق و بێ بەزەیی ببووم کە بە بیستنی ئەو قسانە نەك هەر نارەحەت نەبووم بەلکە خۆشحاڵیش بووم و بەسەر لەقاندنێکەوە گوتم:

- هەقە مستی بێ دەبێ سزای کارەکانی خۆی وەرگرێتەوە، ئەگەر ئاوا نەبایە لەوانەبوو گومانم لە دادی خودا کردبایە.

دەگەڵ ئەوەشدا کە زۆر جاران دەگەڵ نارەزایەتیە دایك و بابیشمدا ڕوو بە ڕوو دەبوومەوە بەلام هیچ گوێیەکم نەدەدایە نارەزایەتییەکانیان و لە دڵەوە چێژم لەو ئازارو نارەحەتیانەی بابەگەورەی وەردەگرت. کە بەتەنیاش تەك بوومەوە گوتم:

- هەقی خۆتە بیچیژە، هێندەی بچێژە نەبێتەوە تاهەر نەبێ تۆزقاڵێکی ئەو ئازارانەی حەوت ساڵەی من دەرك کەیت و پێی بزانی، بیچێژە تا بزانی نەدەبوو بالاّ دەستی و تەمەنی زۆرت ئاوا نالەبارانە بەکاربێنیت و سوودی بێ جێیان لێ وەرگری، بیچێژە تا تێبگەی کە نابێ بە رووالەتی دەرەوەی کەسانی دیکەوە هەڵ بخەڵەتێی. بیچێژە تا بزانی کە سەپاندنی بیرو ڕا و بۆ چوونی خۆت بە زۆرە ملێ بەسەر کەسانی دیکەدا راست نیە.

زەردە خەنەیەکی ئۆخەم کەوتە سەر لێوان و دڵم داکەوت.

هەفتەی دووەمیش هات کەچی هەمدیس محەممەد، مەهدی هەر نەهێنا تا جگەر گۆشەکەم ببینم، ئیدی لە وزەدا نەمابوو و لە دووری مەهدی وەك باڵندەی سەربڕاو هەر خۆم بێروبەوێدا دەدا و دەگریام. چەندین جارم بڕیار دەدا بچمە بەر دەرکێ ماڵێ محەممەدی و بەهات و هاوارو داد و بڕۆوە هۆی نەهێنانەوەی مەهدی لێ بپرسم بەلاّم حیرسم نەیدەهێنا. بەخۆم گوت:

- محەممەد حەز دەکا ئازار کێشانەکانی من ببینێ. نابێ لایەنی لاوازی خۆمی نیشاندەم. ئەگەر ئەو بەو هەست و سۆز و هەمموو ئەو پەرۆشیانەی من بزانێ هێندەی دیکەم زیاتر ئازار دەدات و هێندەی دیش نایەڵێ مەهدی ببینم.

هەروا بەو جۆرە دوومانگی دیش تێپەڕین و مەهدی بچکۆلانەمم هەر نەدیت. تا دەهات رۆژ بە رۆژ کزو لاوازو ڕەنگ زەرد و پەڕیوەتر دەبووم. لە پڕ ملوك و مێردەکەیم وەبیرهاتنەوە. ڕەنگە ئەوان بتوانن شتێکم بۆ بەشتێك بکەن.

چوومە ماڵێ ملوکێ و لە دەرکەم دا. ملوك خانم بۆ خۆی دەرگای لێ کردمەوە. دوای دیتنی من چەند ساتێکی بە هەوتیەوە تێڕوانیم و بەدەنگێکی میهرەبانانەوە گوتی:

- ڕەها گیان، وای چەند بە دیدەنیت خۆشحاڵم، فەرموو بۆ ژوورێ، زۆر زۆر بە خێرێی.

چوومە ژوورێ و بەرەولای ژووری دانیشتنێوە چووم و لەلایەکیەوە دانیشتم. ملوك خانم چووە مەتبەخێ تا شتومەکی میواندارییە ئامادەکا.

بە تەنیا لە ژوورێ دانیشتبووم و سەیری ئەملاولام دەکرد. ئەوە هەمان ئەو ژوورە بوو کە تەنیا و بێ پەنا دەنیوە شەوێکیدا پەنام بۆ هێنابوو. کاتێ کە بیرم لە ڕابوردوو دەکردەوە دەمدیت ئەو حەوت ساڵەی ژن و مێردایەتیە من و محەممەدی خوداوەند چارەنووسی منی لە خەڵووزێ ڕەش بەلکە لە خەڵووزێش ڕەشتر قەڵەم لێدابوو. ملوك خانم هاتە ژوورێ و بە ڕوویەکی خۆشەوە چاك و چۆنی و ئەحواڵپرسییەی کردم. دوایەش بە بۆنەی لێك جودابوونەوەی

یەکجارەکی من و محەممەدیەوە زۆری دڵ دامەوە و غەموکەسەری خۆشی هەر بەو هۆیەوە بۆ دەربڕیم کە زۆری پێناخۆش بووە. ملوك خانم دەنێوان قسەکانیدا گوتی:

- ڕەها گیان راستە کە جودا بوونەوە کەتانم دەگەڵ محەممەدیدا زۆر پێناخۆش بووە بەلاَم پێناخۆشبوونەکەم هەر زیاتر لەبەر ئەوەیە کەئیدی خاڵۆژنێکی دیکەی وەکو تۆم نابێتەوە، هەرچەندە دەشزانم کە محەممەد لە تۆ نەدەوەشایەوە و شیاوی تۆ نەبوو بەلاَم لە دەستدانی تۆ لە هەمو شتێکی زیاتر دڵگران و نارەحەت کردم و دەبێ ئەوەش هەر بڵێم کە لێك جوداییە تۆ و محەممەدی هەرگیز ناتوانێ بیرو باوەڕم بەلایەنی تۆوە بگۆڕێ، هەروەك جاران و لە جارانیش ڕێزدارتری. خودا بۆ خۆی دەزانێ کەلە خوشك و برایەکانم زیاتر خۆش دەوێی. زۆرم سوپاسی ملوك خانێ کرد و گوتم:

- هاتنێ منیش بۆ ئێرە، لەبەر لێك دابڕانێ محەممەدی نیە بەڵکە لە تاو مەهدییە. ئەوە نزیکەی سێ مانگە نەمدیوە و هەر ئەوەشە کە هەراسانی کردووم و ئۆقرەی لێ بڕیوم. ئیدی بەرگەی دوورییە جگەر گۆشەکەم ناگرم...

ملوك خانم قسەکەی پێ بڕیم و گوتی:

- کە بیستم دادگا مەهدی داوەتەوە محەممەدی زۆر نارەحەت بووم، بۆ خۆشت دەزانی کەمن یەکجار زۆر نارەحەتی ئایندەی ئەو کوڕەم. دەترسم محەممەد ئەویش وەك خۆی مرۆڤێکی لاسارو بەر هەڵداو هیچ پووچ بار بهێنێ.

ملوك خانم هەر قسەی دەکردن و بەقسەکانیشی تا دەهات کوڵ و باری غەمی سەر دڵمی قورس وگرانتر دەکرد. هەر ئەو قسەی دەکردن و منی دەپڕووکاند. دڵە خورتەی ئایندەی مەهدی هۆشی پێ لە خۆ بڕیبووم و لەپەل و پۆی خستبووم. هەر دەگریام و نەفرەتم لە بەختی ڕەشی خۆم دەکرد. بە دەم گریانێوە لە ملوکێم پرسی:

- نازانم مەهدی لە کوێیە و ئێستاکێ ئاگاداریەی دەکا؟

ملوك خانم پاکەتە دەستەسڕەکاغەزەکەی بۆ ڕاگرتم و من بەدەم سڕینەوەی فرمێسکەکانم درێژەم دایە:

- سێ مانگ بەسەر جودا بوونەوەی من و محەممەدیدا دەڕوا و بە گوێرەی فەرمانی دادگا کە بڕیار بوو دوو ڕۆژی کۆتای هەر هەفتەیەك مەهدی لەلای من بێ بەلاَم محەممەد تەنانەت لەسەر ئەو گفت و بڕیارەش هەر نەمایەوە و پێوەی پابەند نەبوو و مەهدی نەهێنایەوە دیدەنیەم.

ملوك خانم لە داخان سەرێکی بادا و گوتی:

- ئەگەر محەممەد وای نەکردبایە شتێکی سەیر دەبوو. جا ئەو پابەندی چ شتێکیە تا پابەندی ئەوەی بێ. راستیەکەی لەو دەمیەوە کە ئەو بوختانەی لە دادگای بە تۆو بە ئەحمەدی کرد ئیدی لەو دەمیەوە چاوم بە چاوی نەکەوتۆتەوەو بەلای منەوە ئەو مردووە. بەلاّم لێرە و لەوێم بیستووە کە محەممەد، مەهدی بردۆتەوە لای دایکم تا بەخێوی کات و چاوی تێوەی بێ بەلاّم دایکم هەروا دوای چەند رۆژان لە ئاگاداری و بەخێوکردنی مەهدی پەشیمان بۆتەوە، لەبەروەی بەردەوام گریاوە و داوای تۆی کردۆتەوە. ئەوجا محەممەد بە ناچاری مەهدی دەباتە لای جەمیلەی و ئێستا لەلای جەمیلەیە و ئەو بەخێوی دەکا بەلاّم وەك بڵێی جەمیلەش داوای لە محەممەدی کردووە پارەی بەخێوکردنێ مەهدی بداتێ و بڕیارە محەممەد مانگانەی خەرجی بەخێوکردن و هەقی ماندوو بوونێ بداتە جەمیلەی.

لەبیستنێ قسەکانی ملوك خانمێوە سەرم دەگێژەوە هات و خانووەکەم لە بەرچاوان سووڕا. دیارە دەو سێ مانگەیدا مەهدییە بچکۆلانەکەم دەردی دنیایەی دیوە. هەموو لە هەموو ئەو یان بەچاوی غەوارەیەك سەیردەکرد و لە بەخێوکردنێی ڕازی نەبوون و بەخۆیان نەدەگرت. ئەوە چ یاسایەکە کەدایك مافی ئەوەی نەبێ منداڵەکەی بگرێتە خۆی و بەخێوی کا؟

هەروەکو بۆ خۆم شارەزای رەوشتی محەممەدی بووم دڵنیابووم لەوەی کە بەلێدانێی مەهدی تەمبێ کردووە تا نەهێڵێ وڕك و بیانووان بگرێ.

بەهەنگاوی لەرزۆك و هەڵەت و پەڵەتەوە خودا حافیزیم لە ملوك خانمێ کرد و هاتمەوە ماڵێ.

❊ ❊ ❊

رەها لە پەنجەرەی مەتبەخێوە تەماشایەکی دەرێی کرد و گوتی:

- واچووینە ناو قسانەوە هەر ئاگامان لە وەخت و زەمانان بڕاوە.

من و رەبابە خانمیش هەردووك پێکەوە سەیرێکی دەرێمان کردو لەسەیری تاریکیە دەرێ چاومان دەسەعاتەکەی سەر دیواری مەتبەخێوە بڕی. سەعات (١٠) دەی شەو بوو و کەسمان ئاگامان لە سەعاتێ نەمابوو. بەبێ ئەوەی هەست بە ماندوو بوونێ بکەین گوێمان بۆ قسەکانی رەهای شل کردبوو. رەها هەناسێکی قووڵی هەڵکێشا و قۆڵ و بازووەکانی لێك بڵاوکردن و گوتی:

- لە و چەند رۆژانەی دوایـیدا کە هەر لە بەیانیەوە تا ئێواریێ قسان دەکەم شەویێ کە دەنووم دەنگی خۆمم دەگوێیدا دەزرنگێتەوە و نایەڵێ خەوم لێ بکەویێ و بنـووم. دەنگـم دەمێـشکمدا دووبارە دەبێتەوە و ئەوەی دەرۆژێدا دەیڵـێم شـەوێم هـەموو دێنـەوە بەرچـاوی و دەخەوێیانـدا دەبینمەوە.

رەبابە خانم بە دڵسۆزییەکەوە گوتی:

- بەستەزمانەی بێ دەرەتانە، دەو حەوت ساڵەیدا کەمی ئێش و ئازار و دەردو رەنج دیـوە بۆیە ئێستاش مۆتەکە وازی هەر لێ ناهێنێ و دەستی لە یەخەی ناکاتەوە.

رەها دەستێکی بە زگی خۆیدا هێناو گوتی:

- رەبابە خانم، لە خورە خوری هەمە جۆرەی زگم هەراسان بووم بە یارمەتی خۆت تا زووتر شامێ ئامادەکەی و پەلەی بکەی بەڵکە واگۆی ئەو زگە نەعلەتیەم بم. رەبابە خانم بـە گوتنـێ ((بە چاوان هەر ئێستا)) مێزی رازاندەوە. بەو خواردنانەی کـە رەبابـە خـانم لێینـابوون تـەواو وەسەر ئیشتیاکەوتبووم و زۆر بەهەڵپەوە دەستم بە خواردنێ کرد.

سەعات لەنیوە شەوێی لادابوو کە چوومەوە ژوورەکەم و خـۆم بـۆ نووسـتنێ ئامـادەکرد و دەجێیدا ڕاکشام. نازانم چەند نوستم کە لە پڕ لە دەنگی هاوارێکی لـە خـەو ڕاپەڕیـمەوە و لـە سەرجێیەکەم دانیشتم. دەنگەکە بڕابۆوە، تووشی شڵەژان و دوو دڵیە بووم داخوا هەر بەراسـتی یەکێك هاواری کردووە یا من خەونم دیوە؟! بێدەنگییەکی قورس هەموو جێیـەکی تـەنیبۆوە و هەموو لایەکی داگرتبوو. پێموابوو تووشی رموورنەی هاتووم و دەنگەکەم دەخەویـدا گـوێ لێ بووە. دووبارە دەجێیەکەیدا راکشامەوە و چاوم لەسەریەك دانانەوە. لە پڕ هەستم بە هەناسـەی یەکێکی کرد خێراخێرا دە ژوورەکەیدا دەگەڕێ.

چاوم هەڵێنانەوە و دە تاریکیە شەوێدا یـەکێکم دە ژوورێـدا دیـت کـە خـۆی بـە دەرگـای ژوورەکەوە نووساندبوو و لە کەلێنی دەرکێوەی سەیری ناو دالانەکێ دەکرد. ویـستم لە جێی خۆم هەستم بەلام ئەو خەنجەرەی بە دەستیەوە بوو لە جێی خۆمی وشك کـردم. دەتاریکیـە شـەوێدا زۆر بە ئاسانیم بریسکەی دەمی خەنجەرەکەی دەدیت کە دەبریسکایەوە. گوێم لە دەنگی قسەی رەها و رەبابە خانمێ بوو، رەها پرسی:

- دڵنیای یەکێکت دیوە؟

- بەڵێ، خاتوون! هاتبووم کەمێك ئاو وەخۆم کەلە پـڕ یـەکێکم لـەناو هۆڵەکـەدا دیـت و هاوارم کرد.

رەها پرسی:

- ئەدی کوا؟ چووە کوێ؟

- نازانم من بەرەو لای مەتبەخێوەم راکرد تا شتێکی بۆ بەرگریە خۆم پەیدا کەم. ئیدی نازانم ئەو کوێوە چوو، خاتوون بە یارمەتی خۆت تەلەفۆن بۆ پۆلیسی فریاکەوتن بکەن تا زوود بگەنە ئێرە.

بێدەنگییەك هەموو جێیەکی گرتەوە. ئەوە منیش هەروا سەیری ئەو کەسەی دەکەم کە لە پشت دەرکێوە راوەستاوە و لەکەلەلێنی دەرکە نیوە کراوەکەوە گوێی لە قسەکانی رەها و رەبابە خانمێ راگرتووە. زانیم کە ئاگای لەمن نیە لەوێم. دەبوو تا زووە بڕیار بدەم داخوا هەر لە جێیەکەی خۆم بمێنمەوە و نەجوولێم تا نەزانێ لەوێم یا ئەوەتا لە جێی بێمە دەرێ و پەلاماری بدەم. ئەوە هەر چاوانیش لە شتێکی دەگێڕم بۆ بەرگریە ئەگەری هەر پەلامار و هێرشێکی بەڵام هیچ شتێکی وام دەست نەکەوت. تێماو و دەستەوستان سەیری ئەملاولام دەکرد و نەشمدەوێرا لە جێی خۆم فزرەی بکەم. دەنگی رەهای دە هەوای دالانەکێ گەڕا:

- ئەلۆ، پۆلیسی فریاکەوتنە هەرچی زووترە خۆتان بگەیەننە ئەم ناو ونیشانە... دزێك دەنێو ماڵێدا دیتراوە.

- خاتوون تووبی و خودا بلێ بازوو خۆیان بگەیەننێ، من لەو یارۆیەی دەترسم، رەنگە هێشتاش هەر دەنێو ماڵێدا بێ، بەڵام هاتنێ پۆلیسی ئەرکێکی فەرمیە، هێشتاش نازانین داخوا بەراستی دز بووە یا ئەوەتا بۆ شتێکی دیکە و بەنیازێکی دیکەوە هاتووە. کەسی نەناسیش ئەوە دەو بێدەنگییەیدا گوێی بۆ قسەکانیان راداشتووە. سەرنجێکی لای پەنجەرەکەی دا تا بزانێ داخوا لەوێوە رێی هەڵاتنێ هەیە بۆ دەرێ یانە نا. بێ ئاگا لەمن بەرەو لای پەنجەرەیەوە چوو و پەنجەرەکەی کردەوە. خۆشبەختانە پەنجەرەکە لە عەردیەوە دوور بوو و نەیدەتوانی لەوێوە هەڵێ.

کەسە نەناسراوەکە سەری لە پەنجەرەیڕا بردبووە دەرێ و سەیری بەرزاییە نێوان عەرد و پەنجەرەکەی دەکرد. وەك بلێی راوێژی دەگەڵە خۆیدا دەکرد ئەگەر لە پەنجەرەکەوە خۆی هەڵداتە خوارێ داخوا رزگاری دەبێ یانە نا؟

بەبێ دەنگی لە تەختەبەندەکەی هاتمە خوارێ و بەرەو لای دەرکی ژوورێوەم تێ تەقاند. دەحاڵێکیدا کە هاوارم دەکرد و هانام وەبەر رەبابە خانمێ و رەهایە دەبرد دەرپەڕیمە دەرێ و دەرکەی ژوورەکەم داخست. دەنێو دالانەکێدا راوەستابووم و دەستگیرەی دەرکەکەم بەبەرخۆمەوە

ڕ دەكێشا تا نەهێڵم كابرای نەناسیاو هەڵێ. ڕەها و ڕەبابە خانم هەردوو خۆیان گەیاندمێ و كەوتنە هاریكاری و پشتیوانیەم. دەستگیرەی دەركەكەمان زۆر بە توونـدی بەرەو لای خۆمانەوە ڕادەكێشا تا نەهێڵین بكرێتەوە.

كابرای نەناسیاویش زۆر بە توندی بەرەو لای خۆیەوە دە دەركەكێ دەنووسا تا بتوانێ بێتە دەرێ. لە پڕ ڕەها قیژاندی:

- ڕەبابە خانم، ئەگەر دەستت بەتاڵە كلیلی ناو قفڵی دەرگاكە بادە و دەرگاكە كڵۆم كە.

- خاتوون دەستەكانی تۆم لەسەر دەستین. ناتوانم دەستان بجووڵێنم.

ڕەها بە هەڵەكەی خۆی زانی و بە دەم پێكەنینێوە كلیلەكەی دەقفڵەكەیدا بادا و دەركەكەی كڵۆم كرد. دەگەڵ ئەوەشدا كە دەركەكە كڵۆم ببوو كەچی من و ڕەبابە خانم هەر نە دەوێراین دەستگیرەی دەركەكەی بەردەین. ڕەها بە سەیرێكەوە تەماشای هەردووكمانی دەكرد و كە دیتیشی هیچمان دەستگیرەكەمان بەر نەدا گوتی:

- ئەوە چاوەڕێی چین؟ ئەوە بۆ وا لە خۆوە تێ دەنووسێن؟

ڕەبابە خانم بە نیگەرانیەوە پرسی:

- دڵنیان كە دەرگاكە بە تەواوی داخراوە، دڵنیا بن. دەی دەبجووڵێ ڕەبابە خانم، دەستی سپێدە خانێت دەبن دەستاندا پلیشاندەوە.

ڕەبابە خانم بەترس و بە پارێزەوە دەستەكانی شل كردن و دەستگیرەكەی بەرهەڵدا.

هەقی ڕەهای بوو. كاتێ كە ویستم دەستگیرەكەی بەردەم، دەستم گرمۆڵە ببوون و تەزیبوون و ئازارێكی زۆریان تێ گەڕابوو. ڕەها دەستە سوور هەڵگەڕاوەكانی دەنێو دەستی خۆیەوە گرتن و بە میهرەبانیەوە گوتی:

- سەیری دەستی ئەو مندالە پاكە چی لێ هاتووە، ئێمەی بێ ئاگا لە دەستی ئەو بەندەی خودایە لەجیاتی ئەوەی تین بدەینە دەستگیرەی بەهەموو هێزو توانای خۆمانەوە دەستی ئەو بەستە زمانەمان هەڵ گلۆفیوە. كابرای نەناسیاو لەپڕ یەك دوو جاری لە دەركەی دا تا بیكاتەوە، بێ ئیختیار هەردووكمان بۆ پێشگیریە نەهاتنە دەرێ پێكەوە دەستگیرەكەی دەركێمان پڕدایەوە. ڕەبابە خانم بە دەنگێكی بەرزەوە قاقایەكی لێداو گوتی:

- خاتوون ئەدی ئەتۆ دەرگات دانەخستبوو؟

من و ڕەها هەردووکمان تەماشای یەکترمان کرد. هەقی ڕەبابە خانمێ بوو. دەرگاکە کلۆم بوو نیوەی نەبوو بکرێتەوە و لیوەی بێتە دەرێ.

دەنگی زەنگی دەرکێ بەرز بۆوە. ڕەها ڕووی دە ڕەبابە خانمێ کرد و گوتی:

- حەتمەن پۆلیسی فریاکەوتنە هاتوون، بەیارمەتی خۆت دەرگاکەیان لێ بکەوە.

دوای چەند دەقیقێکان چەند پۆلیسێکی فریاکەوتنێ بە جل و بەرگی فەرمییەوە هاتنە نێو ماڵێوە و بە چاوساغیە ڕەبابە خانمێ هاتنە نهۆمی سەرێ و کابرای نەناسیاویان گرت و دەگەڵە خۆیاندا برد. کاتی چوونەوە دەرێ داوایان لە ڕەهای کرد بەیانی ڕۆژی دوایی بچێتە پۆلیسخانەی و پەروەندەیەك بکاتەوە.

دوای ڕۆیشتنی ئەوان بە پێشنیاری ڕەهای هەر سێکمان چووینە مەتبەخێ تا سەرو پیاڵەچایەك بخۆینەوە. خەومان بە تەواوەتی لە چاوان تەریبوو. ڕەها پرسی:

- سپێدە گیان، بۆمان بگێڕەوە داخوا چۆنت ئەو دەژوورێدا حەپس کرد؟

ڕەبابە خانم بەتاسەوە چاوی دەمنەوە بڕیبوو و چاوەڕێ بوو تا هەرچی زووە باسەکە بگێڕمەوە. منیش دەستم پێکرد:

- لە دەنگی ئەو قریشکەی دەماڵێ گەڕا وە ئاگا هاتم و ڕاپەریم...

تەواوی داستانەکەم گێڕایەوە. ڕەبابە خانم گوتی:

- بەڵام کاتێ کە گرتیان هیچ ساردە چەکێکی پێنەبوو.

من و ڕەها هەردووکمان سەیرێکی یەکتریان کرد، ڕەبابە خانم ڕاستیدەکرد. لە جێوە هەستام و گوتم:

- دڵنیام لە ژوورێی شاردۆتەوە.

هەرسێکمان بەرەو لای ژووری سەرەوە چووین. ڕەبابە خانم گڵۆپەکانی پێکرد و ژوورەکە بە تەواوەتی ڕووناك بۆوە. ژوورەکە هەروا وەك خۆی ڕێك و پێك و دەست لێ نەدراوبوو. هەرسێکمان هەر جێیەکمان بەبیر و خەیاڵدا هاتبایە و گومانمان لێ کردبایە کەلەوانەیە خەنجەرەکەی لێ شاردبێتەوە دەگەڕاین. بەڵام شوێنەوارێکی نەبوو. ڕەها گوتی:

- ڕەنگە لەناو دەرپێیەکەی یا بەڕانیەوە بەستبێ و شاردبێتیەوە.

بەسەر ڕاوەشاندنێکەوە وەڵامێکی نەرێنیم دایەوە و گوتم:

- ئەدی نەتدیت کە گرتیان یەکێك لە پۆلیسەکان لەشی دەپشکنی. بەڵام هیچ چەکێکی پێ نەبوو.

کەمێکم بیرکردەوە و درێژەم دایەوە:
- دڵنیام خەنجەرێکم بە دەستیەوە دیت، هەر دەبێ لە جێیەکی شاردبێتەوە.
رەبابە خانم باوێشکێکی دا و گوتی:
- بەڵام لە کوێ؟ خۆ ئێمە هەموو ژوورەکەمان تێك و لێك ناو سەرو بنمان کرد.
- رەهاش باوێشکێکی هاتێ و گوتی:
- واباشترە هەر سێکمان هەریەکە و بچێتە وە ژوورەکەی خۆی و بنووینەوە. بەیانی لەم بارەیەوە زۆرتر دەدوێین.
رەها و رەبابە خانم لە ژوورەکە چوونە دەرێ و منیان بەتەنیا بەجێهێشت. گوێم لە دەنگی رەها خاتوونێ بوو کە بە رەبابە خانمێی گوت:
- بە یارمەتی خۆت پێش نوستنێ قفڵی دەرگاکان بەسەر کەوە.
و رەبابە خانم گوتی:
- بە چاوان، دڵنیابن بەوەی کە روویدا ئیدی هەموو شەوێ و لەمەودوا پێش نوستنێ چەند جارێکان قفڵی دەرگاکان بەسەر دەکەمەوە.
خۆم دەبن جێوە نا و چەند جارێکانیشم ئەو دیمەنە هێنایەوە بەرچاوی خۆم کە دیبووم و لەبەر چاوی خۆمم بەر جەستە کردەوە, بەهەڵەش نەچوو بووم، زۆر بە روونیم بریسکەی دەمی خەنجەرەکە دیتبوو، بەڵام ئەو کەسە نەناسیاوە لە کوێی ئاخنیبوو و شاردبوویەوە؟ بەیانی کە لە خەو هەستام هەوا بە تەواوەتی رووناك ببۆوە هەر دەنێو جێیەکەیدا دانیشتم و چاوم گلۆفین. لە پڕ کەوتمە سەر یادی رووداوەکەی شەوێ. لە نێو جێی هاتمە دەرێ و بەرەو لای پەنجەرەکەوە چووم. پەنجەرەکەم کردەوە. هەوای ساردی زستانە هێرشی هێنایە ژوورێ. لەرز دایگرتم. هەر زوو پەنجەرەکەم داخستەوە و چوومە حەمامێ. ئاوەگەرمەکەی بەخۆم داکرد هێنامیەوە سەرخۆ. دوای سەعاتێکی چوومە نهۆمی خوارێ بەڵام کەس لە ماڵێ نەبوو. بانگی رەها و رەبابە خانمێم کرد.
- رەها خاتوون، رەبابە خانم، ئەوەکەس لە ماڵێ نیە؟
بەڵام هیچ وەڵامێك نەبوو. بەرەو لای مەتبەخێوە چووم. بۆنی چای تازە دەم هەوای ناو مەتبەخەکەی هەموو داگرتبوو. پیاڵە چایەکم بۆ خۆم تێکرد و چونکە مێزی نانخواردنەکەش هەموو شتێکی لەسەر بوو بە تەنێم قاوەڵتی کرد. سەعاتێك نەچوو بوو کە دەنگی کرانەوەی دەرکێ وریای کردمەوە. لە مەتبەخێ هاتمەوە دەرێ و بەرەو حەسارێوە

چووم. ڕەبابە خانم بە خۆو بە زەمبیلەیەکی پڕی شتومەکی خواردنێوە گەییە حەساریّ و دەرگاکەی پێوەدایەوە. هەر زوو بەهانایەوە چووم و دەستێکم دەگەڵ دایە تا شتەکان بەرینە مەتبەخیّ.

- ڕەها خاتوون هێشتا هەر نەگەیشتوونەتەوە؟

دە وەڵامێیدا گوتم:

- نەخێر کاتیّ کەلە سەرێوە هاتمە خواریّ کەس لەماڵ نەبوو.

ڕەبابە خانم میوە و سەوزەواتەکەی کڕیبوویان بە دەم شووشتنەوێیانەوە گوتی:

- ڕەها خاتوون بەیانی زوو چوونە پۆلیسخانە و داوایان لە من کرد ئێوە نارەحەت نەکەم.

منیش هێندێکم شت دەویست بیانکڕم. پێش چوونە دەرێشم هاتمە ژوورەکەی ئێوە تا ئەگەر بە ئاگابوونایە پێمگوتبان کە دەچمە دەریّ بەڵام لەبەر ئەوەی لە حەمامیّ بوون دەستێکم بە ژوورەکەدا هێنا و ڕێکم خستەوە و چام بۆ لێنان و قاوەڵتیم بۆ ئامادەکردن و ئەوجا چوومە شت کڕینیّ.

ڕەبابە بێدەنگ بوو بەڵام وەك بڵێی شتێکی بە مێشکیدا هاتبێتەوە دووبارە پرسییەوە:

- خۆ تا ئێستا بیّ قاوەڵتی نەماویەوە؟ قاوەڵتیت کردووە؟

سوپاسم کرد و وەڵامم دایەوە:

- بەڵیّ، قاوەڵتیم کردووە، دڵنیابە بیّ دڵیە خۆم ناکەم

ڕەبابە خانم پێکەنی و گوتی:

- سەری کارەکان هەمووی هەر بۆ زگیە. هەوڵی ئادەمیزاد هەر بۆ تێرکردنیّ زگەکەیە.

دەنگی کرانەوەی دەرکی حەساریّ هات. ڕەبابە خانم بە تاسەوە گوتی:

- ڕەها خاتوونیش تەشریفیان هێنایەوە.

و بە هەنگاوی خێرا و بە پەلەوە بەرەو پیلی خاتوونەکەیەوە چوو و بە ڕوویەکی خۆشەوە بەخێرهاتنەوەی کردەوە. ڕەها گەیشتەوە ناو هۆڵەکە و زۆر بە نەدەبانەوە وەڵامی ڕەبابە خانمی دایەوە. ئەوجا پرسی:

- سپێدە خانم هەستاون؟

بەڵیّ لە مەتبەخێن.

ڕەها بەبێ ئەوەی کە جلەکانی بگۆڕێ هاتە مەتبەخێ، سڵاوی کرد و گوتی:
- سپێدە خانم، ئێوەش دەبێ بۆ هێندێك وەڵام و پرسیاران دەگەڵە مندا بێنە پۆلیسخانە...
ڕەبابە خانم هاتە نێو قسەکانی ڕەهاوە و گوتی:
- باشە بۆ؟ خۆ سپێدە خانم هیچیان نەکردووە! هەر ئەویش بوو کە ئەو پیاوەی گرت.
ڕەها لە ڕووی سۆزو خۆشەویستیەوە زەردەخەنەیەکی بە ڕووی پیریژنێ سادە دڵدا کرد و گوتی:
- نا ئازیزەکەم، چونکە من لە پۆلیسخانە گوتوومە کە میوانەکەم تیغێکی بەدەستی ئەوەوە دیوە بەڵام لەکاتی دەستگیر کردنیدا هیچ تیغێکی پێ نەبووە داوایان لە سپێدە خانم ئەوەیە بچێتە پۆلیسخانە و دیتن و بۆ چوونەکانی خۆی تۆماربکا.
یەکسەر دەگەڵ ڕەها خاتوونێ لە ماڵێ وەدەرکەوتم و چوومە پۆلیسخانە و هەرچییەکی دیبووم بۆ ئەفسەرەکەم گێڕایەوە. هەر چیەکم هەبوو دەپەروەندێکیدا ریز بەند کراو نووسرا و دوای سەعاتێکیش چەند پۆلیسێکی ئەم بوواره بۆ دیتنەوەی چەکە ساردەکەی کابرای نەناسیاو هاتنە ماڵێ ڕەهای و هەموو جێیەکیان پشکنی.
سەعاتێکی نەبرد ئەوەی لێی دەگەڕان دیتیانەوە. ڕەبابە خانم کە دەحاڵێکیدا بە چاوی ئەبڵەقەوە سەیری دەمی خەنجەرەکەی دەکرد تفێکی قووتدایەوە و پرسی:
- ببوورن ئاغایان ئەوەتان لە کوێ دیتەوە؟
یەکێکیان کە خەنجەرەکەی بە دەستەوە بوو گوتی:
لەژێر دۆشەگی تەختە بەندێکیەوە ئاخنیبوو.
ڕەبابە خانم لە ترسان هاوارێکی لێ بڵندبوو و گوتی:
- یانی سپێدە خانم بەدرێژایی شەوێ لەسەر ئەوشتە ترسناکەی نووستبوو؟
باشە ئەدی چۆنی ئاگا نەکردووە و نەیزانیوە؟
ئەفسەری کارا وەڵامی دایەوە:
- خەنجەرەکەی لەبن دۆشەگەکەی سەر لێوی تەختەکە لە پەینگانێ شارد بۆوە. ئەوە پێی وابووە کەس بۆ ئەو جێیەی ناچێ کە چەکی تێدابێ. بە دۆزینەوەی ئەو چەکەش تاوانی دزەی گرانتر دەبێ.

- دوای چەند دەقیقێکان پۆلیسەکان لە ماڵێ وەدەرکەوتن و خەنجەرەکەیان برد تا ئەویش بخەنە پاڵ پەروەندەکەوە. بار و دۆخەکە ئاسایی بۆوە و بە دەم جەفەنگی بەسەرهاتەکەی دوێنێ شەوەوە نانی نیوەرۆژەکە خورا. هەریەکە و باسی ئەو ترسەی دەکرد کە لێی نیشتبوو و بە دەم پێکەنینەوە هێرشەکەی هەرسێکمانمان بۆ سەر دەستگیرەکە گێڕایەوە. رۆژی دواتر لە لایەنی پۆلیسخانەوە هەواڵیان دایەوە رەهایە کە کابرای نەناسیاو دگانی بەوەداناوە کە هەر تەنیا بۆ دزیەی ماڵێ رەهای هەڵناوە. چونکە زانیویەتی کە ئەو ماڵە تەنیا دوو ژنی تێدان کەیەکێکیان بەتەمەنە و پیرە. بەو دگان پێدانانەی ئەو کە دگانی پێدانابوو بەلانی کەمەوە بەچەندین مانگ زیندانی حەبس دەکرا و تاوانبار دەبوو. و نارد یانە داد

دوای ئەوەی کە رەها لەلایەن کابرای نەناسیاوەوە دڵنیابوو کەوتەوە گێڕانەوەی پاشماوەی بەسەرهاتەکەی ژیانی خۆی.

❋ ❋ ❋

بەدڵی شکاو و لێوان لێو لە غەم و خەفەتەوە لە ملوك خانمێ جودا بوومەوە و هاتمەوە ماڵێ.شەو ورۆژ هەر بەسەر و پۆتەلاکی خۆمم دادەدا و دەگریام. دەموچاوە گریاناوییەکەی مەهدیم دێنایەوە بەرچاوی خۆم و کوڵی گریانێم هێندەی دی هەڵدەستا. دوو مانگی دیکەش تێپەڕین بەڵام هەمدیس محەمەد، مەهدی هەر نەهێنا. پێنج مانگ بوو کوڕەکەمم نەدیبوو ئەو پێنج مانگانەشم لەو پێنج ساڵەی لەلا ناخۆشتربوو کە دەگەڵ محەمەدیدا بەسەر بردبوو. لە رێی بابمەوەم شکایەت لەمحەمەدی کردەوە.

دادگا محەمەدی راپێچ دا و بەسەریدا سەپاند کە هەموو هەفتێکی مەهدیم بۆ بێنێتە دیدەنیە. ئەوجارەش محەمەد کەوتەوە درۆیان و دە بەرامبەر هەموو ئەوانەی لە دادگایە بوون گوتی:

جەنابی قازی، چەندین جارم ئەو منداڵە بردۆتە لای دایکی بەڵام ئەو ژنە رووی لێ وەرگێڕاوەو نەیویستووە بیبینێ و گوتوویەتی حەزناکا منداڵەکە ببینێ.

ئیدی لە درۆیەکانی وی جاڕس ببووم بەهات و هاوارەوە داوام لە دادگای دەکرد سزای بدەن.

رووم دەقازی کرد و گوتم:

.لای ئێوەوە چ دایکێك پێی خۆش نیە جگەر گۆشەکەی خۆی ببینێ؟  کام دایکێك ـ ـ ی رووی لە دیتنێ منداڵەکەی وەرگێڕێ؟ ئەوە هیچ یاسا و بڕیارێك نیە قوڕ بەدەمی مرۆڤی ئاوا دادات و دەمکوتی کا؟ باشە بۆ کەسێك بە دەنگ ژنێکی بێدەرەتانی چارە رەشەوە نایەت کەهەموو جوانی و جاحێڵیە خۆی لە کیس دا؟ بۆ دەبێ دوای تەڵاق دانێش منداڵ هەر لای باوك بێ و دایك هەقی بە خێوەکردن و وە خۆگرتنێ جگەر گۆشەکەی نەبێ؟ باشە بۆ دادگا نابێ لە گونجانێ بابەکە بپرسێتەوە؟

قازی داوای لەسەر خۆییەی لێ کردم و ویستی رێك و پێکیە دادگای تێك نەچێ.

دادگا محەممەدی بەرزەفت کرد تا هەموو هەفتەیەك مەهدی دەگەڵ مەنمورێکی کە دادگا داینابوو بیهێنێ و بەمنی بسپێرێ و خۆ ئەگەر نەهێڵێ من و مەهدی یەکتر ببینین ئەوە راشکاوانەتری دەگەڵدا دەجووڵێنەوە.

چەندین مانگ ئاوا هەموو هەفتەیەك رۆژانی کۆتایی هەفتە دەپێشوازییە مەهدیدا بووم. بەڵام هەموو جارێکی مەهدیم بە دەموچاوێکی شین هەڵگەڕاو و دەستی داغ کراو وجل و بەرگێکی شڕو وڕ و دڕاوەوە وەر دەگرتەوە. بەدیتنێ ئەو سەرو وەزعە ناهەموارەی منداڵەکەم ئاگرم دەجگەری بەردەبوو و فرمێسکم بە چاواندا دەهاتە خوارێ. جێی شین بووەوە و داغەکانیم ماچ دەکرد و نەفرەتم لە هۆکارەکەی دەکرد. هەر جارێکی کە مەهدی دەهاتەوە لای من بە دەم کوڵی گریانێوە خۆی دەباوەشێ داویشتم و خۆی مات دەکرد و هەر بەگریانیشەوە داوای لێ دەکردم تا هەر لەلای خۆمی بهێڵمەوە و نیدی نەینێرمەوە ماڵە مامی.

بەناچاری دڵم دەدایەوە و هێورم دەکردەوە. حەزم نەدەکرد بەوادەو بەڵێنی بێ جێ هەڵی خەڵەتێنم و هەروا لە خۆوە بە تەمای کەم. دەبوو هەر چۆنێکی بێ دەگەڵ ئەو بارو دۆخەیدا ڕابێ. دەبیری ئەوەیدا بووم چۆناو چۆنی لە محەممەدی بستێنمەوە. هەموو هەوڵ و تەقەللام هەر بۆ هێندێ بوو کە دەماوەی ئەو چل و هەشت سەعاتەی کەلەلای من بوو کام ساعەتێکی خۆشی و شادییە ئەوەیانی بۆ بڕەخسێنم.

دایك و بابیشم لەو لایەنەوە زۆریان هاریکاری دەکردم. ئەوانیش هەر چییەکیان بەخەیاڵدا هاتبایە بۆ مەهدییان دەکرد و ئەنجامیان دەدا. بابم بەقەدەر پێویست پارەی دەبەر دەستی دەنام و دەیدامێ تا بۆ خۆم هەر چۆنێکم حەز لێیە بۆ مەهدی خەرج کەم.

ورده ورده مەهدی بە هەویای هاتنەوەی کۆتایی هەفتەوە رۆژەکانی بەسەر دەبردن و کەمتری بیانوو دەگرتن. چەندین رۆژ بوو بابە گەورە نەخۆش کەوتبوو و دەجێیدا بوو.

بەردەوامیش وەڵامی دەدان کە دەمهەوێ رەهای ببینم و داوای گەردەن ئازادییەی لێ بکەم.

بە زۆریە دایك و بابم رازی بووم بچم سەرێکی لێ بدەم. کاتێ کە چوومە ژووری نووستنەکەی بابە گەورەی زۆر لەو دەمەی پیرو پەرپووتترم هاتە بەرچاوان کەهات منی ناچاری مێرد بەمحەممەد کردنێ کرد. بابە گەورە دەنوێنەکەیدا راکشابوو و سەرنجە بێ تروسکەکانی دە دەموچاومەوە بریبوون. بەزەردە خەنەیەکی غەماوییەوە سڵاوم کرد. بابە گەورەش بەئارامی و لەسەر خۆییەکەوە وەڵامی سڵاوەکەی دامەوە و دەستە پیرو چرچ و لۆچاوییەکانی بەرەو لای منەوە درێژ کردن و گوتی:

- ئاخریەکەی هەر هاتی رەها، ئێستا ئەوە حەوت ساڵە چاوەرێی دیتنێتم، ماشەڵڵا ئیدی ئێستا بۆ خۆت خاتوونێکی، هێندێکی دیش وەرە پێش با چاکت ببینم.

چوومە پێشتر و لەسەر لێوی تەختەکە بەتەك ئاغای گەورەوە دانیشتم. بابە گەورە دەستی دەناو دەستەکانی خۆی نام. بە لەرزینێ دەستەکانی دڵم گوشرا بە دەنگێکی لاوازەوە پرسی:

- زۆرت رق لێ دەبمەوە؟

ویستم نەیڵێم بەڵام ئەو دەستبەجێ درێژەی دایەوە:

- مەڵێ نا، دەزانم لێم بێزاری، هەقیشتە، من ژیانی تۆم کوێر کردەوە و وێرانم کرد، من بوومە مایەی بەدبەختیت و خۆشم بە گوناهبار دەزانم، ئێستاش دەمهەوێ هەڵەو رابووردووەکانم قەرەبوو کەمەوە، تکات لێ دەکەم چاکم گوێ بۆ قسەکان رادێرە، من لەو ساتە وەختانەی کوتایی تەمەنمدا تکایەکم لێتە کچەکەم.

سەرم بەردایەوە گوتم:

- ئەوەی دەتەوێ بیڵێ بە چاوی منەتەوە قبووڵمە.

بابەگەورە لەشە لەڕ و لاواز و پەرپووتەکەی بە زەحمەت جووڵاندەوە و هێندێکی خۆرانا. ئەوجا گوتی:

- تکام ئەوەیە بمبوری و گەردەنم ئازاد کەی، داپێم بڵێ داخوا دەمبووری؟ سەیرێکی دەموچاوە پیرو داکەوتووەکەیم کرد. دەمویست بڵێم:

- باشە تۆ بەزەیت بەمندا هاتەوە؟ ئەوان رۆژانە ئەوەندە زەحمەتەت وەبەر خۆت دا گوێ لە قسەکانی منیش بگری و بزانی بۆ سەرپێچی لە فەرمانەکان دەکەم؟ ئێستاش چ لە شۆخی و لاوەتیە بەسەر چوو و ئەو مندالّە دلّ شکاوەی بکەم؟ ئێوە چاوەڕێن کەمن هەموو ئەمانە لەبیر بەرمەوە و چاو لە گوناهەکانی ئێوە بپۆشم؟ وای دابنێن من ئەوەشم کرد و لە ئێوە خۆشبووم ئەدی ئەو مندالّەی کەهەموو رۆژێ لێی دەدرێ و یا لەسەر دەنکە شۆکۆلاتەیەکی داغ دەکرێ چ لێدەکەن ئایا ئەویش دەتانبەخشێ و لێتان دەبوورێ؟

بەلاّم کاتێ کە چاوم بە دەموچاوی ئاغای گەورە کەوت یەکسەر دلّم لەتەواوی ئەو نەفرەت و بێزاریانە پاك بۆوە کە پڕاو پڕ ولێوان لێوی دلّم بوون. هەرچی داد و بڕۆیەکانن دەناخمدا نەمان و سۆزو خۆشەیستیم بەرامبەر بەو پیرەمێردە رەنجوورو رەنگ پەڕیوەیە جێی هەموو ئەوانەی گرتەوە. کە ئەویشم هەر ئاوا دەچاوەروانیە وەلاّمدا دیت لەسەرەخۆ گوتم:

- من گەردەنتان ئازاد دەکەم، خۆزگە ئەو رۆژانە لەبیری خۆشبەختیە مندا دەبوون، هەرچەندە من خۆشیم لە خۆم نەدیت و هێشتاش هەر بەهیوای ئەو بەختەوەرییەوە رۆژان بەسەر دەبەم.

فرمێسك بە چاوی ئاغای گەورەداهاتنە خوارێ و داباری. بەدەستە لەرزۆکەکانی دەستی بەرەو لای خۆیەوە بردم و ماچی کرد. ئەوجا بەزەردەخەنەیەکی بێ رەنگی کالّەوە گوتی:

- بەوەی کە بەخشیتم زۆر خۆشحالّم، ئومیدەوارم لەمەودوا ژیانت هەمووی هەر خۆشی و شادی و بەختەوەری بێ.

چەند سەعاتێکان لای بابەگەورەوە دانیشتم و قسەم دەگەلّ کرد. بەوەش کە بەخشیبووم و دلّم لەو ڕق و کینەو نەفرەتانەی ئەو پاك ببۆوە خۆشحالّ و ئاسوودە بووم. بابەگەورەترسی ئەوەی هەبوو کەمن هەر سەر زارەکی ئەوم بەخشیبێ و بەدلّ نەبووبێ. بەردەوام دەقسەکانیدا لێی دەپرسیمەوە کە هەر بە ڕاستی و لە دلّەوە ئەوم بەخشیوە و لێی خۆشبوو وم و هیچم دەدلّیدا نەماوە؟ منیش دلّنیام دەکردەوە کە ئەوم لە کرۆك و ناخی دلّمەوە بەخشیوە و هیچم دەدلّیدا نەماوە بەرامبەری. لە مالّی ئاغای گەورە هاتمەوە دەرێ و گەرامەوە مالّێ.

کاتەکان بەستی دەڕۆیشتن و من هەر چاوە چاوی رۆژی پێنج شەممەم بوو.ئیدی تاکە خۆشی من تەنیا هاتنی رۆژەکانی کۆتایی هەفتە و لەباوەش گرتنی مەهدی بوو.

چەند رۆژێك دوای چوونە لای بابەگەورە ئاغای گەورە بارگەو بنەی کۆچی تاهەتایەی پێچایەوە و ئۆغری فەرموو و لە دوای خۆشیەوە وەسیەتنامەیەکیشی بەجێهێشت بوو. دوای بەسەر چوونی رێ و رەسمی بەخاك سپاردن و پرسە دانانێ کاتێ کە هەموو قەوم و قیلە و خزموکەس و نزیکەکان لە مالێ ئەو خوالێخۆشبووە کۆ ببوونەوە وەسیەتنامەکە لەلایەن پارێزەرەکەیەوە کرایەوە و خویندرایەوە. لەبەردەم و چاوی ئەبلەق و حەوقی هەموو ئامادە بوواندا، پارێزەرەکە بە دەنگێکی بەرزەوە ناوەرۆکی وەسیەتنامەکەی خوێندەوە و هەمووی هەوت و سەرسام کردن. بابەگەورە نیوەی داراییەکەی بەمن بەخشیبوو و دابووی بەمن و بەوە ویستبووی هەڵەکانی خۆی پێ قەرە بوو کاتەوە. دەکۆتایی وەسیەتنامەکەشدا منی سوێند دابوو تا بە تەواوی لێی ببوورم و لەگوناهەکانیشی خۆش ببم.

دوای رۆژی چلەی مردنێی تەواوی داراییەکەی حیساب کرا و نیوەی ئەو داراییەی کە بریتیبوو لە ملێونەها تمەن پارەی کاش و چەندین موغازەو پارچە زەوی و خانوو و دوو ڤیەللای ناوچەی شیمال ئەوانە هەمووی بەشێوەیەکی فەرمی و نووسراو بەناوی منەوە کران. بەڵام هەموو ئەمانە منیان دڵخۆش و رازی نەدەکرد، نەپوول و پارەوسامان و نەماڵ و خانوو و زەوی و نەڤیەللا، ئەمانە هیچیان دڵە شکاوەکەی منیان پێ نەدەدرایەوە و دەردی منیان دەرمان نە دەکرد.

## (١١)

ڕۆژەکان هەروا یەك بە دوای یەکدا تێدەپەڕین و ئەمنیش هەر بە هیواو ئـاواتی دیتنـەوەی مەهدی ئەو ڕۆژانەم بەسەر دەبردن. پوورە فرانك و مێردەکەشی کە ئێستا خاوەنی دوو منداڵی جوان بوون. چلەی ماتەمینی بابە گەورەیان لە ماڵێ خۆیان بۆ گرتبوو و هەرچی خزم و کەس و قەوم و قیلە و ئاشنا و ڕۆشنایە هەموویان بانگ کردبوو. دەگەڵ دایك و بـاب و خوشـکەکانم و سالاردا هەموو لە هەموو چووینە ماڵێ پوورە فرانکێ. هەر دەگـەڵ یەکـەم هـەنگاوی چـوونە ژووری لاقەکانم لە دوو نەهاتن. ئومێـد بـە کراسـێکی ڕەشـەوە لـە حەسـارێ ماڵـێ پـوورێ، سەرقاڵی هاریکاریە ئەوانی دیکە بوو و هیچ ئاگایەکی لە ولاولایان نـەبوو. هـەروەك سـالانی پێشووش، جوان و بەخۆوە بوو و تەنیا جیاوازییەکی دەگەڵ جاراندا ئەوە بوو کە دەموچـاوەکەی لە کرچ و کاڵیە لاوەتییەوە ببـووە دەموچـاوی پیـاوێکی پوختـەو تـەواو. هـەڵس و کـەوت و قسەکانیشی هەروەك جاران بە ئەدەبانەو سەنگین بوو. هێشتاش میهرەبانی دە دەنگیدا شەپۆلی دەدایەوە و هەموو کەسێکی بە ڕێزو گەورەییەوە بانگ دەکردن و ناوی دێنان.

دایکم بەسپایی دەستێکی لە شانم داو منی لـە دەریـای بیروخەیالانـەوە هێنایـەوە دەرێ و وریای دەورو بەرێی کردمەوە. خۆشبەختانە کەس ئاگای لە هاتنـە ژوورەوەی مـە نـەببوو. بـە دزیەوە لە بنەوەمڕا سەیری ئومێدی دەکرد و لەناخەوە حەسرەتی ڕۆژانی ڕابوردووم دەخوارد.

کەوتمە یادی یەکەمین جاری دیتنێ ئومیدی و هەروەك ئەو ڕۆژە دڵم بۆی لە تاسـەوە چـوو. لە پڕ ژنە جحێڵەیەکی جوان لە ئومێدیەوە نزیك بۆوە و گوتی:

- ئومید، بە یارمەتی خۆت تا مەتبەخێ وەرە، لە وێمان ئیش پێتە.

ئومێد بە ئەدەبانەوە وەلامی دایەوە:

- وەی بە چاوان، هەر ئێستا بەخزمەت دەگەم.

دایکم لەسەرخۆ گوتی:

- ئەو خانمەی کە قسەی دەگەڵ کرد ئەوە ژنەکەیەتی.

بە وردییەکەوە دە روخساری ژنە جحێڵەکەم روانی. ژنێکی جوان و باڵا بەرز بـوو لـەش و لارو ئەندام رێك و پێك و چاو گەورە و جوان، قژ درێژێکی مێش کراو کە هێندەی دیکەی جوان کرد بوو. ژنە جحێڵەکە بێ ئاگا لە هاتنە ژوورەوەی مەچۆوە نێو ماڵێ و ئومێدیش کارە نیمچە تەواوەکەی واز لێ هێنا و بە دوای ژنە جحێڵەکەیدا ئەویش چۆوە نێو ماڵێ.

کاتێ کەچووینە نێو ماڵێ، پوورە فرانك بە هەشتاوییەوە بەرەو پیلمان هات و هـەمووماني فەرمووی هۆڵی میوانان کرد. دەو چەند سەعاتەی کە لە ماڵێ پـوورە فرانکـێ مێـوان بـووین چەند جارێکانم ئومێد دووراو دوور دیت بەڵام ئەو کە لە هاتنێ مە بێ ئاگا بوو هەر خـەریکی ئەنجامدانی کارەکانی بوو. هەر چەندجارێکی کە ئومێدم بە دەم قسانەوە دەگەڵ هاوسـەرەکەیدا دەدیت دڵم وەلەرزە دەهات و ئاگری حەسوودیەم دەدڵێـدا بڵێـسەی دەسـتاند و لـە حەسـرەتان هەناسێکم هەڵدەکێشا.

جارێکیان کە ئومێد دەگەڵ هاوسەرەکەیدا خەریکی قسان بوو لە پڕ چاوی بە من کـەوت و زانی بەوییـەوە خـەریکم. بـە ئەدەبانـە سـەرێکی لەقانـد و بـە ئامـاژەی سەرسـڵاوی کـرد. هاوسەرەکەی کە ئاگای لە هەڵسوکەوتی وی بوو بەرەو لای سەیرکردنەکەی ئومێدیەوە روانی و کەمنیشی دیت زەردەیەکی هاتێ و ئەویش سڵاوی کرد.

دەبووە بێ ئەدەبی ئەگەر نەچووبامایە پێشێ و چاك و چۆنیم نەکردبایە، ناچـار بـەرەو لای وانەوە چووم و لەسەرەخۆ سڵاوێکم کـرد. ئومێـد و هاوسـەرەکەی هـەردووکیان بـە ئەدەبـەوە وەڵامی سڵاوەکەیان دامەوە و لە ئەحواڵیان پرسیم.

ئومێد کە سەرنجە پرسیاراوییەکانی هاوسەرەکەی دیت گوتی:

- ئازیزەکـەم جـەنابیان رەهـا خـاتوونن، بـرازای خاڵۆژنـە فـرانکم، رەهـا خـانم نۆشـینی هاوسەرمن.

نۆشین وەك بڵێی لە پێشدا شتێکی لە بارەی منەوە بیستبێ گوتی:

- ئەوە رەها خاتوون ئێوەن؟

بەسەیرێکەوە تەماشایەکیم کرد و پرسیم:

- بەڵێ، بۆ مەگەر؟

- هیچ، بیستوومە کە بابە گەورەی خوا لێخۆشبووتان نیوەی سامانەکەی داوە بـە ئێـوە. هەر بۆیە زۆرم حەز دەکرد بتانبینم.

سەیرێکی نومێدم کردەوە کە دەگەڵ هاوسەرەکەی خەریکی قسان بوو ئەوجا لە نۆشینم پرسی:

- دەتوانم هۆی ئەو خرپشکنیەتان بزانم و بپرسم؟

نۆشین زەردە خەنەیەکی جوانی هاتێ و گوتی:

- هەرچەندە ناشکوترێ بەڵام داستانی ژیانی ئێوە دەنێو هەموو ماڵە خزم و قەوم و قیلەو کەسوکاراندا گەڕاوە و باسی جوانیە تۆشم لە هەمووان زۆر گوێ لێ بووە. دەزانم کە پێشان یەکێکت خۆشویستووە بەڵام بابە گەورەتان نەیهێشتووە تۆ و ئەو پێکتر بگەن و بۆ یەکتر بن...

نومێد بە چەند نەرمە کۆکەیەکی درۆزنانەی ساختەوە پێشی بە قسەی ژنەکەی گرت و گوتی:

- نازیزم، بە یارمەتی خۆت بە وەبیر هێنانەوەی رابوردووان، رەها خاتوونێ نارەحەت مەکەن.

چونکە هەراسانی ئەوەی بووم کە بزانم دەنێو بنەماڵە و خاو خێزانەکاندا دەربارەی من چیان گوتووە، گوتم:

نا هەر حەزدەکەم بزانم هاوسەرەکەتان لە بارەی منەوە چ دەزانن؟

نۆشین بە ئاوازێکی بەستەزمانانەوە گوتی:

- خودا دەزانێ من هەرگیز نیازی نارەحەتیە وەم نەبووە، ببوورن, باشە خۆ دەزانن جاری وایە جڵەوی زمانم بە دەستە خۆم نامێنێ.

بە ئارامییەکەوە بە دەم ئاوازە راستگۆییانەکەیەوە پێکەنیم وگوتم:

- ئێوە خۆتان نارەحەت مەکەن، چونکە من هیچ نارەحەت نیم، پێشت نەگوتم چ شتێکتان دەربارەی من بیستووە؟

نۆشین تەماشایەکی دەموچاوی نومێدی کرد و کە نارەزامەندی دەدەموچاوی مێردەکەیدا خوێندەوە گوتی:

- هیچ، وازی لێ بێنە و قسەکانم بە هێند هەڵ مەگرە.

ئەوجا دەستی نومێدی گرت و درێژەی دایە:

- بە یارمەتی خۆتان، بمانبوورن، خاڵۆژنە ئێمەی بۆ نیشیکی نارد بۆیە بە تەواوەتیم لە بیرچۆوە.

دوایەش بە کورتە خوا حافیزێکیەوە دەستی ئومێدی گرت و بەدوا خۆی دا. دوای ڕۆیشتنیان ئیدی ئومێدم نەدیتەوە. سەعاتێکی دیش لە ماڵێ پوورە فرانکێ مایەوە و من هەروا بە هیوای دیتنەوەی جارێکی دیکەی ئومێدیەوە دەهەموو جێیەکمەوە دەڕوانی بەڵام ئومید سووسەیەکی نەبوو. بەغەم و خەفەتێکی یەکجار گرانەوە لە ماڵێ پوورە فرانکێ هاتمەدەرێ و دەگەڵ دایك و باوکمدا هاتمەوە ماڵێ.

ڕۆژەکانی دواتریشم هەروا بە هیوای دیتنێ مەهدییەوە بەسەر دەبرد. هەر جارێکیش کەمەهدیم لەلا بووایە ئەوەی بە خەیاڵمدا هاتبایە بۆ دڵخۆش کردنی ئەو منداڵە بچکۆلانەیەی خۆمم ئەنجام دەدا. ئەو میراتەی بابە گەورە بۆی بەجێهێشتبووم توانای ئەوەی دابوومێ داوا و ویستەکانی ئەو منداڵە بچکۆلانەیەمی هەموو پێ بێنمە دی. بەبێ ئەوەی دەست لەبەر بابم پان کەمەوە لەو هەموو ملیۆنانە میراتییەم بۆ دڵخۆشیە کورەکەم خەرج دەکرد کە هەمبوو. هەموو هەفتەیەك ئەوم بە جۆرەها جل و بەرگی جوان ویاریی منداڵانەوەوە دەنا ردەوە ماڵێ جەمیلەی بەڵام هەفتەی دواتر کە مەهدی دەهاتەوە سەردانێم دیسانەوە بەهەمان جل و بەرگی پیس و دڕاوەوە دەهاتەوە و هێندە نابووت  بوو هەر کەسێك بیدیبایە زگی پێی دەسووتا.

بەشێکی سامانەکەمم دایە دەست بابم تا لە جێیەکیمدا بۆ ڕەنێوبێنێ و بۆم دەئیشێکیەوە بخا، بابیشم دەچەندین کۆمپانیا و کارخانانیدا کردمە هاوبەش و بەم شێوەیەش بوومە یەکێك لەپشکدارانی گەورەی شاری تارانێ. داوام لە بابم کرد چونیەتی هەڵسووڕاندن و سەرپەرشتی و بەڕیوە بردنی کارەکانم فێرکات و بابیشم قبوڵی کرد و پێشی خۆش بوو.

زۆر بە وردیم گوێ بۆ قسەکانی بابم ڕادەگرت و بەقسەم دەکرد و لە ماوەیەکی زۆر کورتدا لە شێوەی کارەکان شارەزا بووم و ئەوجا بە تەنیا کاروبارەکانم هەموو گرتنە دەست. دەژیاندا لەهیچ شتێکم کەم نەبوو و تەنیا ناخۆشییەکی کە هەمبوو ئەو وەزعە نالە بارەی مەهدی بوو کە بەردەوام جەمیلە ئازاری دەدا.

ئەو ڕۆژە بە هەزاران هیوا و ئاوات و ئارەزووەوە چوومەوە ئەو جێیەی کە بڕیار بوو مەهدی لەوێ وەرگرمەوە و هەروەك جارەکانی دی ئەو مەئموورەی کە هەموو هەفتەیەك مەهدی بۆ دێنامەوە لە کات و ساتی دیاریکراودا مەهدی دایەوە دەستم. هەر بە دیتنێ ئەو سەر و وەزعەی مەهدییەوە باوەشم پێداکرد و کەوتمە گریانێ. بە قوربان و سەدەقەی بووم و دەستم بە سەریدا هێنا و دڵم دایەوە، لە مەهدیم پرسی:

- مەهدی گیان ئەدی ئەوە بۆ ئەو جلە جوانانەی کە هەفتەی پێشوو بۆم کڕیت لەبەر ناکەی و ئـەو جلـە کـۆن و دڕاو و پـیس و پۆخڵانـەت دەبـەر کـردووە؟ مەهـدی بـە دەنگـە پـاك و منداڵانەکەی خۆیەوە دەمی قسانی کردەوە و ئاگری دەدڵی من بەردا:

- ئەو جلانەی دەڵێی زۆرم خۆشدەوێن و حەزیشم لێیانە بەڵام مامۆژنە جەمیلە ئـەوانی لێ ستاندمەوە و ئەمانەی دەبەر کردمەوە. دەشڵێ کە ئەو جلـە شـڕ و دڕاوانـەش لـە منـداڵێکی هەتیوەڵە هەر زیادە.

مەهدی بێدەنگ بوو بەڵام لە پڕ شتێکی بە بیرهاتەوە و گوتی:

- دایە من حەز ناکەم یارییەکانی خۆم بدەم بەمنـداڵانی دیکـە بـەڵام مـامۆژن ئـەوانم لێ دەستێنێ و دەیانداتە ئارمان و ئەمین یارییان پی بکـەن، کاتـێ کـە دەچـم یارییـەکانیان لێ بستێنمەوە مامۆژنم بەسەرمدا دەقیژێنێ و لێم دەدا. ئەوەتا تازەش داغی کردووم.

لە تاوان و لە حەژمەتان دەمی خۆمم گرت نەکا دەنگی هاوارم بەرز بێتەوە.

بە چاوی فرمێسکاوییەوە سەیرێکی مەهدیم کرد و پرسیم:

- ئێ باشە بۆ داغی کردی.

مەهدیش کە کوڵی هەستا بوو بە دەنگێکی بەرزەوە لەسەڵای گریانێی دا وگوتی:

- دەگەڵ ئارمانیمان شەڕ بوو، ئـاخر ئـەو ئوتۆمبێلەکـەمی شـکاند، ئـەو لـە ڕقـی مـن توتۆمبێلەکەی توند بە عەردی دادا و شکا منیش لـێم دا. مـامۆژنیش قـژی سـەری گـرتم و بردمیە مەتبەخێ و بە کەوچکی گەرم پشتە دەستی داغ کـردم. کاتـێ کـەمن لەبـەر ئـازاری دەمقیژاندو فووم لە دەستە سووتاوەکەم دەکرد مامۆژن دەستی لەسەر زاری دانام و قیژاندی:

- بێدەنگ دەبی یا بۆ خۆم بێـدەنگت کـەم، ئـەجارە بۆیـەم داغ کـردی تـا ئـەمبێ بـی و نەخەڵەتیی جارێکی دی دەستت لە ئامۆزایەکانت بەرزکەیتەوە.

مەهدییە ژیکەڵانەکەم بەدەم هەنیسکی گریانی ئەو ڕۆژە سەخت و ناخۆشـانەوەی بەسـەری بردبوون منی وەك شێتان لێ کرد بوو و هەر ئەوەندە بوو شێت نەدەبووم.

مەهدیم دەئامێزێ گرت و ماچم کرد. بردمەوە ماڵێ و دەسـتە سـووتاوە هەوکردووەکـەیم مەرهەم کرد.ژمارەی تەلەفۆنی ماڵێ بابم دایە مەهدی و داوام لێ کرد هەر کاتێ مامۆژنەکەی لێی دا و یا ئازاری دا تەلەفۆنم بۆ بکا و هەرچی هەبوو پـێم بڵـێ. هێنـدەم دەربـارەی ئـازار و ڕەفتارە دڕندانەییەکانی جەمیلەی بەلایەنی مەهدییەوە دە دڵیدا بوو کە بێ ئیختیار ئەو ڕۆژەم تا ئێوارێ ددان لێ دەچیڕەوە دەبرد. هەر بە دوای ئەوەوە بووم چاوێکی لە جەمیلە و کوڕەکـانی

سوور کەمەوە و بیانترسێنم. بڕیارم دابوو جەمیلەی وا تەمبێ کەم جارێکی دیکە زات نەکا مەهدی ئازار و ئەشکەنجە بدات و داغی کا.

ئەو هەفتەیەش مەهدییە بچکۆلانەکەمم بردەوە پارك و ڕێستۆران و هەموو جۆرە یارییەکی منداڵانە و جل و بەرگی تازە و جوانم بۆ کڕیەوە. بە ڕووالەت پێدەکەنیم و دەناخیشدا خوێنم دێنایەوە و دڵم خوێنی لێ دەچۆڕا. هەر جارێکی کە چاوم بە دەستە برینداره‌کەی منداڵەکەم دەکەوتەوە دڵم دەگوشرا و ئاگری تۆڵەم دە دڵیدا گزارەی دەکێشا. بەڵام دووبارە کاتی لێك دابڕانەوێ هاتەوەو بە ناچاریەوە، ناچار بووم کە مەهدی بەرمەوە و ڕادەستی کەمەوە. ئەمجارەیان مەهدی حەزی نەکرد یارییەکانی دەگەڵ خۆیدا بەرێتەوە و گوتی:

- ئەگەر ڕێ بدەی یارییەکانم دەگەڵ خۆمدا نەبەمەوە، باشە؟

هەرچەندە هۆی ئەو کارەیم چاك هەست دەکرد پرسیم:

- بۆ ئازیزەکەم؟ من ئەمانەم هەموو بۆ تۆ کڕیون.

مەهدی سەرنجە پڕتاسەکەی دە یارییەکانەوە بڕی و بە دەم هەڵگرتنەوەی ئوتۆمبێلە پۆلیسییەکەیەوە وەڵامی دایەوە:

- پێم خۆشە ئەمانە هەموویان لێرەبن تا هەفتەیەکی دیکە کە هاتمەوە یارییان پێ بکەمەوە حەزناکەم ئەمانەش خراپ بن، تەنیا ئەم ئوتومبێلە بچووکەیان کە دەگیرفانمدا جێی دەبێتەوە دەگەڵ خۆمیدا دەبەم و بە دزیەوە یاریی پێ دەکەم.

بە دەمیەوە پێکەنیم و ماچم کرد و بە سۆزێکەوە داوام لێکرد هەرچییەکی حەزی لێیەو پێی ڕاستە با وابکا. دڵنیاشم کردەوە لەوەی کەهەر چەندێکیش یارییەکانی خراپ کەن دیسانەوە هەر بۆی دەکڕمەوە و نابێ بە خراپ بوونێ یارییەکانی نارەحەت بێ و غەمێ بخوا.

کاتی خوا حافیزیە مەهدی و سالار دەستی یەکیان گرت و چەند هەنگاوێك لە پێش منەوە دەڕۆیشتن تا گەیشتنە شوێنی ڕادەست کردنەوەی مەهدی. سەیرم کرد مەهدی بەچرپەوە شتێکی بە گوێی سالاریدا دەچرپێنێ. هەرچەندەم گوێ هەڵخست نەمزانی باسەکەیان چیە. مەئموری وەرگرتنەوەی مەهدی چاوەڕێی مەبوو.

مەهدیم بەو سپاردەوە و ئەوان بەرەو لای ماڵێ جەمیلەوە کەوتنە ڕێ. ئەوان ڕۆیشتن و تالە چاویش ون بوون هەر سەیری دەست هەڵتەکاندنەکانی مەهدیم دەکرد و دەگریام. دوای ڕۆیشتنی ئەوان لە سالارم پرسی:

- مەهدی بەدزیەوە چی دەگوت؟ هیچ پێویستیەکی هەبوو لەمنی بشارێتەوە؟

سالار سەرنجە غەماوییەکەی بەردایەوە و گوتی:

- مەهدی ئەوەی بۆ باس کردم کە مامۆژنی هەمیشە هەر ئارمان و ئەمینی لە باوەش دەکات و ماچیان دەکا بەڵام قەت جارێکی ئەوی لەکۆش و باوەشان ناکا.کاتێکیش کە رۆژانە دەداتە ئارمان و ئەمینی ناداتە ئەو تا ئەویش وەك ئەوان شتی پێ بکڕێ، بەڵام پێیان دەڵێ کە شتتان کڕی بەشی ئەویش بدەن. ئەو دەمی پارچەیەکی بچکۆلانەی بۆ ڕادەدێرن یا هەڵیدەدەنە بەردەمی، سەر عەردی. مامۆژنیشی چاوی لێیە کە کوڕەکانی شتەکەی بۆ هەڵدەدەنە سەر عەردی و چ دەنگانیش ناکا. کە مەهدیش تووڕە دەبێ و نایخوا بەگژیدا دین و دەڵێن، مردوو مراوە ئەویش وەك دایکەکەی پڕفیس و ئیفادە و روح زلە...

مەهدی سکاڵای دڵی خۆی کردبوو و سالاریش سکاڵا منداڵانەییەکەی مەهدی دەگێڕایەوە و بەند بە بەندی گیان و لەشی منی دەسووتاند. سالار هەروا بۆ چرکەیەك لە رۆیشتن وەستا و رووی دەمن کرد و پرسی:

- باجی! ئەوە ناکرێ کارێکی وابکەی مەهدی بێنینەوە لای خۆمان؟ حەزناکەم مەهدی بچێتەوە ماڵێ مامی، باشە بۆ بۆ ئەوان هەیە مەهدییان لەلا بێ بەڵام ئێمە بۆمان نەبێ منداڵی خۆمان بەخێوکەین؟

سەرم بەردایەوە و ئەو دڵۆپە فرمێسکەی سەر برژۆڵەکانم سڕیەوە و وەڵامم دایەوە:

- بۆ ئەوەی تۆڵەم لێ بکەنەوە، تۆڵەی ئەوەی کە بۆ بەمحەممەدی رازی نیم دەگەڵیدا بژیم و بۆ خۆشم منداڵەکەی بە خێوکەم. بەڵام خودا بۆ خۆشی ئاگادارە و دەزانێ چیم نەکرد هەر بۆ ئەوەی ئەو رۆژانەی ئێستا نەبینم بەڵام کەڵکی نەبوو و هەمووی هەڵوەشایەوە. ئیدی بەشی من و مەهدی ئەمە بوو.

ئیدی سالار هیچیدی نەگوت ، جا نازانم دە مانای قسەکانم گەیشت و هیچی نەگوت یان هەر بە دوای تێگەیشتنی قسەکانی منەوە بوو کە ئاوا بێدەنگ بوو و منی ئاوا دەنێو ئەو بیرو خەیاڵە پڕ لە ئازارانەدا بەجێهێشت.

سالار زۆری باسی حەسرەتەکانی مەهدی بۆ کردم، ئای کە نەزان بووم کاتێ کە پێموابووە بەو چل و هەشت سەعاتەی کەلەلام دەمێنێتەوە دەتوانم هەرچی ناگوزووریەکانی هەیە هەمووی بۆ ببڕم و بۆی قەرەبوو بکەمەوە.

بەتەلەفۆنەکانی دەگەڵ مەعسوومە خانێمڕا زانی کە محەممەد و موحتەرەم بوونەتە ژن و مێردی تەواو و هەموو رۆژێ هات و هاواری مەحتەرەمێ لە ماڵێوە بەرزە.

مەعسوومە خانم دەیگوت:

-محەممەد ئالوودە بووە وەك لیرە و لەوێشم بیستووە موغازە و تیك و دروومانە کەشی بەرهەلدا کردووەو خەریکی قاچاغ و قاچاغ فرۆشتنییە و هەربینا دەو رۆژانەشدا گیرا.

قسەکانی مەعسوومە خانێم زۆر پێ ناخۆش بوو، هەرچەندە محەممەد مێردێکی چاکیش نەبوو بەڵام لەبەر ئەوەی بابی منداڵەکەم بوو حەزم نەدەکرد رۆژی بەو رۆژەی گەیشتبایە و ئاوای ببینم. مەعسوومە خانم دە درێژەی قسەکانیدا گوتی:

- چەند جارانم موحتەرەم دیوەو قسەم دەگەڵدا کردووە هەر ئەوەی لای خوا ناخۆشە ئەوەی بە محەممەدی گوتووە و بەو ژیانەی دەگەڵ محەممەدی نارازییە، نارازییەکەی زیاتر لەسەر ئەوە بوو کە محەممەد نیازی وابووە مەهدی بەرێتە لای ئەو. موحتەرەم دەیگوت، منداڵەکانی خۆم کەمن ئەویش دەیهەوێ تولە سەگەکەی خۆی بێنێتە لای من، چی بە خەیاڵداهاتووە ناکا وابزانێ قەرەواشی راگرتووە، ئەگەر سەرم لەسەر دانابێ ناچمە ژێر ئەو بارەوە، وەی لەو خوو و رەوشتەی کە هەیەتی ئێستاش هەر نۆی وی بەسەر دەی مە دایە کاکم!

دەڵێ نابێ بەهێنانی مەهدی ناقایل بی، براژنم گوناهی چیە کە ناتوانێ جگە لە منداڵەکانی خۆی زیاتر بە خێوکات، و مامۆستاییەش بکا، و ئێمەش مەهدی بکەینە سەربار و بن باری کارو ئەرکەکانی؟ منیش دە وەڵامیدا گوتم بەر لەوەی کە ژنەکەت تەڵاق دەی دەبوو بیرێکی ئەم رۆژانەت کرد بایەوە.

موحتەرەم چاو وبرۆی بادەدان و بە ئاو و تاوەوە دەربارەی نارەزایەتییەکانی دەدوا، دوایین جار کە دیتمەوە پێی گوتم:

- ئەوە ئێستا دەزانم ئەو بەستەزمانە بەندەی خودایە چی بەدەست ئەو پیاوەوە چێشتووە. حەوت جەرگی هەبووە کە توانیویەتی ئەو پێنج ساڵەی دەگەڵدا هەڵکات و دەگەڵیدا بژیەت، هەر چەندە ئەو دەمی ئالوودە نەبوو کەچی لە بەخت رەشیە من ئالوودەش بوو. بۆ خۆم و منداڵەکان کەم بووین ئەویشم لێ بووە سەربار. چەند جارێکانم بریاردا بچم و بەستادی بەرگری و زۆرانبازی مادە هۆشبەرەکان بڵێم و بەم جۆرە سایەی شوومی ئەو پیاوە لەسەر رووی ژیانی خۆم لابەرم بەڵام ترسام.

چەندین جارانیشم ویستووە خۆمی پێ بە تەڵاقدان بدەم بەڵام لەوەی ترساوم محەممەد یان خۆم یان منداڵەکانم بکوژێ، چونکە ئەو پیاوە دڕندەیە هەرچی بڵێی لێی دەوەشێتەوە.

باش دەزانم کە تەواوی هەموو ئەو بەڵایانەی بە سەرم دێن هەقە مستەمەوهەقی خۆمە! ئەوە هەمووی ئاهو هەناسەی ئەو ژنە بێدەرەتانەیە کەمنی بەو ڕۆژ ڕەشیە گەیاندووە مەعسوومە خانم هەروا قسەی دەکرد و بەشەوق و زەوقێکی زۆرەوەی باسی ئاڵوودەبیبە محەممەدی و داد و بڕۆی موحتەرەمیّ دەکرد بەڵام من بەوەی کەمحەممەد ئاوای خۆ خوار و خیچ و ناهەموار و زەلیل کردبوو کە موحتەرەم وا بە ئاشکرا لەلای هەموو چاك و خراپێکی چی خراپ بوو دەیگوت. نارەحەت بووم. هەرچەندە من هیچم لە دەست نەدەهات و ئەوە ڕێیەك بوو محەممەد خۆی بۆ خۆی هەڵبژاردبوو و هەنگاوی تێدا داویشت. پێش جیا بوونەوەمان هەرچی لە دەستم هاتبێ ئەنجامم داوە تا چارەنووس و ڕۆژمان بەم ڕۆژە نەگا. بەڵام محەممەد دەوان ڕۆژاندا واشێت و شەیدا و گیرۆدەی موحتەرەم و هەڵسوکەوتە جرپنانەکەی بوو بوو کە ژیانی بە هەردووکمان بەمن و خۆی تاڵ کردبوو. تا سەرەنجام بە ئارەزووی خۆی گەیی کە ئەویش گەیشتن بە موحتەرەم خانێ بوو. موحتەرەمیش بە ویستەکانی خۆی گەیشت و محەممەدی بەرەو لای خۆیەوە راکێشا. بەڵام ئێستا دەبێ ئۆبالی ئاوانی وێران کردن و کوێرکردنەوەی ژیانی من هەڵگرێ.

وردە وردە کۆتایی ڕۆژەکانی ساڵێ نزیك دەبوونەوەو دەگەیشتن و بڕیارم دا محەممەدی ببینم و داوای لێ بکەم ڕۆژانی پشووی نەورۆزێ مەهدی بەرمە لای خۆم. پێش ئەوەش محەممەدی ببینم دەبوو باسەکە دەگەڵ دایك و بابمدا بێنمەگۆڕێ. دوای هێنانە گۆڕێ بۆ چوونەکەم و وەرگرتنی ڕەزامەندییە دایك و بابم چوومە ماڵێ موحتەرەمێ. لە دەرکەم دا و ڕاوەستام. خۆم بۆ ڕوو بەڕوو بوونەوەی موحتەرەمێ ئامادەکردبوو. وامدەزانی موحتەرەم هەر چاوی بەمن بکەوێ، دەرکەکە پێکدادا و ڕووی وەرگێرێ و قسەم دەگەڵ نەکات. بەڵام بە پێچەرانەی بۆ چوونەکانمەوە موحتەرەم دەرکەی کردەوە و هەرکە چاویشی بەمن کەوت چاکوچۆنی کرد و فەرمووی ژووریێ لێ کردم. هەرکە چوومە ناو ژوورێ هەموو کەل و پەلی ناو ماڵ و یارییە منداڵانەکانم ناسینەوە. هەمان ئەو کەل و پەلانەی کە ڕۆژانێك دایك و بابم بەو پەڕی شادی و حەز و ئارەزووەوە بۆیان کڕیبووم. هەمان ئەو کەل و پەلانەی کە دوای تەڵاقێم تەنانەت کەوچکێکیشم لێ نەویستنەوە. چونکە حەزم نەدەکرد دەگەڵ دیتنێ هەر یەك لەو شتانە ئەو ڕۆژە تاڵانەی ڕابوردووم وەبیر بێنەوە. وەك بڵێی موحتەرەم لەسەرنج و ڕووانینەکانم گەیبێ. بەو زەردە خەنەیەوە کە هەمیشە پێی تێکڕا دەبووم و بە هەمان عیشوەو نازە تایبەتیەکەی خۆیەوە پرسی:

- چیە زۆر بە داخ و حەسرەتەوە سەیری شتومەکەکان دەکەی؟

سەرنجێکی لاقرتێیانەم دایە، بە لالووتێکەوە شانەکانم هەڵتەکاندن و وەڵامم دایەوە:

- نە لەبەر محەممەد و نەلەبەر هیچ کەسێکیش هەموو ئەمانەم لەلا پوولێکی قەڵبە. یەکێك بەحەسرەتەوە دەڕوانێ کە بە هەموو تەمەنی خۆی هەر لە ناخۆشی و بگرەو بەردە و نەداری و نەبوونیەدا گەورە بووبێ نەك منێك کە لە ماڵە بابمدا هەرچی دەستم بۆ بردبێ بەئەندازەی تەواوی تەواوەوە هەبووە وتەنانەت ئێستا لە جارانیش زیاتر.

- موحتەرەم کە قسەکانی بەلاوە زۆر هیچ و پووچ و بێ مانا ئەژمارد بەگاڵتە جاڕیەکەوە لێوێکی باداو گوتی:

- دوای تەڵاقدانێشت؟

بەنیشانەی پەسەندیە قسەکانی سەرێکم لە قاند و گوتم:

- دوای تەڵاقیشم. هەر ئێستاکە ئەوەندەم سامان و بوون و دارایی هەیە کە کەسانی وەك ئێوە بە خەونیش نایبینن، ئەگەر سەیری شتومەکەکانیشم کردبێ هەر تەنیا بۆ ئەوە بووە کە ئەمەکیان بۆ من نەبوو ئیدی دڵنیام کە ئەمە کیان بۆ تۆش هەر نابێ.

موحتەرەم ژارە خەندەیەکی کرد و گوتی:

- ئەو هەموو ڕێیەت بڕیوە و هاتووی هەر بۆ ئەوەی سامان و بوونەکەت بەڕووی مندادەیەوە؟ دەی باشە پێم وانیە لەوە زیاتر هیچ ئیشێکی دیکەت هەبێ. بەلالووتییەکەوە و بێ هیچ گوێدانە قسەکانی ئەو چوومە لای سەرەوەی ژوورەکەو دانیشتم. سەرنجێکی وردم لەسەرتاپای وییەوە دا و دەوەڵامیدا گوتم:

- نا من ئیشی گرنگترم لە بەچاو دادانەوەی ماڵ و سامانەکەم بەرووی تۆدا، هەیە. هاتووم محەممەد ببینم ئیشم پێیەتی بۆیە دەنا هەرگیز نەدەهاتم. کەمێك وەستام و ئەوجا گوتم:

- بیستوومە محەممەد لەوەتەی تۆی هێناوە ئێستا زەحمەتی ئیش کردنێش وە بەرخۆی نادا. بەڕاستی پیاوێکی نموونەت بۆ ژیانی خۆت دیوەتەوە!

موحتەرەم کە لەو گزارە و مەتەڵەك و پلار وتیرو توانجانەی من وە زاڵەهاتبوو خۆی پێ ڕانەگیرا و گوتی:

- ئیش کردن یا نەکردنی محەممەدی پەیوەندی بە خۆمانەوەیە پێمانیە پەیوەندی بە ئێوەوە هەبێ ناکا ئێوە پارێزەرو گەورەی ئەو خەڵکە بن و ئێمە نەمانزانیبێ؟

برۆیەکانم هەڵتەکاندن، سەرێکم لەقاند و بە دەنگێکی گڕەوە گوتم:

- خوا کێو نەبینێ بەفری تێناکا، بەراستی تۆ هەر میردی ئالۆودە و بێ ئیش و کارو قاچاغ فرۆشت لێ دەوەشێتەوە و قابیلتە و بەس.

موحتەرەم قیژاندی:

- بەسیەتی، ئیدی ئامادەنیم یەك وشەی دیکەم گوێ لێت بێ، من دەزانم ئەوە سزای ئەو کارانەی پێشوومە کە کردوومن دەیبینم, دەزانم کە زۆرم خراپە دەرهەقی تۆ کردووە، ئەوەش چاك دەزانم کە بۆ گەیشتنە محەمەدیم ژیانی تۆ کوێرکردەوە، بە خودای ئەوانە باش دەزانم و هەر سزاو تۆڵەی کردارە خراپەکانیشمە کە دەیانبینم و ئازارم دەدەن، بەڵام بە خودای وەڕەز بوو وم و چیدیکەم توانای ئەو ژیانەی نیە و خۆم پێ ڕاناگیرێ. هەر نەبێ تۆش ئیدی خوێم بەبرینانـدا مەکە. بۆ خۆم برسیم، مندالّم برسین! هیچ پارە و پوولێکمان نیە پێی بژین، پێش مێرد بەمحەمەد کردنێم ژوورەکانم بەکرێ دەدان و پارەی ئەوان ژیانێکی مەمرە و مەژیمان پێ رایی دەکرد و دەگەڵ مندالّەکاندا پێی دەژیاین بەڵام ئێستا ئەو خودا نەناسە ناهێڵێ ژوورەکان بەکرێ بدەم، دەڵێ حەزناکەم پیاوێکی غەوارە پێ بنێتە ئەو بەر و ماڵەوە کێ دەڵێ نەجارەیان تەڵاق لە منیش وەرناگری و مێرد بەو ناکەیتەوە، ئەوە بۆ خۆشی هیچ کە توانای هیچ کارێکی نیە.

لە بیستنێ قسەو دەردو غەمەکانیەوە دلّم هەلّچوو بەلاّم ناخم وا پڕ و لێوانلێو بوو لە بێزاری و لەنەفرەت کە بە هیچ جۆرێك گوێم نەدایە دەردو سکالاّیەکانی وبەهەندم هەڵنەگرتن. دەوسات وکات وئەو ماوەیەی کە لەماڵەوان بووم بەو پلار و توانج و مەتەڵەك وتانە و تەشەرانەم ئاگرم لەگیانی بەردابوو. دەو ساتانەدا حەزم دەکرد ئێش وئازار و زامەکانی هەموو بە چاوی خۆم ببینم، حەزم دەکرد بە دیتنی ئەو و بیستنێ گریانەکانی هێندێك غەم و خەفەتی دلّی خۆمیان پێ بدەمەوە.

پێم خۆش بوو ئەو فرمێسکانەی شەوانە لە چاوی من هاتبوونە خوارێ و داباریبوون ئێستا لە چاوەکانی ئەوەوە بێنە خوارێ و دابارن.

من ئیدی ئەو رەهایە دڵنەرم و بەسۆزو بەزەیی و میهرەبانەی جاران نەبووم دەستی ناهەمواری زەمانە هێندەی غەدرو ستەم و زۆرداری پێ ڕەوادیتم کە رەهای دلّ ناسك و میهرەبانی کردبووە ژنێکی دلّڕەقی تابلێی بێ بەزەیی.

حەزم دەکرد بەسەعات دانیشتبامایە و رەنج و ئازار و ئەشکەنجەو غەمی ئەو ژنەم دیبایە و چێژم لێ وەرگرتبایە. سەعاتێکی لە ماڵێ موحتەرەمێ دانیشتم و بەپلار و تیرو توانجەکانم

تاتوانیم ئازارم دا و خەفەتم دایە، خەریکی هەستانێ بووم برۆم محەممەد هاتە ژوورێ. کەمێ دیت تێکراببوو. زەردەخەنەیەکی ئازاراویانەی کەوتە سەر لێوان و گوتی:

- بەهـ بەهـ، رەها خاتوون، زۆربەخێر بێی، دەڵێی بۆیە هاتووی تا دەو خانووەیدا بیرەوەرییەکانت نوێ کەیتەوە؟

سەرنجێکی کینە تۆزانە و بەرقەوەم دایە و بەتوندیەکەوە گوتم:

- تا ئێستا کام زیندانییەکت دیوە دووبارە بۆ خۆی بێتەوە زیندانێ تا بیرەوەرییە تاڵ و پڕ ئازارەکانی رۆژانی زیندانێ وەبیر خۆی بێنێتەوە؟ من لە یاد و بیرەوەری ئەو رۆژ و شەوانەی کە دەگەڵ تۆمدا لەبن ساپیتێکیدا بەسەر بردوون تەریق دەبمەوە و شەرم دەمگرێ چ جای زیندوو کردنەوەی ئەو یادانە. ئەگەر هاتووشمە ناو ئەم زبڵدانەش و پێم دێرە ناوە لەبەر ئەوەی بووە کە رۆژانی پشووی نەورۆزێ مەهدی بەرمە لای خۆم.

محەممەد لەو قسانەم تەواو تووڕە بوو و گوتی:

کەمێك هێواشتر، راوەستە و دابەزە با پێکەوە بڕۆین،.. دەزانم کە چاوەڕێی ئەوەی نی مەهدی بدەمە تۆ و بە تۆی بسپێرم بەڵام هەر بۆ ئەوەی کە بزانی من زۆر لەوە گەورەتر و بەولاوە ترم کە تۆ بیری لێ دەکەیتەوە باشە و هیچ قسەیەکم نیە بەڵام مەرجم هەیە.

زانیم ئەو هیچ و پووچە دەیەوێ مەهدی بکاتە سەرەنێزەی گەیشتن بە ئامانج و مەبەستەکانی خۆی. بەو شارەزایی و ناسینەی خوو و رەوشتەکانی ئەوەوە دەستبەجێ گوتم:

- پێویست ناکا خۆتانم لەسەر گران کەن چونکە پەشێمان بوومەوە و هەستام بڕۆم، ئیدی لەمەودوا هەر باسیشی ناکەم، چونکە بەو زووانە مێردی دەکەمەوە و لەوانەشە بوونی مەهدی هەر ببێتە مایەی ناخۆشی و بەدبەختیەشم، رەنگە هاوسەرەکەم بەو هەر رازی نەبێ کە رۆژانی مانگی هەنگوینمان بە مەهدییەوە بەسەر بەرین.

محەممەد بەبیستنی قسەکانم دەبیرو خەیاڵانەوە چوو. دەمزانی ئێستا لەبەر خاتری تێکدان و هەڵوەشاندنەوەی مێردکردنەوە درۆیینەکەم هەر چونێکی بووە مەهدیم بەسەر دەکاتەوە و دەینێرێتەوە لای من. زەردە خەنەیەکی پیرۆزمەندانەم کەوتە سەر لێوان. لە جێوە قیت بوومەوە و گوتم:

- من بۆ بردنەوەی مەهدی هاتبووم، بەڵام ئێستا کە بەباشی بیر لێ دەکەمەوە سەیر دەکەم بوونی ئەو دەبێتە بەرگری و لەمپەری بەختەوەری و خۆش گوزەرانیەم، بۆیە پەشێمان بوومەوە و ئیدی ئیشێکی دیشم نیە. بۆیە تکا دەکەم رۆژانی پشووەکان لەبەر وەی مێردەکەم دێتەوە

ـمان با مەهدی هەر لەلای خۆت بێ، حەزناکەم بە دیتنێ مەهدی بڕیارەکانمان لێك هەڵ بوەشێنەوە.

بەبێ خوا حافیزی ماڵەکەیانم بەجێهێشت و محەممەدیشم دەگێڕاوی بیرو خەیاڵاندا بەتەنێ هێشتەوە. بەرەو ماڵێ بابەی بوومەوە. وەك رۆژێم لاروون بوو کە محەممەد، مەهدیم هەر بۆ دەنێرێتەوە. هەرگیز بە بیریدا نەهات کەدەستی دە زاغی نراوە و هەڵخەتاوە. دەرێیەمدا بڕیاردا بچم و هێندێك شت بکڕم چوومە نێو شاریەوە و لە کۆگایەکی گەورە چوومە ژوورێ و بە رەو لای چەرخی بلووزانەوە چووم و چەرخەکەم بادا. سەرقاڵی هەڵبژاردنێ بلووزێکی بووم کە دەنگێکی ئاشنا بەرەو لای خۆی بردمەوە.

- خاتوونێ ئەحمەدی چۆنن؟

بەلای دەنگەکەمدا ئاوڕێك دایەوە. ئاغای کەنعانیم لەبەر دەمی خۆمدا دیت. بە دیتنێ ویم زۆر دڵخۆش بوو و بە گەرمیەوە کەوتە چاك و چۆنی و ئەحواڵپرسیەی ئاغای کەنعانی کراسێکی پیاوانەی کڕیبوو. راوەستا تا منیش لە کڕینێ بوومەوە و پێکەوە لە کۆگاکە هاتینە دەرێ. لەسەرداوای ئەو چووینە قاوەخانەی (تەریا) و بانگی کێك و قاوەی کرد. بەمیهرەبانیەوە سەیرێکی منی کرد و گوتی:

وەك دیارە ئێستا لە بارەی رەنگ و روو و باری دەروونیەوە لە بار و دۆخێکی باش دان و لەجاران گەشتر دێنە بەرچاوان وەنا؟ دەحاڵێکیدا کە زەردەخەنەم بەلێوانەوە بوو چاوم بەردانەوە و وەڵامم دایەوە:

- راستیەکەی چەند مانگێکە لە مێردەکەم جیا بوومەتەوە، لەوەتەی دەگەڵەویدا نەماوم تا دێ رۆژ بە رۆژ حاڵم چاکتر دەبێ. وردە وردە دێمەوە سەرەخۆ، تەنیا ئاریشەیەکی کە نارەحەتم دەکات و ئازارم دەدا دووریە لە مەهدی کوڕمەوە کە بەگوێرەی بڕیاری دادگا دراوەتەوە بابی و لای ئەوە. بابیشی دوای ژنهێنانەوەی و بە هۆی ئەوەی کە ژنەکەی، مەهدی بە خۆوە ناگرێ هەستاوە بردوویەتیەوە لای مامی و بەخێوکردنێ مەهدی بە وان سپاردووە.

ئاغای کەنعانی بە داخێکەوە سەرێکی باداو کەوتە بیرو خەیاڵانەوە. دوای چەند دەقیقێکان بێدەنگیەکەی شکاند و هەناسێکی درێژی هەڵکێشا و گوتی:

- منیش هەر لە هاوسەرەکەم جودا بوومەتەوە و دەستم لێ کردۆتەوە. ئێستا بەتەنیا دەژیم و رۆژان بەرێ دەکەم، بۆیە زۆر چاك هەست بە تەنیاییە تۆ دەکەم و دەقسەکانت دەگەم.

ئاغای کەنعانیبێدەنگ بۆوە. پەنجەی دۆشاو مژەی بەسەر لێوی فنجانی قاوەکەیدا دێنـا و دەنگۆکەکی نزمی لێ دێنا. کەوتبووە نێو گێژاوی بیرو خەیاڵانەوەو من بـە ئەفـسووسەوە تـێم هەڵدەڕوانی وسەیریم دەکرد. لە پڕ سەری بڵند کرد و راستەوخۆ دەچاوانمەوە راما و گوتی:

- ئەگەر رێ بدەیت و بۆ خۆت ئارەزووت لەسەر بێ هەر لەبەر هەموو ئەو وێکچوونە هەمە لایەنانەی کە هەمانە و لەبەر هەموو ئەو مەرجە یەکـسانانەی نێوانمـان باژیـانێکی هاوبەشـی پێکەوە دەست پێ بکەینەوە. بە هەر دووکیشمان محەممەدی رازی دەکەین تا مەهدیشت بداتەوە و لەبری ئەوەش هەرچی بیەوێ دەیدەینێ.

بێ هەست و خوست چاوم لە دەمی کەنعانییەوە بڕیبوو. ئەویش بە کـەفوکوڵ و تاسـەیەکی زۆرەوە دەرباەی ژیانی ئاینده و ئەو رۆژە خۆشانە دەدوا کە پێکەوە دەگـەڵ مەهدیـدا پێکیـەوە دەنێین و دەمانبێ. بەڵێنی دا ئەگەر پێشنیارەکەی قبوڵ کەم هەرچی لە دەستی بێ بۆ گێڕانەوە و هێنانەوەی مەهدی بۆ بەروباوەشم درێغی نەکا.

قسەکانی ئاغای کەنعانی منیان دەبیر و خەیاڵانەوە بـرد، ئـەو ژیانـە بـێ ئاکامـەی گـەڵ محەممەدیم منی بەرامبەر تەواوی پیاوی دنیایە بێ متمانە کردبوو. حەزم نەدەکرد جـارێکی دی دووبارە ئەو ژیانە تاڵ و پڕئێش و ئازارەی رابوردووم تاقی بکەمـەوە، تـازە دەهـات وردە وردە بێمەوە سەرەخۆ و هێور ببمەوە نەمدەویست تۆفانێکی دیم لێ هەڵکاتەوە و جێی ئەو ئارامیەی بگرێتەوە. لەوەش کە ئاوا راستەو خۆ و بوێرانە و بێ پەنا و پەردە ویست و داوایەکەی بـە ڕوو دادام تووڕە بووم، ئیدی هیچی دیکەم خۆ پـێ بەرامبـەر ئـەو وادە وبەڵێنـە شـل و پەیتانـەی رانەگیرا کە پێی دەدام.

بەڕقەوە جانتایەکەم لەسەر مێزەکە هەڵگرت و بە تووڕەییەوە گوتم:

- بەدوعا ئاغای کەنعانی.

کە ئاغای کەنعانی زانی تووڕە بوو وم بە داوای لێبوردنەوە گوتی:

- ببوورە، دەڵێی قسەکانم نارەحەتیان کردی، بەیارمەتی خۆت ببوورە.

هەروا بە دەم هەستانێوە گوتم:

- هەوڵدەدەم قسەکانی ئەو رۆتان بە هەند هەڵنەگرم و گوێیان نە دەمێ.

ئاغای کەنعانیبەبێ راوەستان پارەی مێزەکەی دا و بە دوای مندا بەڕاکردنەوە هاتـە دەرێ و لە دواوەڕا بانگی کرد:

- خاتوونێ ئەحمەدی، تکا دەکەم چەند دەقیقێکان راوەستن.

هەروا بەدەم هەنگاو هەراو کردنێوە گوتم:

- من چ قسەیەکم دەگەڵ ئێوەدا نیە ئاغا.

- تکا دەکەم هەروا کەمە دەرفەتێکم دەنێ تا هەر نەبێ بەلانی کەمەوە داوای لێبوردنتان لێ بکەم و پۆزشتان بۆ بهێنمەوە.

- پۆزشەکەتانم قبووڵە.

- دەزانم هەر لێم دڵگیرن، بەڵام باوەڕکەن هیچ مەبەستێکی خراپم نەبووە، تەنیا حەزم دەکرد هێندێکی ئەو حەزانەم کە دەمێکە هەمن و هەرگیز پێیان نەگەیشتووم شتێك بڵێم. تکا دەکەم کەمێك راوەستن.

ناچار راوەستام و رووم دە ئاغای کەنعانی کرد و گوتم:

- ئاغای ئازیز من نە بەردی سەر دڵان و نە پەیژەی پێدا سەرکەوتن و گەیشتن پێی بەحەزو ئارەزووەکانتانم.

ئاغای کەنعانی‌کەمنی هێندە بەرق و تووڕەییەوە دیت دەستی بە نیشانەی ڕادەستیە بەرزکردنەوە و گوتی:

- داوای لێبوردن دەکەم، داوای لێبوردن دەکەم، داوای لێبووردن دەکەم، داخوا بەسە یان هەمدیس دووبارەی کەمەوە؟

لەو کردەیەی خۆم پەشێمانبوومەوە و گوتم:

- منیش داوای لێبوردن دەکەم نە دەبوو ئاوا هەڵچم.

ئاغای کەنعانی بەدەنگێکی دڵداریانەوە گوتی:

- نا ئێوە هەقتان بوو لە بەرامبەر قسە بێ پەروایەکانی من تووڕەبن. چونکە ئێوە کوتەکێکی قورسی ژیانتان وێ کەوتووە. هەر بۆیە هەقتانە کە نەتوانن هەروا بە ئاسانی ژیانێکی هاوبەشی دیکە قبوڵ کەن، من ئەو هەقەتان دەدەمێ و لەو بێ پەرواییەی کە هاتیشە سەر زمانم و بە زارمدا هات داوای لێبوردن دەکەم، بەگەورەیی خۆت بمانبەخشن.

بە ئاماژەی دەست داوام لێکرد کە هیچیدیکەی لەسەر نەڕوا و گوتم:

- تکا دەکەم ئیدی ئەو باسە هەر لە بیر بەرنەوە.

- یانی دەتانەوێ ئاوام وەڵامی ڕەتکردنەوە بدەنەوە؟

پێکەنینم بە چەقاوە سوورییەکەی هاتێ. بەڕاستی پیاوێکی چەقاوەسوو بوو و هەروا بە ئاسانی واز نەدەهێنا. ئاغای کەنعانی کەمنی بە هێوری دیتەوە زیاتری غیرەت پەیدا کردەوە

دووباره دەرکەی قسانی کردەوە و ئەمجارەیان بە پارێزەوە، هەنگاو بە هەنگاو چووە پێش. بە پێچەوانەی ویستی ئاغای کەنعانی کە حەزی دەکرد هەرچی زووترە وەڵامی دەمەوە خۆم لە گێلیە دەدا و دوایەش لە بەرامبەر پرکێشی و سووربوون و پێداگرتنەکانی ویدا داوام لێ کرد مۆڵەت بدا دەربارەی ئەمە هێندێك بیر بکەمەوە و دەگەڵ ماڵەوەماندا راوێژێکی بکەم.

دوای سەعاتێکی خودا حافیزیم لێ کرد و بەرەو ماڵ کەوتمەوە رێ. دەتەواوی ئەو رێیەیدا هەر بیرم لە قسەو پێشنیارەکانی ئاغای کەنعانی دەکردەوە.

لە قبوڵ کردنێ پێشنیارەکانی دوو دڵ بووم، دەترسام ئەویش هەر وەك محەممەدی تەنیا دروشمی بەختەوەریە بدات و بەکرداریش هەنبانەی بەتاڵ بێ. هەرکە گەیمەوە ماڵێ زۆر بەسەر سورمانەوە مەهدیم دیت ئەوە لە حەسارێ دەگەڵ سالاریدا گەمان دەکا. لە خۆشیان قریشکاندم و ئەویش کە بەدیتنێم بە راکردنەوە بەرەو لای منەوە هات دەباوەشێم گرت و ماچبارانم کرد. بەوەی دەمدیت باوەرم نەدەکرد، باشە محەممەد ئاوا زوو هەڵخەڵەتاو بە خەیاڵی خۆی ویستبووی خۆشیەکەم لێ تێك دات و میرد کردنەوەکەم لێ هەڵوەشێنێتەوە.

پێکەنینم بە گێلیەتییە محەممەدی هات و بە شادمانیەوە لە مەهدیم پرسی:

- ئازیزەکەم کێ تۆی هێنایەوە ئێرە؟

مەهدی بەزمانێکی شیرینەوە کەلە خۆشیان دەنگی دەلەرزی و گوتی:

- بابە محەممەد منی هێنا و رێی داوە تا تەواوی رۆژەکانی جەژنێ لای تۆ بم، بابە گوتی رۆژانی جەژنێ هەموو هەر لای دایکت بە تا خۆم بە دواتدا دێمەوە.

دووباره مەهدیم دەئامێز گرتەوە و ماچم کردەوە و گوتم :

- هەر بەخێر بێیەوە ئازیزی دڵەکەم، بەخێربێیەوە.

بە سالارم سپاردەوە تا یارییەکەیان تەواوکەن. هاتمەوە ناو هۆڵێ و بانگی دایکم کرد. دایکم لە مەتبەخێ بوو و بانگی کردمە ئەوێ. چوومە مەتبەخێ و سلاوم کرد. دەحاڵێکدا کە روومەتە گەرموو گورەکانی دایکم بە گەرمیەوە ماچ دەکردن گوتم:

- ماندوو نەبی، بە یارمەتی خۆت ببوورە کە ئەورۆم بەتەنیا بە جێهێشتن.

دایکیشم بە گەرمیەوە وەڵامی سلاوەکەی دامەوە و گوتی:

- نازانم ئەورۆ خۆر لەکام لاوە هەلاتووە کە محەممەد بۆ خۆی منداڵەکەی هێناوەتەوەو پێیشی گوتووە جەژنێ هەر لەلای دایکت بە تا بۆ خۆم بە دواتدا دێمەوە.

بە دەنگێکی بەرزەوە پێکەنیم و گوتم:

- دەمزانی گێلە بەڵام هەرگیز پێموانەبوو تا ئەو ئەندازەیە گەمژە وگێل و گەلحۆو کـەودەن بێ و ئاوا بە ئاسانی هەڵخەڵەتێ!

- دایکم بەسەرسامیەوە سەیری کردم و پرسی:

- بۆ؟ باشە چیت پێ گوتووە کە هەڵخەڵەتاوە؟

کورسییەکەم بەرەو لای خۆمەوە ڕاکێشا و بە دەم دانیشتنێوە گوتم:

- ئەگەر ئیشت نیە فەرموون دانیشن چونکە بەسەرهاتەکە دوور و درێژە وبە پێوە مانـدوو دەبن.

دایکیشم کورسییەکی بەرامبەری من ڕاکێشایە بەرە خۆی و گوتی:

- خێراکە زوو بیگێڕەوە بابزانم چ بووە و چ جادوویەکت لە یارۆی کردووە! هەر لـە چـرکەی ڕوو بەڕوو بوونەوێ موحتەرەمێ و چوونە مـاڵێی وتـا دیتنـێ ئاغـای کـەنعانی و پێـشنیارێ خوازبێنیەکەی هەموویم بۆ گێڕایەوە. پێکەنینم بە جووڵە جووڵەکانی دایکم دەهـات چـونکە جارێکی سەری بادەدا و ساتێکی ڕووی گەش دەبۆوە و هەندە دەقیقان خـەیاڵاوی دەهاتـە بـەر چاوان. دوای تەواو بوونێ قسەکانم دایکم پرسی:

- ڕەها گیان، دەزانم تۆ بۆ خۆت ئەزموونی تەواوت هەیە کە لەوەڵامدانەواندا پەلە نەکەی، ئەگەر حەزت لێیە مێردی بکەیەوە واچـاکترە ڕاوەسـتی تـا بابـت و خاڵـت دەربـارەی ئاغـای کەنعانی قسێکی بکەن و دەربارەی وی پرس و ڕایەکی تەواو و لێکۆڵینەوێکی بکەن.

شانم هەڵتەکاند و گوتم:

- ڕاستییەکەی هیچ بڕیارێکم نیە لەوەی زیاتر ئەو چەند ڕۆژانەی کە مەهدی میوانی منـە بەرنامەیەکی دانێم کە زۆر بەخۆشی ئەو چەند ڕۆژانـە رابـوێرێ و هەرچـۆنێکی بـووە کـەش و هەوایەکی شادی و خۆشییەی بۆ بڕەخسێنم.

دایکم پرسی:

- ئەدی وەڵامەکەی ئاغای کەنعانی دەبتەچی؟

هەروا بە دەم هەستانێوە لەسەر کورسییەکەی گوتم:

- دوای جەژنێ کە سەرم سووك بوو بیرێکی حیسابیش لەم بارەیەوە دەکەمەوە، حەز ناکـەم ئەو چەند ڕۆژانەی جگەر گۆشەکەمم لە لایە بیری خۆم لەوی زیـاتر بەهیـچی دییـەوە سـەرقاڵ کەم.

کورسییەکەم بردەوە جێی خۆی و بەرەو لای ژوورەکەمەوە کەوتمە ڕێ تا هەرچی زووترە جلەکانم بگۆڕم. دایکم بانگی کردمەوە و گوتی:

- کەخۆت گۆڕی بە یارمەتی خۆت وەرەوە مەتبەخێ با زووتر ئیشەکان تەواوکەین، دەترسم لە پڕ میوان بێن و ئیشەکان بە نیوە چڵی بمێننەوە.

بەهەوتیەکەوە هاتمەوە مەتبەخێ و پرسیم:

- بۆ ئەم شەو میوانمان هەن؟

دایکم سەیرێکی ناقایلانەی کردمێ و گوتی:

- ئەوە هۆشت لە کوێیە؟ ئەدی ئەو شۆ بڕیار نیە خوازبێنیە راحیلەی بێن؟ بەپشتی دەستم لە نێوچەوانێ خۆم دا و گوتم:

- هەر لەبیریشم نەبوو، یەکجاری و بەتەواوەتیم لەبیرچوو بۆوە، باشە هەر ئێستا دێمە یاریتان.بەخۆشحاڵیەوە چوومە ژووری و بە پەلە جلەکانم گۆڕین و چوومەوە مەتبەخێ و کەوتمە یاریدەدانێ دایکم. بەردەوامیش ئەو قسەی دەمهەویست بیکەم دەمێشك و بیرو خەیاڵی خۆمدا دێناو دەبرد نەکا ببێتە هۆی ڕەنجانی دایکم. دایکم کە بە ئاڵۆزییەکەی زانیم پرسی:

- رەها هیچ بووە؟ نارەحەتم دێیە بەرچاوان.

سەرنجە پڕ غەم و حەسرەتەکەمم دە رووخسارە میهرەبانەکەی دایکمەوە بڕی و گوتم:

- بەڵێ، دەمهەوێ داوایەکی لە ئێوە و لە بابم بکەم.

دایکم کە چاوە پڕ لە فرمێسکەکانی منی دیت ئیشەکەی بەجێ هێشت. بەنیگەرانیەوە سەیرێکی کردم و گوتی:

- هەر چیەکت پێخۆشە بیڵێ، دڵنیابە ئەگەر لە دەست ئێمەبێ هەر چیەك بێ بۆت دەکەین.

سەرم بەردایەوە و گوتم:

- تکاو و داوایەکەم بۆ خۆم نیە.

دایکم کە جاڕس ببوو گوتی:

- ئەدی بۆ کێیە؟ مەهدی! خێراکە کچێ قسەکەت بکە نیوە گیانت کردم!

دەحاڵێکدا کەفرمێسکەکانم دەهاتنە خوارێ و پێشبڕکێی داباریننێیان بوو گوتم:

- نەء دەربارەی مەهدیش نیە بەڵکە دەربارەی راحیلەیە.

چاوە تەڕەکانم دە روخساری دایکمەوە بڕین و درێژەم دایە:

- تکا دەکەم ژیانی من و هەموو ئەو ئێش و ئازار و دەرد و مەینەتییانەی کە چەشتمن بیانکەنە پەند و ئامۆژگاری و لێگەڕێن باراحیلە بۆ خۆی بڕیاری ژیان و ئایندەی خۆی بدات و ئێوە بە ناچاری و بە نابەدڵی خۆی بەمێردی مەدەن و ناچاری مەکەن، هەرچەندە خوازیارەکەشی لە هەموو سەرێکەوە تەواو کامڵ بێ.

دایکم بە سۆزەوە دە باوەشێی وەرێنام، ماچێکی گەرمی لە ڕوومەتێ کردم و بە دەنگێکی لەرزۆکەوە گوتی:

- دڵنیابە کچەکەم، لەو ژیان و دەرد و ئازارەی کە تۆ چێشتت من و بابت پەند و ئامۆژگاریمان وەرگرتووە ڕەنگە واشبزانی ئەوە هەر تەنیا تۆ بوو وی کە دەرد و ئێش و ئازارت چەشتووە بەڵام خودا بۆ خۆی شایەدە کە دەردو ئێش و ئازاری من و بابیشت لە ئی تۆ کەمتر نەبووە، چەندین شەو بە بێ تۆم بەگریان تا سبەینێ ڕۆژ کردۆتەوە و چەندین شەوان بابت تا بەیانی چاوی خەوێی لێك نەناوە و هەروا بە بێداری دانیشتووە و دەبیرو خەیاڵانەوە چووە، پێموایە هەر تەنیا ئەو هەڵەیە و هەمان ئەوجارە بۆ هەموو ئێمە بەسە.

- سوپاس، دڵم داکەوت و خەیاڵم ئاسوودە بوو.

دایکم زەردەخەنەیەکی هاتێ و گوتی:

- خێراکە هەر بینە میوانەکان گەیشتنەجێ و هاتن.

بە پەلە ئیشەکانمان سەرە و بەرەکردن و خۆمان بۆ پێشوازییە میوانان ئامادەکرد.

ئەو شەوە میوانەکان هاتن و خوازبێنییەکە لەکەش و هەوایەکی خۆشی و شادیدا ئەنجام درا و بڕیار درا هەفتەی دواتر ڕێ و ڕەسمی شەکراو خواردنەوەکەش بەڕێوە بچێ. بڕیاری مارەبڕین و گواستنەوەش هەلگیرا بۆ ڕۆژانی پشووی جەژنی نەورۆزێ. بەجۆرە ڕاحیلەش بەڕێوە بوو تا ژیانێکی تازە دەست پێبکا.

ڕۆژەکان هەروا بە خۆشی و شایی و هەڵپەڕکێوە تێدەپەڕین، هەموو ڕۆژێ دەنگی قاقای پێکەنینێ کەس و کار و شادی و شەنگوڵیە مەهدی دە تەواوی نێو ماڵێدا دەنگی دەدایەوە و زرمەی بوو و ئەو ناوەی پڕ دەکرد. جەژنی نەورۆزێ بە هەموو خۆشیە بەهارێ و بەتەواوی جوانیەکانیەوە گەیشتەجێ وهات. هەموو ئەندامانی ماڵێ بە خاو خێزانەوە هەر لە بەیانی زووەوە هەڵدەستان و تا درەنگانێکی بە ئیش و کارانەوە خەریك دەبوون دەگەڵ ئەوەشدا شەو درەنگانێکی شەوێ نیوەی ئیشەکان هەروا بە نیوەچڵی دەمانەوە.

دواییپیەکەی رۆژی دیاریکراو هات و دوای شـایی و زەماوەنـدو ئاهـەنگێکی تێـرو تەسـەل راحیلـەش چـووە نـاو مـاڵ و حـاڵ و ژیـانی خۆیـەوە. بـەوەی کـە دەمـدیت بەتـەك مێـردە نموونەییپیەکەی خۆیەوەیەتی خۆشحاڵ بووم.

پشووی رۆژەکانی جەژنی نەورۆزێ هەمووی بە شادی و هەڵپەرکێ و خۆشـییەوە تێپـەڕی و دووبارە غەمی دوورییە مەهدی هەموو گیانی داگرتەوە. رۆژی پازدەهەمی فەروەردینێ بوو کە محەممەد هات و مەهدی دەگەڵە خۆیدا بردەوە و بە رۆینەوێ مەهدی رۆژە خۆش و شـادییەکانی منیش بەسەر چوون.

چەندین جاران ئاغای کەنعانی بە هۆی خاڵ و خاڵۆژنێوە دەینارد کە ئەگەر رێ بدەین بێتـە خوازبێنییە. بابم نارازی بوو و نەیدە سەلماند. جیاوازی نێوان زۆریە تەمەنمانی کردبووە بیـانوو و ببووە رێگر لە بەردەم هاوسەر گیرییەمە.

* * *

رەها بێدەنگ بوو و بە رەبابە خانمێی گوت:

- بە یارمەتی خۆت کەمێك ئاو، یا پیاڵە چایەکم بدەنێ، گـەرووم دەسـووتێتەوە و زمـانم وشك بووە.

رەبابە خانم لەجێی خۆیەوە هەستا و دوو پیاڵە چای تێکرد و لە بەردەم من و رەهای دانـا. رەها پیاڵە چایەکەی خواردەوە و رووی دە رەبابە خانمێ کرد وگوتی:

ئەگەر شام ئامادەیە بە یارمەتی خۆت نان دانێ، ئەو رۆژانە هێندەم چەنە داوە کـە دڵنیـام سپێدە خانم ماندوو بووینە و شەو تا بەیانی خەونێ بە قسەو چەنە لێدانێ منەوە دەبینێ.

لەو جەفەنگەی رەهای هەر سێکمان بە پێکەنین هاتین و لە وەڵامیدا گوتم:

- بە پێچەوانەوە، ئێوە هێندە شیرین دەدوێن کەمن ئاگام لە تێپـەڕینی سـەعاتە وەختـان نامێنێ، کاتێ کە سەر لەسەر نووسینەکانم هەڵدەگرم ئەو دەمی دەزانم چەند وەخت تێپەڕیوە و من هەر ئاگاشم لێ نەبووە.

رەبابە خانم بە گاڵتەوە گوتی:

- ئەوجا دوای ئەوەی کە ئێوە بەسەرهاتەکەی خۆتان گێڕایەوە، دەبێ سپێدە خانم دانیشێ و گوێ بۆ قسەکانی من بگرێ.

- رەها بەدەنگێکی بەرزەوە پێکەنی وگوتی:

- توو بی و خودا ڕەبابە خانم، هەر نەبایە ڕاوەستابایت تا من بەسەر هاتەکەم دەگێڕایەوە ئەو دەمە ئەو قسەیەت کردبایە، بەو قسەی کە کردت، دەترسم سپێدە گیان بەسەر هاتەکەی من بە نیوە چڵی بەجێ بێڵێ و بە پێیەکان بگرێ و بێ پێیەکان واز لێ بێنی.

زەردەخەنەیەکم کرد و گوتم:

- بە هەڵە چووی، من بەهەموو ئارەزوویێکەوە بۆ قسەکانتان دادەنیشم و گوێتان لێ دەگرم.دوای نانی ئێواریێ ڕەها مۆڵەتی خواست بە زوویی بچێتە ناو جێگا. و من و ڕەبابە خانیش دوای سەعاتێك دەمەتەقێ هەریەکەمان چووینە ژوورەکەی خۆمان و خۆمان خزاندە نێو جێگا گەرموگوڕەکانمانەوە تا خۆمان بۆ ڕۆژێکی دیکە و باسێکی تازە ئامادە کەینەوە.

بەیانی زوو لە خەوێ ڕابووم و چوومە حەساریێ. بەکزەبای ساردی زستانێ سەرمام دە تەواوی لەشیدا گەڕا. هەوا ی پاکی بەیانی خەوی لە چاوم ڕەواندەوە و وەجۆشی هێنام. هاتمەوە ژوورەکەم، موشەمما بارانیەکەمم دەبەر کرد و لە ماڵێ چوومە دەرێ. پێم حەیف بوو دەو هەوا پاکەی بەیانیەدا لە ماڵێ بمێنمەوە و ڕاوێچکەی ئەو هەوا خۆش و دڵفڕینەی لە کیس خۆم بدەم. بەهەنگاونان بەرەو پارکەکەی نزیك ماڵێ ڕەهاوە چووم و سەعاتێکم دە پارکیدا پیاسە کرد و چێژم لەو کزەبای بەیانیەی وەردەگرت کە لە دەموچاوی دەدام. هەستم بە برسییەتیەکی زۆر دەکرد بە ناچاری بەرەو ماڵێ ڕەهای بوومەوە. کاتێ کە چوومەوە ژووریێ، ڕەبابە خانم و ڕەها هەر دووك هەستابوون.

ڕەبابە خانم بە دیتنێ من بە پێکەنینەوە گوتی:

- سڵاو سپێدە خانم هاتنەوە، ڕاستیەکەی بەیانی زوو کە هاتمە ژوورەکەتان و چاوم بە جێیە چۆڵەکەتان کەوت بە پەلە چوومە لای خاتوونێ و گوتم:

- خاتوون پێمـوایە سپێدە خانم هەر بەڕاستی ڕاستی هەڵاتوون.

بەسەرسامیەوە سەیرێکم کردێ و پرسیم:

- جا باشە بۆ پێتوابوو من هەڵاتووم؟

ڕەهاش کە هاتبووە حەساریێ و ئاگای لە قسەکانی مە بوو گوتی:

- ڕەبابە خانم دەیگوت قسەکەی دوێنێ شەوێ کە گوتم سپێدەخانم دەبێ گوێ بۆ قسەکانی منیش بگرێ هەر ئەوە وای لێ کردووە هەڵێ.

کەوتمە یادی قسەکانی شەوی پێشتری رەبابە خانم و رەهای. کەوتمە پێکەنینێ و تازەش پەیم بە مەبەستەکەی رەبابە خانێ دەبرد. هەرسێکمان چووینەوە مەتبەخێ و هەرکە چاوم بەمێزی رازاوەی خواردنێ کەوت زۆر بە ئیشتیاوە دەستم بە خواردنێ کرد.

راوێچکەی ناو ئەو هەوایە پاك و بێگەردە بووە هۆی ئەوەی دوو هێندەی رۆژانی دی بخۆم. کاتێ کە رەها زانی بۆ پیاسەی لە مالێ وەدەرکەوتووم گوتی:

- ئای خۆزگە بانگی منیشت دەکرد تا هەردووکمان پێکەوە چووباینایە پیاسەی، من شێتی پیاسەی ناو هەوای پاك و بێگەردی بەیانیانم، بەتایبەتی هەوای بەفرو باراناوی.

دوای قاوەلتیە هەموو پێکەوە چووینە هۆلی میوانان. رەها سەیرێکی سەعاتێی کرد و گوتی:

- سپێدە خانم ئەورۆ هێندێکم ئیش هەیە و دەبێ سەعاتێکتان بە تەنێ بەجێ بێلم خۆ نارەحەت نابن بە تەنێتان بەجێ دێلم؟

سەیرێکی دەموچاوە جوانەکەی رەهام کرد ودەحالێکیدا کە دەدلدا ستایشی جوانیە رەهام دەکرد وەلامم دایەوە:

- تکادەکەم من بە رێگری کارەکانی خۆتان دامەنێن و هەروەك رۆژەکانی پێش هاتنێم کاری رۆژانەی خۆتان ئەنجام بدەن.

رەها باسی لە ئامادەبوونی خۆی لە یەکێك لە کارخانەجاتەکاندا کرد و دوای سەعاتێك لە مالێ چووە دەرێ. چوون رەها رۆیشت و تا هاتنەوێشی کارو ئیشێکم نەبوو بیکەم وام بە چاك زانی سەرێك لە نووسینگەی گۆڤارەکە بدەمەوە.

کاتێ کە چوومە ژووری نوسینگەکەوە، هەموو هاوکارەکانم بەهەلەداوانەوە بەرەو پیلم هاتن و بەگەرمییەوە لێیان پرسیم و چاك و چۆنیان لەگەلێ کردم. ئاغای میرزاییش هاتە گەلە وان و گوتی:

- بەتاسەی بینینەوەی خانمێوە بووین، هەموومانت تێکرا لە بیر چۆتەوە، هەر نەبێ بەلانی کەمەوە هەر بەچەند رۆژان جارێك تەلەفۆنێکی بکەن و لە حالێ و ئەحوالی خۆتامان ئاگادارکەنەوە، نالێین لێمان بپرسن. بەشەرمێکەوە سەرم بەردایەوە و گوتم:

- هەقی ئێوەیە، باوەڕیشتان بێ هێندە سەرقالی کۆکردنەوە و ریکخستنەوەی نووسینەکانم کە ئاگام لە بەسەرچوون و هاتنەوەی شەو و رۆژانیش بڕاوە. شەوانە کە ئیشەکانم

تەواو دەبوون گۆڤارەکەم وەبیر دەهاتەوە. ئەو دەمەی کە بەلای تەلەفۆنەکەوە دەچووم دەمزانی گۆڤارەکەتان جێ هێشتووە وچوونەتەوە.

ئاغای میرزایی زەردەیەکی کرد و گوتی:

- ئێستاش هەر لە خودای بە زیادبێ کە جارجارە بەدرەنگێکەوە ئێمەت وەبیردێتەوە.

بەمەیلەو توورەییەکەوە سەیرێکیم کرد. ئاغای میرزایی هەردوو دەستی بەنیشانەی رادەست بڵندکردن و گوتی:

- من داوای لێبوردنتان لێ دەکەم، باوەڕتان بێ هەر مەبەستم گاڵتە بوو و هیچیدی. با لەوانە گەڕێین، بابزانم ئەورۆ بە دەستی پڕەوە هاتوونەوە یانە نا؟

- ئەگەر تۆزێکم لێگەڕێن و هیندەم بەقسان سەرنەکەنە سەرێ، بۆتان ڕوون دەکەمەوە.

ئاغای میرزایی قاقایەکی لێدا وگوتی:

- فەرموون ئەوە هەموومان بێدەنگ دەبین تا ئێوە دەرفەتی روونکردنەوێتان بۆ بڕەخسێ.

ئەو هەناسەیەی دەسینەمدا رامگرتبوو بەرهەڵدام کرد و گوتم:

- هەموو نووسینەکانم بۆ هێناونەوە و پێموایە ئیدی لە کۆتایی بەسەر هاتەکەی رەهاش نزیك بوومەوە. ئاغای میرزایی هەروا بە دەم چوونەوە لای نووسینگەی کارەکەیەوە گوتی:

- بەیارمەتی خۆت دەگەڵمدا وەرە نووسینگەی تا دەربارەی ئەمە هێندێك زیاتر بدوێین بە دوای ئاغای میرزاییدا چوومە نووسینگەی کارەکەی، ئاغای میرزایی بە ئاماژەی دەست داوای لێکردم دانیشم. دەرگاکەم بەدوای خۆمدا داخستەوە و لەسەر کورسییەکی کە بەتەك مێزی کارەکەیەوە بوو دانیشتم و دەسنووسەکانیشم خستنە سەرمێزەکەی.

ئاغای میرزایی نووسینەکانی هەڵگرتن و هەروا سەرپێی چاوێکی پێدا خشاندن. بە رواڵەت دیاربوو رازییە. دەحاڵێکیدا کە دەستنووسەکانی دەخستەوە سەرمێزەکە پرسی:

- دیارە ئەمانە ئامادەن بۆ چاپ؟

بەسەر لە قاندنێکەوە بۆ راستیە قسەکەی گوتم:

- تا ئێوە پێشەکیە چاپکردنێ ئەمانە ئامادە دەکەن ئەمنیش پاشماوەی نووسینەکانم دێنمەوە و دەتاندەمێ.

ئاغای میرزایی بە ڕەزامەندی و خورسەندیەوە سەیرێکی نووسینەکانی کردەوە و گوتی:

- هەر لەمڕۆوە ئێمەش کاری چاپ دەست پێدەکەین.

لە جێوە هەستام و گوتم:

- بەیارمەتی ئێوە منیش دەچمەوە ماڵێ خاتوونێ ئەحمەدی، دڵنیام ئەوانیش ئێستا هاتوونەتەوە. خودا حافیزیم لە ئاغای میرزایی کرد و لە نووسینگەی هاتمە دەرێ.

دەگەڵ هاوکارەکانیشم چەند دەقیقێکان کەوتمەوە قسان و ئەوجا لە نووسینگەی گۆڤاری بەرەو ماڵێ رەهایەوە هاتمە دەرێ.

هەر دەرێیەدا بڕیارەکەم گۆڕا و وام بە چاك زانی سەرێکیش لە ماڵەکەی خۆم هەڵێنمەوە کلیلەکەم دەقوفڵەکەیدا بادا و چوومە ژوورێ. ئەوە چەندین رۆژ بوو تازە دەهاتمەوە.

دێرو دەویم هەڵڕوانی هەرگیز دەگەڵ ماڵێ رەهای بەراورد نەدەکرا. ئەو هەموو تابلۆو دیمەنە رازاوانەی ئەوێ لەکوێ کە من شێتیان بوو بووم و ئێرە لە کوێ.

بە خەیاڵێکی ئاسوودەوە لەسەر لاتەختێکی تخێڵ بووم و لە بن لێوانەوە گوتم:

- بەڕاستی هیچ جێیەك وەك ماڵە خۆت نابێ.

سەیرێکی ئەملاولایانم کرد و کەوتمە خەیاڵانەوە:

- من هەر شەیدای ماڵێ خۆمم و هەر ئێرەشم پێخۆشە جا باهیچیش لەوشتە جوانکاری و تابلۆ و لۆکسانەشی تێدا نەبێ. لەماڵێ خۆمدا ئاسوودەم و ئەو دڵنیاییەش بە هیچ شتێکی ناو ئەو دنیایەی نادەم و نایگۆڕمەوە. دڵنیام ئەگەر لە رەهاش بپرسم ئەو ماڵەت بە هەموو بەسەرهاتە تاڵ و سویرەکانی رابوردووتەوە پێ خۆشترە یا ئەم ئاپارتمانە سادە و بچکۆلانە بە ژیانێکی ئارامەوە، حەتمەن ئەو ئاپارتمانە سادە و بچکۆلەو بێ شتومەك و کەل و پەلەی هەڵدەبژارد.

سەیرێکی سەعاتم کرد زۆر درەنگ ببوو لە جێوە هەستام. زۆر بەتاسەوە سەیرێکی ئەملاولایانم کرد حەزم نەدەکرد بەجێی بێڵم بەڵام چارە نەبوو هەر دەبوو رۆیبام.

کاتێ کە گەیمەوە بەر دەرکەی ماڵێ رەهای، دەستم راداشت پاڵ بە دوگمەی زەنگەکەوەنێم دەنگی ئیستۆپی ئوتومبێلێك وریای کردمەوە. سەیرێکی دواوەم کرد، رەهام دیت لە ئوتۆمبێلێکی دابەزی و کرێیەکەی دا. هەر دووکمان بە دەم زەردەخەنەوە سەیری یەکترمان کرد. بەدیتنێ رەهای هەناسەیەکی ئاسوودەییەم هەڵکێشا، لەوەش کەلە پێش منەوە نەگەیبێوە ماڵێ خۆشحاڵ بووم.

- سڵاو، ئێوە تەشریفتان بردبووە دەرێ؟

- بەڵێ، منیش هەلەکەم قۆستەوە و سەرێکم لە نووسینگەی گۆڤارەکە دایەوە.

رەها بە دەم دەرکە کردنەوێوە وەڵامی دایەوە:

- کارێکی چاکتان کردووە کاتێ کەلە ماڵ دەچوومە دەرێ و ناچار بووم کە بەتەنێتان لە ماڵێ بەجێ بێڵم زۆر نارەحەت بووم بەڵام ئێستاکە ئێوەش دەرفەتێکتان پەیدا کردووە تا بچنەوە نووسینگەی گۆڤارەکە زۆر ئاسوودە و خۆشحاڵم، نازانی دڵم چۆن هەڵدەچوو بەردەوام دەدڵی خۆمدا دەمگوت ئێستا سپێدە خانم هەر لێ تووڕە بوو ون.

ڕەها خۆی لادا تا بچمەوە ژوورێ، کاتێ کە بەبەردەمیدا تێدەپەڕیم و چوومەوە حەساری دەخەیاڵانەوە چووم:

- بەستەزمانە نازانێ منیش لەو خراپتر بووم.

ڕەبابە خانم لە دەنگی کرانەوە و داخستنەوەی دەرکێ هاتە ناو دەرکەی ماڵێوە و کە هەر دووکیشمانی پێکەوە دیت پرسی:

- ئێوە پێکەوە بوون؟

من و ڕەها پێکەوە لەیەك کاتدا سڵاومان کرد ئەوجا ڕەها گوتی:

- نا، لەبەر دەرکێ تووشی یەکتری بووین.

- ڕەبابە خانم مشەمما بارانیەکەی لە هەردووکمان وەرگرت و گوتی:

- تا ئێوە پشووێکی دەدەن و ماندووتان دەحەسێتەوە منیش شتێکی خواردنەوێتان بۆ ئامادە دەکەم.

سوپاسمان کرد و ڕەبابە خانمیش دوای ئەوەی مشەممایەکانی بە دارێوە کردن بەرەو لای مەتبەخێوە چۆوە. پێش ئەوەی بچێتە ژووری مەتبەخێوە لە ڕەهای پرسی:

- ئەرێ بە ڕاست خاتوون کارەکانتان تەواو کردن؟

ڕەها بە دەم لێکردنەوەی گوڵی سەری وەڵامی دایەوە:

- بەڵێ، بە خۆشییەوە ئەمڕۆکارەکان هەمووی وەك پێویست بە دڵی هەموان بوو و بە پێچەوانەی جارەکانی دی هیچ گیرو گرفتێکم نەهاتە ڕێ.

- خۆ ئەگەر گیروگرفتێکیش هاتبایە پێش هەر هیچ نەبوو بە دڵنیاییەوە بابتان هاریکاری هەر دەکردن و بەهاناتانەوە دەهات.

ڕەها دەستەکانی بردنە ناو قژیەوە و دەحاڵێکیدا کە قژەکانی بەسەر شان و ملاندا بەردەدانەوە گوتی:

- حەزناکەم لە ئەنجامدانی کارەکانمدا داوای یارمەتی لە بابم بکەم، پێم خۆشە بۆ خۆم بەتەنێ کارەکان ئەنجام دەم و ڕایانپەڕێنم.

لەو ویستە توند و تۆڵ و باوەڕ بە خۆبوونە پتەوەی خۆشحاڵ بووم. ئەو ژیانە سەختەی کەپێیدا تێپەڕیبوو ژنێکی پتەو و بە خۆ و بە هێز و توانای لێ دروست کرد بوو.

ڕەبابەخانم لەدوای چەند دەقیقێکان بە سینییەك و دوو پەرداغ ئاوی پرتەقاڵ بەسەرەوە هاتەوە هۆڵێ. هەروا بە دەم دانانێ پەرداغەکانەوە لەسەر مێزەکەی بەردەممانەوە گوتی:

- دڵم دەرچوو، لە سبەینێوە تا ئێستا چاوم بە دەرکێوە خێل بوو.

ڕەها کە پەرداغە ناوە میوەکەی هەڵدەگرت گوتی:

- وەك بڵێی لە وەتەی سپێدە خانم هاتۆتە ئەو ماڵەی مە ئێوە خووتان خراپ بووە، جاران هەر لە بەیانیەوە تا ئێوارێ بە تەنێ لە ماڵێ دەمایتەوە و هەرگیز نارەزایەتییەکیشت نەبوو.

ڕەبابە خانم لەسەر قەنەفەکە بەتەنیشت ڕەهاوە دانیشت و گوتی:

- ئەرێ بە خودای، ئەدی نازانن دەو چەند ڕۆژانەدا چەندم خوو بە ئێوەوە گرتووە.

ڕەها پێکەنی و گوتی:

- کەواتە هەر لە ئێستاوە سپێدە گیان دەبێ بەڵێنمان بداتێ کە واز لە کاروباری گۆڤاری بێنێ و بێت لێرە دەگەڵە مەدا بژیەت.

زەردە خەنەیەکم هاتە سەر لێوان، لەو هەموو لوتف و سۆز و خۆشەویستیەی ئەوان تەریق دەبوومەوە بۆیە گوتم:

- باوەڕتان بێ منیش هەر ئاوا و زیاتریش نۆگری ئێوە بوویمە، بەڵام چبکەم ناتوانم واز لە ئیش و کاری گۆڤارەکەبێنم و دەستبەرداری بم، چونکە ئەگەر بەکاروباری ئەو گۆڤارەشەوە نەبوایە من هەرگیز بە ئێوەی ئازیزان ئاشنا نەدەبووم، بۆیە دوا بەدوای دوزینەوەو پەیداکردنی خۆشەویستانی وەك ئێوە لەو ڕێیەوە هەر درێژە بە ئێش وکارەکانی خۆم دەدەم دەو گۆڤارەیدا.

هەردووکیان بەقسە قوتەکانی من پێکەنین. ڕەبابە خانم لە جێوە قیت بۆوە و گوتی:

- بە یارمەتی خۆتان خێراکەن وەرنە سەرمێزێ نانەکە ساردبۆوە.

ڕەها بەگوتنێ ((بە چاوان)) لەجێوە هەستا، دەستی منیشی گرت و قیتی کردمەوە.

بە دەم چوونە سەر مێزێمانەوە ڕەها گوتی:

- من کوژراو و مردووی فەرمانی ناوام.

ڕەبابەخانم هەروەك جارانی پێشوو بە سەلیقەیەکی تەواوەوە مێزەکەی ڕازاندبۆوە. قاپێکی گەورەی زەڵاتە دەناوەڕاستی مێزەکەیدا چاوی لە ئادەمیزاد دادەگرت. سەبەتەی چووکەڵەی سەوزەواتی پڕ لە تووری ئەلمۆدە ئیشتیای هەموو کەسێکیان دەبزواند.

کۆجیله ماستی بچکۆلانەی پڕ لە ناروێ و نەعنای وشك وکشمیش و گوێز ئـاوی لـە دەم و لەوسان دێنان. ڕەها بە دیتنێ مێزی وا رازاوە دەستی پێکدادان وگوتی:

- من شەیدای سەلیقەی ڕەبابە خانمێم، بەڕاستی کابانێکی تابڵێی لێوە شاوەن.

ڕەبابە خانم کە بەخۆو بە لەمـە برنجێکـی سـپی بەزەعفـەران رازاوە بـەرەو لای مێزەکـەوە دەهات گوتی:

- خاتوون، ئێوە هەمیشە دەگەڵەمندا بەلوتفن، تکا دەکەم لەوەم زیاتر شەرمەزار مەکەن.

ڕەها بەهەڵەداوانەوە کەوتە یارمەتییە ڕەبابە خانمێ، بەلەمە برنجەکەی لێ وەرگرت و لەسەر مێزەکەی دانا و گوتی:

- ئازیزم تۆ بۆخۆت دەزانی کەمن هەرگیز لە خۆوە بەکەسدا هەڵنادەم.

منیش بەلایەنگریە ڕەهایەوە گوتم:

- منیش هەر دەگەڵ ڕەها خـاتوونێم و پێموایـە ئێـوە لـە سـەلیقە و ماڵدارییـەدا وێنـەو هاوتاتان نیە.

ڕەبابە خانم ئەمجارەیان بە قاپێکی قووڵی فـەخفووری پـڕ لـە شـلەی قیمـە سـەوزیەوە لـە مەتبەخێ هاتەوە دەرێ و گوتی:

- وای توخودا هێندەم ناز مەدەنێ دەترسم لە خۆشییان شلەکەم لێ بەربێتەوە.

ڕەها هەروا بە دەم زەردەخەنەیەکی لالێوانەوە گوتی:

- دەی دەی ئەوە چیە هێندە بـە ڕەبابـە خانمێـدا هەڵـدەدەی سـپێدە گیـان! ڕەبابـە خـانم یەکجاریش وانیە نە.

ڕەبابە خانم دەیزانی ڕەها گاڵتەی لەگەڵ دەکا، بە دەم قاقای پێکەنینەوە گوتی:

ئیدی تازە دەبێ خۆت ساغ کەیەوە داخوا لەلایەنگرانی منی یالە نەیاران.

ڕەها کورسییەکی بەرەو لای خۆیەوە ڕاکێشا، لەسەر کورسییەکە دانیشت و گوتی:

- تۆ بۆ خۆت دەزانی من لەتاکە لایەنگرەکانی تۆم، بـەڵام چـبکەم لەترسـێ رژانـی قاپـە شلەکەی نەبێ جارجارە ناچارم بچمە ریزی نەیارانەوە.

ئەم دەمەتەقێیە بووە زەمینـەی سەرکردنە سـەری یـەکتری نێـوان ڕەهـا و ڕەبابـەخانم ئێـوە ڕۆژەمان دە کەشێکی خۆشی و شـادیدا خـوارد. دوای نـان خـواردنێش مـن و ڕەهـا کەوتینـە هاریکارییە ڕەبابە خانمێ لە هەڵوێژاردنێ سەرمێزەکەی و شوشتنێ قاپەکاندا. ڕەبابـە خـانمیش دوای تەواو بوونێ ئیشەکان دوو پیاڵە چای فەریکی بۆ تێکردین و گوتی:

-ئەورِۆ هەر بە یەکجاری شەرمەزارتان کردم، تکا دەکەم بفەرموون تا چایەکانتان سارد نەبوونەتەوە، نۆشی گیانیانکەن.

دوای چا خواردنەوێ، خەو پێڵووی چاوی هەرسێکمانی قورس کرد و چاوی داگرتین هەریەکەمان بە زەحمەت خۆمان گەیاندەوە ژوورەکانمان و کەوتینە خەوێکی نیوەرِۆژەی شیرین و قووڵەوە.

بەچەند لێدانێکی دەرکەی، چاوم هەڵێنان و لەسەرخۆ پرسیم:

- بەڵێ؟

دەنگی رەبابە خانمێ لە پشت دەرکێوە بەرز بۆوە:

- سپێدە خانم، رەها خاتوون چاوەرِوانتانە تا پێکەوە عەسرانێکی بخۆن. هەروا بە دەم باوێشك دانێوە دەرکەی ژوورەکەم کردەوەو گوتم:

- من هەرگیز حەزم لە خواردنی عەسرانە نیە بەیارمەتی ئێوە تا خاتوون شتێکی دەخوا من دەچم ئاوێکی بەخۆم دادەکەم و دێمەوە خزمەت.

رەبابە خانم زەردە خەنەیەکی لەدڵان ئازیز و خۆشی بە روومدا کرد و گوتی:

- چۆنتان حەز لێیە، پەیامەکەتان بە خاتوونێ رادەگەیەنم.

رەبابە خانم بەرەو لای پلیکانەکانەوە چوو تا بچێتە نهۆمی خوارێ منیش بەرەو لای حەمامێوە چووم و دوای سەعاتێك دڵشاد و رووگەش و زیتەڵە لە پلیکانان هاتمە خوارێ.

رەها لە حەسارێ لەبەر تیشکە لاوازە کەم رەنگەکەی رۆژێ لەسەر کورسییەکی دانیشتبوو وشاڵێکی بەسەر قاچەکانیدا دابوو. هەروا کە بەلایەوە دەچووم، دەدڵی خۆمدا ستایشی جوانییەکەیم دەکرد. رەها دەخوێندنەوەیەکی قووڵی کتێبێك راچوو بوو و قژە خۆش رەنگەکەشی بە شێوەیەکی جوان لەسەر تەوقە سەریەوە کۆکردبۆوە و سەدان هێندەی دیشی خستبووە سەر جوانییەکەی. بە بیستنێ دەنگی پێی من سەری بڵندکرد و چاوی لەسەر لاپەرەی کتێبەکەوە هەڵگرت و خستیە سەر من. بەدیتنێ من بەرێ و رەسمی ئەدەبەوە هەستا و سڵاوی کرد. وەڵامی سڵاوەکەیم دایەوە و گوتم:

- هەوایەکی خۆش و دڵفرێنتان بۆ خوێندنەوێ هەڵبژاردووە.

رەها کتێبەکەی پێکەوە نایەوەو گوتی:

- لەبێ وازیان برِیارم دا هێندێکی وەخوێنم.

ئەوجا یەکجاری هەستاو گوتی:

تا زووه بچینەوه ژووریَ، دەترسم سەرمات بیَ. هێشتا سەرتان هەر تەڕە.

پێشنیارەکەیم پەسەندکرد، چونکە قژە تەڕەکەم وای کرد هەست بە سەرمایە بکەم.

هەروا کە دەگەڵ ڕەهایەدا بەرەو لای ژوورێوە دەچووەمەوە ئەو پرسی:

- ئەدی بۆ قژتان وشك نەکردۆتەوە؟

چونکە ((موجەفیفە)) کەمم لە بیر کردبوو بیهێنم شەرمم هاتیَ و دەوەڵامدا گوتم:

- حەزم نەدەکرد ئێوە لە وە زیاتر دەچاوەڕوانیە خۆمدا بهێڵمەوە.

ڕەها دە سەروچاویەوە ڕوانیم و گوتی:

- نیشێکی واگرینگمان نەبوو تا بترسیت دوابکەویَ. واباشترە تا زووە بچی قژت سشوارکەی.

ویستم بیانوویێکی دیکە ببینمەوە کە ڕەها دەست پێشخەری کرد و بانگی ڕەبابە خانمێی کرد و گوتی:

- ڕەبابە خانم، بە یارمەتی خۆت سشوارەکەی من بدەنە سپێدە خانمیَ.

دوای چەند دەقیقێکان کە قژم بە تەواوەتی وشك بۆوە لەتەك ڕەهاوە دانیشتم و داوای لێبووردنم لێ کردەوە کە ئاوام بەجێ هێشتووە. ڕەها هەروەك هەمیشە بە زەردەخەنە جوانەکەیەوە لێوە ناسك و ڕێك و پێکەکەی ڕازاندەوە و گوتی:

- دەگەڵ پیاڵە چایەکی فەریکدا چۆنن؟

- سوپاسی ئەو لوتفەت دەکەم.

ئەوجا ڕەبابە خانم پیاڵەیەك چای بۆ هێنام و منیش سوپاسیم کرد. ئەویش بە تەکمەوە لەسەر قەنەفەکە دانیشت و ڕووی دە ڕەهای کرد و گوتی:

- باشە، دەی منیش ئامادەم گویَ لە پاشماوەی قسەکانتان بگرم

ئەوجا سەرنجە پڕ لە تاسەکانی دە ڕوخساری ڕەهاوە بڕین تا پاشماوەی بەسەرهاتەکە لە زاری ئەوەوە ببیە.

(١٢)

بابم هەرگیز بەو هاوسەرگیریەی رازی نەبوو. جارەهای جار لەسەر ئەو باسە لێمان بووە دەمەقاڵێ و بگرە و بەردە دەگەڵ دایك و بابمدا. بابم هەروا پێی لەسەر بیرو رایەکانی خۆی دادەگرت و نەیدەهێشت ئەو کارە سەربگرێت. جا بۆ ئەوەی لەو ناوە دوورکەومەوە و باشتر بتوانم دەربارەی ژیانی خۆم بریار بدەم، هاتمە سەر ئەوەی ماوەیەك دوور لە ماڵ و کەسوکار بەسەربەرم تا بریارەکانم پتەوتر و سانا و ئاسوودەتربێ.

ئامادەی سەفەرێ بووم و چوومە مەشهەد. پێش رۆیشتنێم بابم و دایکم ئاگادار کردنەوە کە دوای گەرانەوەم دەچمە یەکێك لەو خانوانەی بابە گەورە بە میرات بۆی جێ هێشتووم و لەوێ دادەنیشم.

بۆ ماوەی مانگێکی چووم لە چاکترین ئوتێلەکانی مەشهەدێ دابەزیم و زۆربەی ماوەی رۆژەکانیشم دەگەڵ شیرین و مێردە دڵسۆزەکەیدا بەسەر دەبرد.

ئەو هەموو پرکێشی و پیداگرتنە بەردەوامانەی شیرین و مێردەکەشی نەیانتوانی بمهێننە سەر ئەوەی ئەو ماوەیە لە ماڵێ وان بم و دەگەڵە واندا بژینمەوە. سەرەرای ئەوەش رۆژانە دەگەڵ ئەواندا لە گەرانی ناو شاری یا لە ماڵی ئەوان بووم و شەوانەش دەچوومەوە ئوتێلێ. کچە بچکۆلەکەیان (شادی) بەراستی شادی بۆ بە دیاری هێنابوونە ناو ماڵێ. ومنیش زۆربەی رۆژەکانم دەگەڵ شادیدا بە یادی کورەکەمەوە بەسەر دەبرد.

ئەو سەعاتانەی لە ئوتێلێش بووم هەر بیر و خەیاڵم بەلای پێشنیارەکانی ئاغای کەنعانی و نارەزایەتییە دایك و بابمەوە بوو. ئەوجا دوای بیرکردنەوەیەکی زۆر و دەبەر چاوگرتنی تەواوی لایەنەکانی بریاری شووکردنەوەم بە ئاغای کەنعانی بریاردا.

دوای بەسەرچوونی مانگێك و بیرو خەیاڵ کردنەوە لەم بارەیەوە دڵنیابووم کە دەگەڵ ئاغای کەنعانیدا ژیانێکی شاد و ئاسوودە و ئارامم دەبێت و بەخۆشی دەژیم. خودا خافیزیم لە شیرین

و مێردەکەی کرد و هاتمەوە تارانێ. هەر بە گەیشتنەوەی تارانێم و یەکەمین چاو پێکەوتنێ ماڵەوەمان دوا بڕیاری خۆمم پێ ڕاگەیاندن. بابم ناڕازی بوو و بە نارەزامەندییەوە گوتی:

- باشە ئازیزم، ئاغای کەنعانی لە جێی بابتە، ئەتۆ هیچ بیرت لە جیاوازییە ئەو تەمەنە زۆرەی نێوانتان کردۆتەوە؟ حەزناکەم سەرەڕۆیانە بڕیار بدەی باش بیر لە دوا ڕۆژی ئەم کارە بکەوە.

- ئەوە یەك مانگی رەبەقە بیر لەو مەسەلەی دەکەمەوە پێتانوایە مانگێك ماوەیەکی کەمە؟

- بەڵێ، ئەگەر بیرو بۆچوونی ئێمەت گەرەکە ماوەیەکی کەمە بەرامبەر ماوەیەکی زۆری ژیان، رەها ئازیزەکەم، بەر لەوەی درەنگبێ بەباشی بیر لەلایەنەکانی ئەم کارەبکەرەوە، حەزناکەم جاری دووەمیش دەژیاندا نوشوست بێنی و بکەویەوە.

- دڵنیابن بابە گیان، دەو پێکەوە ژیانەیدا هەرگیز نوشوست ناهێنم و ناکەوم، چونکە بە هەموو حەزو ئارەزووی خۆمەوە ئەم مێردە دەکەمەوە و هەر مێرد کردنێکیش کە بە خۆشەویستی و ئەوین و پەیوەندییەوە بکرێ بەدڵنیاییەوە پاشە ڕۆژی هەرشادی و خۆشی و بەختەوەری دەبێ. لە جێوە هەستام و درێژەم دایە:

من دوایین قسەی خۆمم بۆ ئێوە کرد و حەزیش دەکەم سبەی بەیانی ئێوەش وەڵامی بنەبڕی خۆتانم بدەنەوە، دڵنیاش بن ئەگەر بەو مێردکردنەش نارازیبوون منیش ئەو کارەی ناکەم چونکە من هەمیشە رەزامەندییە ئێوەم لە هەموو شتێکی دی بەلاوە گرینگترە.چوومەوە ژوورەکەم و لەسەر جێیەکەم درێژ بووم. گوێم لە قسەی باب و دایکم بوو بەڵام تێیان نەدەگەیشتم و نەمدەزانی چ دەڵێن.

بەیانی ڕۆژی دوایی بە پێچەوانەی لێکدانەوەی منەوە کە پێموابوو روو بە ڕووی نارەزایەتییە دایك و بابم دەبمەوە هەردووکیان رازی بوون و قبوڵیان کرد و لە ڕێی خاڵمەوە ئاغای کەنعانییان ئاگادار کردەوە کە دەتوانێ بێتە ماڵێ بۆ خوازبێنییە.

ئاغای کەنعانی هەر بەیانی ئەو ڕۆژە بە خۆو بە دەستەگوڵێکی جوانەوە هاتە ماڵێ مە و خوازبێنییەکە ئەنجام درا. ئاغای کەنعانی دوای تەواو کردنێ هەموو گفت و بڕیار و بەڵێنەکان گوتی:

- هێشتا بابەتێك ماوە کە من نەمگوتووە.

ئەوجا رووی دەمن کرد و گوتی:

- ئەویش ئەوەیە کە من ئەو گفتەی بە رەها خاتوونێ دەدەم تا ئەو کاتەی مەهدی لە میردەکەی پێشووی نەستێنمەوە و نەیخەمەوە کۆش و باوەشی، ئەو نەگوازمەوە و هەر دەبێ مەهدی بکەمە دیاریی ئاهەنگی ژن و میردایەتیمان و ژیانی دەگەڵ مەهدیدا بۆ بکەمە نوقلانە.

دەگەڵ ئەوەشدا کە دەمزانی ئەمە کارێکی نەکراوە بەڵام هەر سوپاسم کرد و داوام لە خودای کرد تا پشتیوانی ئەو کارەی بێ.

لە بەیانی ئەو رۆژەوە ئاغای کەنعانی بەردەوام دەچووە لای محەممەدی و قسەی دەگەڵدا دەکرد تا بەلکە ئێ ئەوە خوایە محەممەد رازی کات مەهدیم بداتەوە. بەڵام محەممەد هەر جارەی بە داوای شتێکەوە نا ئومێدی دەکردەوە.

بەڵام ئاغای کەنعانیش لەو پیاوانە نەبوو هەروا بەئاسانی دەست لە داواکاریەکانی هەڵگرێ. هەر رۆژەی لە رۆژەکەی دی زیاتر پێ دادەگرت و بۆ گەیشتنە ئامانجەکەشی هەر جارەی پێشنیارێکی تازەی بۆ محەممەدی دەکرد. محەممەدیش کە سووربوونەکانی ئاغای کەنعانی ئاوا دەدیتن ئەوەندەی دیکە بە رق دادەچوو و رقەکەشی بەمن و ئاغای کەنعانیدا دەرشت و رووی لە پێشنیارەکانی وی وەردەگێرا.

لە یەکێ لە رووبەروو بوونەوەکاندا ئاغای کەنعانی پێشنیار دەکا ئەگەر بە دانەوەی مەهدی رازی بێ ئەوە بەنیشانەی سوپاس و پیزانینێوە داکێ محەممەدی دەنێرێتە حەجی ماڵێ خودای.

بەڵام محەممەد هەر قبوڵ ناکا. لە دیداری ئەو دواییەشدا بە محەممەدی گوتبوو ئەگەر رازی بێ ئەرە حەسارێکی لەسەرووی شاری هەیە بەناوییەوە دەکا بەڵام محەممەد واش هەر قبوڵ ناکا و نایهەوێ و بۆ ئەوەش من زیاتر ئازار بدا پەیام و راسپاردەیەکی بە ئاغای کەنعانیدا بۆ ناردبووم:

- لەزاری منەوە بە رەهای بڵێ، مەگەر محەممەد بمرێ دەنا تا ماوە مەهدی بەلای خۆیەوە نابینێ.

ئاغای کەنعانی کە ئەو قسانەی لێ بیستبوو لێی کەوتبووە پارانەوێ و داوا وتکای لێ کرد بوو کە واز لەو رق و کینەیە بێنێت و بەو کارەی رازی بێ. بەڵام ئەو هەمدیس نەچوو بووە ژێر بار و قبوڵی نەکردبوو. ئاغای کەنعانی کە لەو یەك دەندەییەی محەممەدی وە زاڵە دێ بە محەممەدی دەڵێ:

- من دەزانم کە تۆ ئالوودەی، دەگەڵ ئەوەشدا دەزانم کە قاچاغ فروشیەش دەکەی جا کە ئێستا بەزمانی خۆش نایە ڕەدایە، دڵنیابە لەرێی یاساوە مەهدیتان لێ دەستێنمەوە.

قسەکانی دوایەی ئاغای کەنعانی محەممەدی ئەوەندەی دی توورە دەکات ودەگەڵ ئاغای کەنعانیدا تێکەوە دەگلێن. دەمەقالییەکەیان پەرە دەسێنێت و ئاغای کەنعانی، محەممەدی زۆر بە سەختی بریندار دەکات. هێزی ئاسایش دەگاتێ و دەیانبەنە پۆلیسخانەی و لە بەرووەش کە ئاغای کەنعانی سەرو لووت و دوو پەراسووی چەپی محەممەدی دەشکێنێ بە تاوانبار دادەنرێ و دەیبەنە زیندانێ و شەش مانگی زیندان بۆ دەبڕنەوە.

ئێستا ئەوە سێ مانگە دەزیندانێدایە. سەرەڕای تەواوی ئەو هەوڵ و کۆششانەی من و کەسوکاریشم کەچی هەر نەمانتوانی بەر هەڵدای کەین. ئەوەش لەبەر وەی چونکە محەممەد داواکار و شکایەتکاری تایبەتی و راستەوخۆی ئاغای کەنعانییە و هەر دەبێ محەممەد رازی بێ دەنا هەر دەبێ شەش مانگەکەی تەواوکا.

ڕەها بێدەنگ بوو و هەناسێکی قوڵی هەڵکێشا، ئەوجا سەرنجێکی زۆر دڵسۆزانەی لەمن داو گوتی:

-سپێدە گیان ژیان گەمە و گاڵتە و گەمجەفەی سەیری تێدایە خۆ ئەگەر ئەوانە لە خۆت نەقەومێن و بەسەر خۆت نەیەن هەرگیز لەوانە نیە باوەڕکەی. دوای زیندانییە ئاغای کەنعانیش بۆ تۆڵە سەندنەوێ لە محەممەدی چوومە دادگایە و لەسەر ئالوودەبوونەکەیم شکات لێکرد. هەفتەی دواتر چوومەوە تا بزانم شکایەتەکەم بە چی و بە کوێ گەیوە. چوومە ناو دادسەرایە و لەسەر لاتەختێکی دەچاوەڕوانیەدا دانیشتم تا سەرەم دێ. لە پڕ ئومێد بە رووخسارێکی گرژو ئالۆز و تێك چرژاوەوە لە ژووری دادگایە هاتە دەرێ. هەر دوای کەمێکی تریش لە ئومێدی هاوسەرەکەی هاتە دەرێ و بە پەلە بەلای ئومێددا تێپەڕی و ڕۆیی ئومێدیش بێ ئاگا لە دەورو بەری خۆی لە هۆڵەکە چووە دەرێ. بە دیتنێ وی لەو ئاوە سەرم سوڕمابوو.

دەبیرو خەیاڵەکانی خۆمدا جینگڵ دەدا و گێژم دەخوارد کە بانگیان کردم. لە جێوە هەستام و چوومە ئەو ژوورەی کە چەند دەقیقێك پێش ئێستا ئومێدی لێ هاتبووە دەرێ. دوای ئەنجامدانی کارەکانی خۆم لە دادگای هاتمە دەرێ. تەواوی بیر و هۆشم بەلای ئومێد و هاوسەرەکەیەوە بوو و بە دوای وەڵامی ئەوەیدا وێڵ بووم کە ئەو دووانە چیان دەکرد لێرە و بۆ لە دادگایە بوون. وام بە خەیاڵدا هات:

- لەوانەیە ئومێد و هاوسەرەکەی تووشی کێشەیەك بووبن و کێشەکەش هێندە قووڵ بووبێ و کاریان بە دادگا گەیبێ؟ یان لەوانەشە ئومێد و هاوسەرەکەی لێك... هۆڕینی ئوتـۆمبێلێکی بەخۆی هێنامەوە و دەدنیای ژیانی ئومێدو هاوسەرەکەی هێنامەوە دەرێ. ئەو دەمی زانیم کـە ئەوە کەوتوومەتە ناو هەموو ئـەو ئوتومبێلانـەی دێـن و دەچـن. شـوفێری ئوتومبێلەکـە بـە دەنگێکی نارازییانەوە گوتی:

- ئەوە هۆشتان لە کوێیە خاتوون، ئەگەر بەزەییتان بە لاوەتییە خۆتاندا نایەتەوە هەر نەبێ بە زەیییەکتان بە ژن و منداڵی ئێمەدا بێتەوە و دوای پەڕینەوێ ئاگاتان لە خۆتان بێ.

داوای لێبووردنم لەو شوفێرەی کرد کە تا دەهات تووڕەتر دەبوو و بەڕێی خۆمدا ڕۆیشتم.

کاتێ کە گەیمەوە ماڵێ ئەوەی لە دادگایەم دیبوو هەمووم بۆ دایکم گێڕایـەوە و دایکیـشم بەڵێنی دا بە دوای ئەم ڕووداو و بەسەرهاتە بکەوێت و بۆ ئەمەش لە پوورە فرانك بپرسێ.

دوای هەفتەیەك دایکم لە پوورە فرانکی بیستبوو کە ئومێد و هاوسەرەکەی لەبـەر هەنـدێ هۆی وەك لێك حاڵی نەبوونێ لێك جیابوونەتەوە. ئومێد بۆ خاڵۆژنی گێڕابۆوە کە هاوسەرەکەی خوو و ڕەوشتی زۆر منداڵانەیە و جرپنۆکەیە و ئومێدیش ئەوانەی پێ قبوڵ ناکرێ و ناتوانێ.

بەهەر جۆرێك بووە ئومێدیش لە هاوسەرەکەی جیابۆوە و ئەویش وەك من تامی کـەوتنی یەکەمین ئەزموونی ژیانی ژن و مێردایەتییەی چێشتبوو.

دوای گفتوگۆیەکەی پوورە فرانکێ، پوورە فرانك داوای لە دایکم کردبـوو تـا ڕۆژی هـەینی دەگەڵەواندا بچینە باغی شەمیرات و ڕۆژێکی گەرمی هاوینێ لەو باغـە خـۆش ئـاوو هـەوا و فێنکەی ئەوێ بەسەر بەرین. دایکیشم زۆر بە خۆشیەوە قبوڵی کردبوو.

ڕۆژی هەینی بەیانی زوو هەموو خاو خێزان بەرەو باغی شەمیراناتی ماڵێ پـوورە فرانکـێ کەوتینەڕێ. بابم لە ڕێیە لە دایکمی پرسی:

- فرانك بێجگە لەمە کەسی دیکەی بانگ کردووە؟

پێموانیە چونکە فرانك لەم بارەیەوە هیچی نەگوتووە.

کاتێ کە گەیشـتینە باغی، سالار لە ئوتومبێلێ دابەزی و دەرگا ئاسنەگەورەکەی باغی بـۆ چوونە ژوورێ ئوتومبێلەکە کردەوە. بابم ئوتومبێلەکەی لێخوڕیـە نێوبـاغی و ئـەوجا هـەموو دابەزین. باغەوانی باغی کە بێڵەکەی لەسەر شانی دانا بـوو لێمـان نزیـك کەوتـەوە و زۆر بـە ئەدەبەوە بە خێرهاتنی هەموانی کرد و چاك و چۆنی و ئەحواڵپرسی کرد. بـابم لـە باغـەوانی پرسی:

- مەشەدی، کەس دەباغیدانیە! ئەدی ئاغا رەزا و ئەوانیدی لە کوێن؟

مەشەدی ئیبراهیم دەگەڵ بێڵ لە عەرد دانانێ وەڵامی دایەوە:

- وەڵڵاهی هێشتا کەس نەهاتووە بەڵام ئێستا وردە وردە پەیدا دەبن. بەڵام ئومێد ئاغا ئەوە چەند رۆژێکە تەشریفیان لێرەن.

بەبیستنی ناوی ئومێدی هەموو لەشم وەلەرزەهات. بەبیستنەوەی ناوەکەی عیشقە نووستووە چەند ساڵەکەیم دووبارە دە دڵیدا بڵێسەی سەندەوە وگڕارەی کێشایەوە. ئومێدیش لە باغی بوو و لەوەش چاکتر نەدەبوو. سەر لە نوێ کەوتمەوە سەر حاڵ و باڵی ئەو کچۆڵە و هەرزە و کیژوکاڵانەی تازە دەگەنێ و یەکەمین جاریانە تامی عیشق و دلدارییە دەچێژن و هەر بە بیستنەوەی ناوەکەی دڵم کەوتەوە تەپە تەپێ.

هەر بە چاوگێڕانێکی هەموو کون و کەلەبەرو گۆشەو کەنارێکی باغیم بەدوای ئومیدیدا پشکنی بەڵام سووسەیەکی نەبوو.

دەنگی بابم بە ئاگای هێنامەوە کە لە مەشەدی ئیبراهیمی پرسی:

- ئەدی ئومێد ئاغا کوا؟ دیارنیە.

- ئەوە لەوسەری باغیەوە خەریکی راهێنان و مەشق پێکردنی جوانووە ئەسپێکیە کە چەند رۆژێك لە مەوبەرەوە کڕیویەتی. ئومێد ئاغا ئاگای لە هاتنی ئێوە نیە، هەر ئێستا ئاگاداری دەکەمەوە.

بابم بەرەو ئەو لایەی مەشەدی ئیبراهیم ئاماژەی کردبۆیە سەرنجی دا و گوتی:

- نا پێویست ناکا، دوای داگرتن و سەرو بەرکردنێ شتومەکەکان بۆ خۆمان دەچینە لای.

مەشەدی ئیبراهیم هەروا کە بەلای ئوتومبێلەکەوە دەچوو گوتی:

- ئێوە بچنە لای ئاغا ئومێد، من شتومەکەکان دەبەمە ناو خانووێ.

- سوپاس مەشەدی ئیبراهیم، ئەوە سالاریشە هەر یارمەتیتان دەدات.

سالار بەهەڵەداوانەوە بەدەم مەشەدی ئیبراهیمەوە چوو و ئەوانیدیش دەگەڵ بابمدا بەرەو ئەو لایەوەی کە مەشەدی ئاماژەی بۆ کردبوو چووین. لە ماوەیەکی نەچەندان دوورەوە ئومێدم بەسەرپشتی ئەسپێکی زۆر جوانەوە دیت کە ئەو شان و شکۆیەی سەد ئەوەندەی دیکەی جوانتر کردبوو. هەروەك ساڵانی پێشوو بە دیتنێ ویم دڵ داخورپا و لە دڵەوە ستایشی ئەو جوانیەیم کرد. ئومێد هێندە سەرگەرم و سەرقاڵی سواری و بازدانێ سەر لەمپەران بوو کە تا بە تەواوەتی لێ نزیك نەبووینەوە ئاگای لە هاتنە نێو باغی ئێمە نەبوو.

بەڵام لە پڕ چاوی بەو کۆمەڵەی نێو باغی کەوت و روخساری بە زەردەخەنێکی گەش بۆوە.
گوستاخانە لە ئەسپەکە دابەزی و هەنگاوی خێراو روخساری بەزەردەخەنێکی گەش بۆوە.
گوستاخانە لە ئەسپەکە دابەزی و بەهەنگاوی خێرا و هەراوەوە خۆی گەیاندە مە و بەدەنگێکی بەرزەوە سڵاوی کرد. هەموو پێکەوە وەڵامی سڵاوەکەیمان دایەوە وەك هەموو جاران بە ئەدەبەوە ئەویش چاکوچۆنی دەگەڵ یەکەیەکەی هەمووان کرد و خۆشحاڵی بەدیتنێ مە دەربڕی. ئیدی وەك رۆژانی پێشوو و ساڵانی رابوردوو ئەو کاڵی و کرچی و دەست و پێ سپییایەتیەی جارانی دەهەڵس و کەوتاندا نەمابوو. دەگەڵ ئومێدیدا تاوێك دەباغیدا گەڕاین و بە دەنگی هۆڕینی بەردەوامی بۆ ناوباغی هەموو بەرەو ئەو لایەوە چووین کە ئوتومبێلیان لێ ڕادەگرت.
دەستومستی یەکتر بوون و ماچ وموچی یەکتری، هاتوهاوارێکیان دەباغیدا بەرپا کرد کە ئەو بێدەنگییەی تاوێك بەر لە ئێستای باغی دەگەڵ دەنگی مەل و باڵندەکان تێکەڵ بوو ئێستا بووە رۆژی حەشرێ و جەنگی مەغلوبەی دوو خێزانان.
سالار و منداڵەکانی پوورە فرانکێ کەوتنە گەمان دەباغیدا. راحیلە ومێردەکەشی مەجید کەوتنە پیاسەی دەباغیدا و بابم و ئاغا رەزاش کەوتنە تاوڵەکردنێ. لەبەر ئەوەی کەلەلایەکیەوە دانیشتبووم و سەیری یارییەکەی ئەوانم دەکرد ماندوو بوو بووم کە دەنگی پوورە فرانکێ منی بەلای خۆیدا وریا کردەوە:
- پوورە گیان ئەوە بۆ هەڵناستی و تاوێك دەگەڵ ئومێدیدا پیاسەیەکی دەنێو باغیدا بکەن؟
ئومێد بە بیستنێ قسەی پوورە فرانکێ یەکسەر لەجێوە هەستاو گوتی:
- زۆریشم پێ خۆشە.
ئەوجا چاوی دە روخساریەوە بڕیم و گوتی:
- ئەڵبەتە ئەگەر ئێوە پێتان خۆش بێ.
دەحاڵێکیدا کە هەوڵم دەدا لەرزەی دەنگەکەم کۆنترۆڵ کەم وەڵامم دایەوە:
- ئەگەر نابێتە هۆی نارەحەتیتان...
- ئەڵبەتە ئەوە هیچ کە نارەحەتییەکی نیە، هەر دەشویست سەرێکی لە ئەسپەکەم بدەمەوە! ئێستاش دەگەڵ تۆدا ئەو ئیشە دەکەم.
دەگەڵ ئومێدیدا وە رێ کەوتین ئەوە پوورە فرانك و دایکیشم زۆر بە تاسەوە تێمان دەڕوانن. ماوەیەك هەروا بە بێدەنگی، هەر دووکمان بە تەك یەکەوە هەنگاومان دەنا دەگەڵ ئەوەشدا کە

هەریەکەمان دنیایەك قسەی ناکردنێمان بۆ کردنێ پێ بوو. لە دوایـدا نومێـد بێدەنگییەکـەی شکاند وگوتی:

- سەرەنجام ئیشەکەی تۆ و مێردەکەی پێشووتان بە کوێ گەیی؟ ئەڵبەتە ئەگەر نەبێتە خـۆ تێ هەڵقورتاندن حەز دەکەم بزانم ئێستا خەریکی چین و چدەکەن؟

تا ئێستا بەدوای وەرگرتنەوەی کوڕەکەمەوەم و دوای دووجار ئاشتبوونەوە دەگەڵ محەممەدیدا دواییەکەی هەر لێك جودا بووینەوە. ئەڵبەتە ئەو رۆژەی کە چووبوومە دادگای خانەوادە ئێوە و هاوسەرەکەتانم لە دادگای دیتن.

ئومێد بە سەرسامیەوە لای لێ کردمەوە و پرسی:

- ئێوە ئەو رۆژە لە دادگا بوون؟ ئەدی بۆ من ئاگام لە ئێوە نەبوو؟

- چونکە ئێوە هێندە نارەحەت و غەمگین بوون هیچ ئاگایەکت لە دەوربەری خۆت نەبوو.

- ئەدی ئێوە بۆ بانگتان نەکردین، تابزانم لەوێن؟

- چونکە حەزم نەدەکرد دەوان ساتانەدا نارەحەتتان کەم، هەروەك دەزانی ئـەمنیش ئـەوان ساتانەم تاقیکردوونەوە و چاکم هەست بە حاڵ و باڵتان دەکرد. ئێوە و هاوسەرەکەشتان لێك...

لە درێژەی قسەکانم تەریق بوومەوە، بەڵام ئومێد بە نیشانەی ئەرێ سەرێکی لەقاند و گوتی:

- بەڵێ، هەر ئەوێ رۆژێ من و هاوسەرەکەم بە یەکجاری لەیەکتر جیا بووینەوە. هـەر لـە هەوەڵێوە هاوسەر گیرییەکەمان هەڵەبوو، چونکە لەسەر داوا و سووربوونی چەندین جـارەی بـابم ملم لەبەر ئەو هاوسەرگیریە نا بەدڵەی نا...

ئومێد کەمێك وەستا ئەوجا بەردەوام بۆوە:

- لەوانەیە بپرسی بۆ لەسەر داوا و پێداگرتن و سوور بوونی بابم ژنم هێنا؟

نومێـد هەناسـەیەکی هەلکێـشا، سـەیرێکی ئاسمـانی کـرد و بێـدەنگ بـوو. وەك بڵێـی دەمێشکی خۆیدا بە دوای وشەگەلێکدا بگەڕێ تا ئاسان و ئاسوودەتر قسەکانی پـێ دەربـڕێ. ئەوجا لەسەرخۆ گوتی:

- ئەگەر راستیەکەیت دەوێ من هەمیشە هەر باوەڕم بە یەکەمین عیشق وئەوینی ودڵـداری بووە و هەرواشم. من باوەڕم وایە هەرکچ وکوڕێك کە یەکەمین جار پێکتر ئاشنا دەبن و عاشقی یەکتر دەبن بیاندەن بەیەکتردەنا هەرگیز تامی خۆشی و بەختەوەری ناچێژن.

دوای ئەوەی کەزانیم تۆ شوو (مێرد)ت کردووە بڕیارم دا هەرگیز هەتاماوم ژن نەهێنم. بەڵام بابم گفت و بەڵێنی لە من ئەستاند کە دوای تەواوکردنێ خوێنـدنێم هـەر کـچێکی ئـەوان بـۆم

ببیننەوە و ڕەزامەندییان لەسەربێ و بە گونجاوی بزانن من بیهێنم. چەندین ڕۆژ و مانگانم دڵپەتییە ویستەکانی بابم کرد و ملم هەر نەدا بەڵام لە دواییدا لە قبوڵ کردنێ بەولاوە هیچ چارەیەکی دی نەما. چونکە ناشمەوێ هەرگیز ئازاری دایك و باوکیشم بدەم و دڵیان بێشێنم بۆیە دڵم نەهات لەوەیان زیاتر ئێش وئازار و مەینەتی بدەم. باوکم و دایکم هەردووکیان دەیانزانی چەندەم ئەتۆ خۆشدەوێ و کەزانیشیان تۆ میردت کردووە، ڕاوەستان ومانەوەی منیان بێ سوود و بێ هودە زانی، لەسەر ژنهێنانێم سووربوون و کەوتنە پێداگرتنێ. ناچار قبوڵم کرد بەڵام هەمموو هاوسەرگیریەکی نا بەدڵ هەر لە سەرەتاوە دیارە. من و هاوسەرەکەم لەبەر جیاوازییە خوو و ڕەوشتمان ژیانمان لێکتر تاڵ کردبوو سەرەنجام بە ڕێکەوتن و ڕەزامەندییە هەردوولامان بەیەکجاری لێکتر ترازاین و هەریەکەمان بەلایەکیدا چووین و هەر کەسە و ڕێیەکی تازەی بۆخۆی گرت. ڕەنگە ڕێکەوتەکەش هەر ئەوە بێ کە دوای شکست هێنانێ ژیانتان و تاقیکردنەوەی ناکامی ژیان بتان بینمەوە...

دەمزانی کە ئومێد دەقسەکانیدا مەبەستی داواکردن و هێنانی منە بۆیە قسەکەیم پێ بری و گوتم:

- ئەو ڕۆژەی کەلە ماڵێ پوورە فرانکێ، ئێوە و هاوسەرەکەتانم، بەتەك یەکەوە دیتن، هەرگیز پێموانەبوو کە دەژیانتاندا تووشی گیرو گرفت و ناخۆشییەك دەبن و لە دڵەوەش کە ئێوەم ئاوا بە بەختەوەری و خۆشحاڵیەوە دەدیت یەکجار دڵشاد بووم و بۆ بەردەوامی ئەو خۆشی و بەختەوەرییەتان نزام کرد و پاڕامەوە.

ئومێد مەبەستی بوو قسێکی بکا بەڵام دەرفەتم نەدایە و گوتم:

- زۆر حەزدەکەم ئەسپ سواریەکەتان ببینم، ئەگەر ڕێ بدەن لەبن سێبەرێکی دانیشم و سەیری سوارچاکیە ئێوە بکەم.

ئومێد بەکوڵ هاتبوو و گوتی:

- ئەگەر دەزانن بەو کارەی خۆشحاڵ دەبن و پێتان خۆشە بە چاوان قبووڵمە.

ئەوجا بە هەنگاوی خێراوە لەمن دوورکەوتەوە و خۆی گەیاندەوە ئەسپەکەی و بەسواری بەرەو لای منەوە هاتەوە و گوتی:

- ئەگەر حەز بکەن دەتوانین فێری ئەسپ سواریەشتان کەین.

لەبن دارەکان جێیەکی گونجاوم دیتەوە و پاڵم وە دارێکیەوە دا و گوتم:

- نا، لە ئەسپ سوارییە دەترسم، پێم خۆشە سەیری ئەسپ سوارییە ئێوە بکەم.

نومێد لەسەرەخۆ و بە نەرمی ئەسپەکەی لێخوڕی و منی بە بیرکردنەوەی خۆیەوە بەجێهێشت. سەعاتێك بە تەماشای ئەسپ سوارییە نومێدیەوە دانیشتم تا دواییەکەی ئەو ماندوو بوو و ئەسپەکەی بردەوە تەویلەی و دەرکەکەی داخست و بەرەولای منەوە هاتەوە و گوتی:

- دڵنیام کە زۆر چاك ماندوو بوو ویت ئەگەر حەزدەکەی با هێندیك پیاسەی بە باغیدا بکەین دوایەش دەچینەوە لای ئەوانیدی.

هەروا بەدەم خۆتەکاندنێوە وەڵامم دایەوە:

- ئەگەر هیچ لە گۆڕێ نیە بابچینەوە لای دایکم و بابم زۆر دەمێکە بەجێمان هێشتوون.

نومێد بیرێکی کردەوە و گوتی:

- دەتوانم تکایەکتان لێ بکەم؟

دەحاڵێکیدا کە سەرنجەکانم لێ دەدزینەوە وەڵامم دایەوە:

- ئەڵبەتە فەرموون.

- رێ دەدەی ناوە ناوە هەرچەندە کەم و کورتیش بێ چاوێکم هەر پێت بکەوێ؟

- راستییەکەت دەوێ نازانم چ بڵێم بەڵام...

ئومێد قسەکەی بڕیم و گوتی:

- تکا دەکەم رێ بدە.

- قەیناکا، بەدیتنێت خۆشحاڵ دەبم.

- بەم جۆرە خەیاڵم ئاسوودە بوو، ئەگەر رێش بدەی هێندێك ئاو بدەمە ئەسپەکەم ئەوجا پێکەوە دەچینەوە لای ئەوانیدی.

- دەی ئێوە بە ئەسپەکەتان رابگەن، منیش دەچمەوە لای بابم و ئەوان.

لە نومێدی جیا بوومەوە و بە هەنگاوی خێرا لێی دوورکەوتمەوە، هەروا بە مەیلەو راکردنێکەوە لێم ڕادەکرد. بۆ خۆشم نەمدەزانی بۆ هەڵدێم بەڵام هەستم دەکرد کە دەبێ لێی دوورکەومەوە تا دەرفەتێکی بیرکردنەوە پەیداکەم.

دایکم و پوورە فرانك لەوەی کە بەتەنیا گەڕابوومەوە بەسەیرێکەوە تێیان دەڕوانیم و پوور پرسی:

- رەها گیان ئەدی نومێد کوا؟

خەریکی ئەسپەکەی بوو.

دایکه پرسی:

- ئەدی ئەتۆ بۆچی هاتیەوە؟

- هێندێك ماندوو بووم پێم خۆشبوو بێمەوە.

کاتەکان بەخێرایی و بەپەلە تێدەپەڕین و تا دەهات لە ئێوارە نزیکتر دەبووینەوە. وردە وردە هەر دوو خێزان ئەو کەل و پەل و شتومەکانەی هێنابوویانن کۆیان کردنەوە و خستیاننەوە ناو ئوتۆمبێلەکان. پوورە فرانك بەر لەوەی سواری ئوتومبێلێ بێت لە ئومێدی پرسی:

- دڵنیای کە پێت خۆش نیە دەگەڵ مەدا بێیەوە؟

- نا سوپاس، پێویستیم بە بێدەنگییە ئێرەیە.

دوای خوا حافیزی لە ئومێدی هەموو بە سواری ئوتومبێلێوە لە باغی دەرچووین. بە درێژایی ڕێیە بە ئارامی دەنێو بیرەوەرییەکانی رابوردوودا خولێم دەخوارد. لە رووالەتدا ئارام و لە ناخەوەش دەگریام، بۆ دەبوو ببینم؟ بۆ دەبوو ئومێد ئێستا لە هاوسەرەکەی جیا بێتەوە و ئەوڕۆ باسی عەشقی خۆیم بۆ بکات و نیازەکانیم بۆ دەربڕێ؟ خودایە ئەوە چ بەزمێکە منت تێوە گلاندووە؟ بۆ ئێستا کە تازە خەریکم دەگەڵ ئاغای کەنعانیدا ژیانێکی نوێ پێکەوە نێمەوە هەموو شتەکان تێك چرژان؟ بۆ دەبوو ئاغای کەنعانی بکەوێتە زیندانێوە و هاوسەرگیرییەکەمان دواکەوێت؟ بۆ؟ بۆ؟

دیاربوو ئومێد هیچ ئاگای لە ئاغای کەنعانی نەبوو و هەرگیزیش باوەڕی نەدەکرد کە من بەڵێنی مێردکردنێم بە ئاغای کەنعانی دابێ.

گەیشتینەوە ماڵێ و چونکە هەمووش ماندوو بووین زۆر زوو چووینە ناوجێی و کەوتینە خەوێکی قووڵەوە.

بەیانی زوو لە خەوێ هەستام و بێ ئیختیار کەوتمەوە بیری ئومێد و بەسەرهاتەکانی رۆژی پێشتر. هەر دەنێو جێیدا دەبیرو خەیاڵانرا چووم. دوو بارە عیشق و ئەوینم دەدڵیدا بلێسەی دەسەندەوە، ئومێد هەروەکو جاران ریك و پێك و بەژن و باڵاجوان بوو. ئەو بەژن و باڵابەرزەی کەمنی سەرسام کردبوو. بێ ئیختیار کەوتمە بەراورد کردنێ ئومێد و ئاغای کەنعانی. ئومێدم دەتای تەرازوێکی و ئاغای کەنعانیشم دەتایەکەی دی نا و ئەو لایەی ئومێدیم قورسترهاتە بەرچاوان. لەراستیدا هەرگیز ئومێد و ئاغای کەنعانی پێکتر بەراورد نەدەکران! ئومێد لاوێکی تەڕ وبڕ، جوان وسەرنج ڕاکێش، بەژن و باڵایەکی بەرزی وا کە دڵی هەموو کچێکی بۆ خۆی رادەکێشا بەڵام ئاغای کەنعانی، میهرەبان و قورس و سەنگین و پڕ ئەزموون کە هەمووی لە

ناخۆشی و ناهەمواریـیەکانی ژیانەوە وەسەریەك نابوون وتێیاندا قـاڵ ببـۆوە. پیـاوێکی تـابلێی تەواو و لە کوورە دەرچوو کە دەمتوانی پشتی پێ ببەستم و جێی متمانە و دڵنیاییە ژیانم بێ.

نەمدەزانی دەبێ کامیان هەڵبژێرم، عیشقە کۆنەکەی ئومێدی یا سـۆز وخۆشەویـستیەکەی ئاغای کەنعانی؟

دەنگی دایکم بە ئاگای هێنامەوە:

- ڕەها، ئەوە هەڵناستی؟ ئەوە چێشتەنگاوە.

بەپەلە لەسـەرجێی راستبوومەوە و کەوتمە خۆ گۆڕینـێ. لـە ژووری چـوومە دەرێ. دایکـم لەسـەر قەنەفەی دانیشتبوو و کتێبی دەخوێندەوە. بەچـوونە نـاو هـۆڵێم دایکـم چـاوی لەسـەر کتێبەکە هەڵگرت و پڕ بەچاوی خۆشەویستیەوە تێی ڕوانیم و گوتی:

- قاوەلتیم بۆ داناوی.

سوپاسی دایکمم کردو چوومە مەتبەخێ. دوای قاوەڵتییە هاتمەوە لای دایکم و بەتەکیـەوە لەسـەر قەنەفەکە دانیشتم. دایکم کتێبەکەی وێك نایەوەو لەو لای دانا.

ئەوجا گوتی:

- باشە دەی بۆم بگێڕەوە بزانم، دوێنێ دەگەڵ ئومێدیدا باسی چتان کرد؟

-قسە زۆر بوون بەڵام واچاکترە بەکورتیت بۆ وەگێرم تا وەڕەز نەبن.

دایکم بە تاسەوە دە ڕوخسارمەوە ڕاما و گوتی:

- دەی چاوەڕێم بڵێ، لەوەش دڵنیابە هەرگیز لە قسەکانت وەڕەز نابم.

دوێنێ ئومێد خۆشەویستیەکەی خۆی بۆ درکاندم و ددانی بەبێ ئاگاییە مێردکردنێمدا...

تەواوی هەموو ئەو قسانەی نێوانمان بۆ دایکم گێڕایەوە. دایکم بە داخێکەوە سەرێکی باداو گوتی:

- زۆر بە داخەوەم، نازانم ئەوە چ چارە نووسێکە خوا بۆی بڕیویەوە، چاکم لە بـیرە دایکـم هەموو جارێ دەیگوت، خوا بکا خودا لە جیاتی دەموچاوی جوان، بـەخت وناوچـەوانی جـوان بداتە ئادەمیزادی. ئەوە ئێستا پەی بەقسەکانی ئەو خودالێ خۆشبووەی دەبەم کە چی گوتووە. تۆ و ئومێد تابلێی لـە بـەژن و بـاڵا وجـوانی و ڕێـك و پێکـی و لـەش ولاری جـوان و شـلك وناسکیەدا خوا پێداون، خودای گەورە لە دروستکردنێتاندا ئەو پەڕی سەخاوەتی نواندووە بەڵام بەداخەوە ناوچەوانتان...

فنجانی قاوەکەم هەڵگرت و گوتم:

- دوێنێ ئومێد مەبەستی پێشنیاری شوو پێ کردنێمی هەبوو بەڵام من دەرفەتم نەدایە.

دایکم بەنیگەرانییەوە سەیرێکی کردم و گوتی:

- ئەگەر داوات بکاتەوە دەڵێی چی؟

نازانم دایە، دەبێ باش بیری لێ بکەمەوە.

- نازانم وەڵام نیە، ئەدی ئاغای کەنعانی چی؟ ئەو بەندەی خودایەش لەبەر تۆ و مەهدی کەوتۆتە زیندانێ.

- دەزانم دەزانم دایە! خۆمن نەمگوتووە مێرد دەکەم، گوتم دەبێ دەربارەی ئەم بابەتە چاك بیربکەمەوە و بیرپارێکی راست بدەم.

دایکم بەبێ وازیەوە گوتی:

- چ بڕیارێك؟ دوای ئەوەی گفتت بە ئاغای کەنعانی داوە، خۆ تازە پەشێمان نابیەوە!

خۆ خەلکی گالتەجار و قەشمەریی تۆنین. ڕۆژێکی بلێی باشە مێرد بە ئێوە دەکەم و کەیەکێکی دیش دواتر پەیدابوو پەشێمان ببیەوە و بلێی با بیرێکی لێ بکەمەوە.

لەجێوە هەستام بچمەوە ژوورەکەی خۆم و هەروا بە پێوە گوتم:

- یەکەم خودی ئاغای کەنعانی مەرجی کردووە تا مەهدی وەرنەگرێتەوە من نەهێنێ، دووەمیش نەئومێد داوای شووپێکردنێی لێ کردووم و نەمنیش ئەرێم داوە.

پەنام بردەوە بەر ژووەکەم و لە دواوە دەرکەکەم داخست. لەسەر مۆبیلەی کەناری پەنجەرەکەوە دانیشتم و دەحەسارێمەوە ڕووانی. وەڕەز ببووم، هەقی دایکم بوو من ناهەق بووم کە بیر لە شووکردنەوە بە ئومێدی بکەمەوە، بەڵام دەکرا؟

شەوێ بابم هاتەوە ماڵێ. دایکم بە دزیەوە هەرچی هەبوو و نەبوو هەمووی بۆ گێڕابۆوە. گوێم لەدەنگی بابم بوو کە دەیگوت:

- چەندم گوت نابێ بە پەلە بڕیار بدەی! چەند جارم گوت ئاغای کەنعانی هاو تەمەنی منەو وەك بابی دادەنرێ بەڵام کێ گوێی لێیە، کچەتیو پێیوابوو مێرد قاتیە و براوە و بە دۆزینەوەی ئەو پیاوە بێ دەست و پلە لەترسێ حەلیمێ کەوتە دەمەنجەڵێ، ئێستا دەڵێ چی؟ وای بەحاڵی ئەگەر دەست بە ڕووی ئاغای کەنعانییەوە بنێت و ئابڕوومان بەرێ.

گوێم لە دەنگی دایکیشم بوو کە بە پاڕانەوەوە دەیگوت:

- وس س، ئەوەچتە! خۆ ئەو نەیگوتووە بەنیازە ئەرێ بە ئومێدی بدا، هەر تەنیا مەزەندەی کردووە کە ئومێد ویستوویەتی داوای بکات و هیچی دی.

بابم بەهەمان ئاوازەوە گوتی:

- واباشترەکە هەرگیز داوای نەکاتەوە و خۆ ئەگەر رۆژێکیش داوای کردەوە رەها دەبێ هەموو شتێکی پێ بڵێ کە لە پێشدای گفت و بەڵێن بەیەکێکی دیکە داوە مێردی پێ بکا.

- زۆر باشە، زۆر باشە، ئێستا تۆ بەسەر مێشکی خۆتدا زاڵ بەو هاوار مەکە.

- من کەی هاوارم کردووە؟

بابم بێدەنگ بوو و بێدەنگی تەواوی نێو ماڵێی داگرت. سالاریش دەستی لەگەمان هەڵگرتبوو و بە بێدەنگی لەلایەکیەوە دانیشتبوو. تا ئێستا لەبابەی روونەدابوو ئاوا بیکاتە هات و هاوار و دەنگ و زەنا. من کەمندالی گەورەی ماڵ بووم تا ئێستا بابم ئاوا بە توورەییەوە نەدیبوو.

بەسپایی دەرگای ژوورەکەم داخست و لەسەر جێی لێی راکشام و بە دەنگێکی بەرزەوە کەوتمە گریانێ. بۆ دەبێ هێندە بەدبەخت و چارە رەش بم! بۆ دەبێ هەمیشە رۆژگار هەر لایەنە تفت و تاڵەکەی بەمن نیشان بدا، بۆ دەبێ بەشی من دەژیاندا تەنیا هەر غەمو کەسەر خواردن و هەناسە هەڵکێشان بێ؟

دوو رۆژ دواتر گواستمەوە ئەم خانووە. دایکم و بابم هەردووکیان بەو کارەی نارازی بوون بەڵام ئیدی وەختی ئەوەی هاتبوو کە بۆخۆم بە تەنیا و سەربەخۆ بژیم. لەو رۆژەوەی ئومێدم دیتبۆوە لە دوو رێیانێکی تێمابووم. ئێستا نەمدەزانی دەبێ چبکەم لەلایەکیەوە ئاغای کەنعانی بۆ وەرگرتنەوەی مندالەکەی من کەوتە زیندانێ و خوا هەڵناگرێ بەلاوەی بنێم. و لەلایەکی دیکەشەوە ئومێد پیاوی خەونەکانم ئەو کەسەی کە هەمیشە خۆم دەجلی سپی بووکێنییەدا، دەست لە ناو دەستی ویدا دە دنیای حەز و ئارەزووەکانمدا دەدیت دووبارە هاتبۆوە سەر رێیەم و نیازی داواکاریە منیەتی چۆن دەتوانم چاوی لێ بپۆشم.

دوای یەك هەفتە رەبابە خانم هاتە ماڵەکەم ومنی لەتەنیاییە رزگارکرد و هەروەك دایکێکی دڵسۆز بووە ئاو دەنگی و هاودەمی رۆژانی تەنیاییەم.

محەممەد لەبەر ئەو دەردە سەریانەی کە ئاغای کەنعانی بۆی پێش هینابوو منی لە دیتنی مەهدی ناگزوور کرد و چونکە نەشمویست پەیوەندییەکان لەوەی خراپتربن هیچ نارەزایەتیەکم دەرنەبری و گوێم نەدایە و دەگەڵ رەبابە خانمێدا چووینە وییەللایەکەی ناوچەی شیمالێم.

لەوێم دەگەڵ رەبابە خانمێدا یەك هەفتەی شاد و شەنگوڵ و ئارام بەسەر برد.

کاتێکی چاك بوو بۆ بە خۆداهاتنەوەو کەوتنەوە سەرخۆ و بڕیاردانی کۆتاییم. هەوا خۆش و سازگارەکەی شیمالیٚ تا ئەندازەیەك گیانی وە بەر نامەوەو هێوری و ئارامییەکی خۆشیان پێ بەخشیمەوە.

دوای هاتنەوەم لەشیمال جارێکی دیشم دەرێستۆرانێکیدا چاو بە ئومێدی کەوتەوە. ئومێد دوای یەك زنجیرە پێشەکی گوتی:

- ئێستاش بۆ ئەوەی جارێکی دیکەشتان لەدەست نەدەمەوە هاتوومەتەوە لاتان تا داواتان بکەمەوە. تکا دەکەم لێرە بە دواوە من بەهاوبەش و هاوڕێی ژیانی خۆت بزانەو وای دانیٚ.

دەگەڵ ئەوەشدا کە لە پێشدا خۆم بۆ ئەوکات و ساتانەش ئامادەکردبوو هەمدیس دەگەڵ بیستنیٚ قسەکانی ئومێدی و داوای شوو پێکردنەوێمیدا هەموو لەشم یەکپارچە لەرزی. بە دەستەپاچەییەوە وەڵامم دایەوە:

- ڕاستیەکەی دیتنی ئێوە و داواکارییەکەتان ئەوەندە چاوەڕوان نەکراو بوو کە نازانم چ وەڵامێك بدەمەوە. بەڵام ئەگەر ئێوە ڕیٚ بدەن حەز دەکەم سەرەتا کاری کوڕەکەم یەکسەرە و روون بێتەوە ئەوجا دەربارەی مێردکردنەوە بیرێك دەکەمەوە.

ئومێد کە بەتاسەوە سەیری دەکردم و گوێی بۆ قسەکانم دەگرت، بە ئەدەبانەوە گوتی:

- بەیارمەتی خۆت حیسابێکیش بۆ هاریکاریە من بکەن و دڵنیاش بن هەر کارێکی پێویست بیٚ ئەنجامی دەدەم تا هەرچی زووترە ئەو گرفتەتان نەمێنیٚ.

- چاوم بەردایەوە و بەشەرمێکەوە گوتم:

- پێویست ناکا خۆتان نارەحەت کەن. ئەوەی پێویستە کراوە و ئێوەش لەزۆرشت کە هەیە بیٚ ئاگان کە لە دەرفەتێکی دیدا بە درێژی بۆتان روون دەکەمەوە.

ئومێد پێی داگرت تا هەر شتێکی کە پێم چاکە پێی بڵێم بەڵام چونکە حەزم نەدەکرد ئەو لەدەست خۆم بدەم گوتم:

- تکا دەکەم ڕیٚ بدەن لە دەرفەتێکی دیکەدا و دەکاتێکی گونجاو تردا بۆتان روون کەمەوە.

ئومێد پێی داگرت تا هەرشتێکی کە پێم چاکە پێی بڵێم بەڵام چونکە حەزم نەدەکرد ئەو لە دەست خۆم بدەم گوتم:

- تکا دەکەم ڕیٚ بدەن لە دەرفەتێکی دیکەدا و دەکاتێکی گونجاوتردا بۆتان روون کەمەوە.

ـ قبولّی کرد و بڕیار هاته سەر ئەوەی کەتا هەفتەیەکی دیکـە ئـەوجا بێتـەوەو وەڵام وەرگرێتەوە و دەگەڵ ئەوەشدا وەختی ڕۆینێ جەختی کردەوە کـە دانیـشتنێ دواتـر دەبـێ ئـەو شتانەی بۆ باس بکەم کە نەگوتراون.

* * *

ڕەها بێدەنگ بـوو و سـەری دەنێـو دەسـتەکانی گـرت و دەحاڵێکیـدا کـە سـەری بەهـەر دوولایاندا بادەدا گوتی:

- بەڕاستی نازانم چبکەم؟ دووبارە ژیان گەمەیەکی تاڵی دیکەی بۆ دەبەر چاوگرتوومەوە و لەسەر دوو ڕیانێکی داناوە، بەڕاستی دەو کات و ساتانەدا پێویـستم بە یارمـەتی و پـشتیوانیە هاوبیرێکی هەیە، هەر کاتێ بیر لەو دووانە دەکەمەوە بانگی دەروون وناخی ناوەوەم هاوار دەکا ((ئومێد)) ی لەدەست مەدە، ئێستا کە ژیان دووبارە ئەوی بۆ هێناویەوە لات تۆش ڕێزی ئـەو دەرفەتە بزانە و بەر هەڵدای مەکەوە، دیارە قیسمەت وابووە کە ئاغای کەنعانی خۆی مـەرجی ئەستاندنەوە و هێنانەوەی مەهدی هێناوەتە نـاوەوە تـا تـۆ و ئومێـد پـێکتر بگەنـەوە. بـەڵام لەلایەکیشەوە ئاوەز (ئەقڵ) م تێمەوە دەخوڕێ ئەدی ئاغای کەنعانی چی؟ ئەو هەموو چاکەیەی ئەوت لەبیرچۆوە؟ یانی هەروا بە ئاسانی دەتوانی دڵی وی بشکێنی و ئومێدی هەڵبژێری؟

ئەو کاتەی کە ئاغای کەنعانی لە پێناو جگەرگۆشەکەتدا سەری بە هەموو جێیەکدا دەکـرد و لە هەموو دەرکێکی دەدا تا بۆت وەرگرێتەوە ئومێد لەکوێ بوو؟

ڕەها وەڕەز و بێزار و سەر لێ شێواولە جێوە هەستاو دەستی بەڕاوێچکان کرد. ڕەنگی ڕەش و مات دەهاتە بەرچاو. وەك کەسێك دەچوو هەناسەیان لێ بڕیبێ و خەریك بن بیخنکێنن. خێرا خێـرا، وگـرژ لەبەرخۆیـەوە نارەنـاری دەهـات و هـەنگاوی داویـشتن، بـێ ئیختیـار دەسـتی ڕادەوەشاندن و شتێکی دەگوت. لە جێوە هەستام و بەرەو لایەوە چووم. دەستیم دەنێـو دەسـتی خۆم نا و کەوتمە هێورکردنەوەی.

ڕەها سەیرێکی منی کرد و گوتی:

- ئەگەر ئێوە لەجێی من بانایە کامیانتان هەڵدەبژارد؟

سەیرێکی ڕوخسارە غەماوییەکەیم کرد و وەڵامم دایەوە:

- دەزانم بڕیاردان تا بڵێی سەخت و گرانە و دژوار بەڵام باوەڕکەن هیچ شتێك لەدەستی من و یاهیچ کەسێکی دیکە نایە بەڵکە ئەوە هەڵبژاردنێکە کە هەر دەکەوێتەوە سەرخۆت و دەبێ بۆ خۆت بەتەنیا ئەنجامی دەیت.

داوام لە ڕەهای کرد تاوێك دانیشێ و هێوربێتەوە. ڕەها هەروا کە بەرەو لای قەنەفەکەوە دەچوو گوتی:

- بەیانی دوای نیوەڕۆیە ئومێد دێتەوە لام و ئیدی من دەرفەتی بیرکردنەوەم نیە، دەبێ دەو ماوە کورتەیدا یەکێکیان بۆ تا هەتایە لە خۆم بڕەنجێنم بەڵام کامیان؟

ڕەها دەبیرو خەیاڵانەوە چوو. نووسینەکانم ڕێك خستنەوە و چوومەوە ژوورەکەم و شتومەکەکانم کۆکردنەوە. ئیدی کارێکم لە ماڵێ ڕەهای نەمابوو،تەنیا دەبوو چاوەڕێی تێپەڕبوونی کات و هاتنی ڕۆژانی ئایندەی نەچەندان دووربم تا ڕەها بڕیاری کۆتایی بدات. ئومێد یا ئاغای کەنعانی یەکێك لەو دووانە دەبوو لەژیانی بێنە دەرێ. بەڵام بەڕاستی کامەیان بە دەستی فەرامۆشی دەسپێردرێن و لە بیر دەچنەوە و تەنیا ناو و بیرەوەرییەکانی دەهزر ومێشك و خەیاڵاندا دەمێنێتەوە؟

بۆ ساتە وەختێکیم خۆ لەجێی ڕەهای دانا، بەڕاستی بڕیاردان کارێکی سەخت و گران و دژوار بوو. خودا حافیزیم لە ڕەها و ڕەبابە خانمێ کرد و چوومەوە ماڵە خۆم. دوای چەند ڕۆژێکی دوای هاتنەوێم. تا درەنگانێکی هەروا خەریکی ڕێك خستنەوەی نووسینەکانم بووم، تا بەیانی دوای چوونەوەم بۆ نووسینگەی گۆڤارەکە نووسینەکانم بدەمەوەسەر نووسەر.

بڕیارم دا هەفتەی جارێکی بچمەوە ماڵێ ڕەهای و دەربارەی بڕیارو ڕێکەوت و ئەو ڕووداوانەی ڕوویان دابوو ئاگاداربم.

بەیانی ڕۆژی دوایی چوومە نووسینگەی گۆڤارو نووسینەکانم دانە ئاغای میرزایی و بڕیار لەسەر ئەوە درا تا هەفتەی داهاتووکاری سەرگوزەشتەی ڕەهای بەچاپ بگات و دەست پێ بکا. چەندین ڕۆژبوو لە ڕەهای بێ ئاگا بووم و نەمدەزانی سەرەنجام ئاغای کەنعانی بە هاوبەشی ژیانی هەڵبژاردووە یان ئومێد؟

## (١٣)

ڕۆژی پێنج شەممە کەهات، چوومەوە ماڵێ ڕەهـای و پـاڵم بـە دوگمـەی زەنگەکـەوە نـا، دەرگاکە نیوەکراوە بوو و چونکە خۆم بە بێگانە نەدەزانی دەرگاکەم کردەوە و چوومە حەسارێ. کوڕیژگەکی بچکۆلانە دەحەساریدا خەریکی گاڵتەوگەمە و شەیتانییان بوو. بە منـداڵێکی زۆر ژیکەڵە و جوان و سەرنجڕاکیشم هاتە بەرچاوان. بەوەی کە زۆر بـە ڕەهـای دەچـوو زانـیم ئـەوە مەهدییەکە دوا ڕۆژەکانی هەفتە دێتەوە لای دایکی و وا هاتۆتـەوە. بـەوەی شـاد و خۆشـحاڵ بووم کە ڕەها دوای چەندین هەفتان دوبارە توانیویە منداڵەکەی ببینێتەوە. بەدیتنێ دەموچاو و بەرەچاوە شین بووەوەکەی منداڵەکـە، بـێ ئیختیـار دانیـشتم و دەموچـاوە جوانەکـەیم دەنێـو دەستەکانم گرت دە ڕوخسارە پاك و بێگەردە منداڵانەکەیەوە ڕامام و گوتم:

- سڵاو کاکە بچکۆلە ئەوە ئەو دەموچاوە جوانکیلەت بۆ وای لێ هاتووە؟

مەهدی کە بە دیتنێ من واقی وڕمابوو کەمێك کشایەوە و بەرەو لای ژووریـوەی ڕاکـرد و بانگی کرد:

- ڕەبابە خانم، ڕەبابەخانم، ئەوە ژنێك هاتۆتە حەسارێ.

ڕەبابە خانم بە پەلە لە دەرکێ هاتە دەرێ و هەرکە چاوی پێکەوتم بەمیهرەبانیـەوە سـڵاوی کرد.

هەناسەیەکی خۆشییەی هەڵکێشا و فەرمووی ژوورێی لێ کـردم. چـوومە هـۆڵی میوانـان بەڵام بە پێچەوانەی چاوەڕوانیەمەوە ڕەها لە ماڵێ نەبوو. لە ڕەبابە خانمێم پرسی:

- ئەوە ڕەها خاتوون لە ماڵ نین؟

مەهدی هەروا کە دەستی ڕەبابە خانمێی دەدەستیدا بوو یەکسەرە دوای من گوتی:

- من دایکەم دەوێ، دایکم لە کوێیە؟

ڕەبابە خانم دەستێکی بەسەری مەهدیدا هێناو گوتی:

- دایە زوو دێتەوە ماڵێ، بۆیە دەبێ تا دێتەوە کوڕێکی چاك بی و یاری بەشتەکانت بکەی.

ڕەبابە خان دەستی مەهدی ڕاکێشاو بردیە ژوورەکەی. کۆمەڵێك یاریی منداڵانەی نایە بەر دەستی و گوتی:

- مەهدی گیان، هەر لێرەش دانیشە و یاری بەشتەکانت بکە تا دایکت دێتەوە، باشە ئازیزەکەم؟

مەهدی بەزمانە شیرینەکەیەوە دووبارە گوتی:

- بەڵام من هەر دایکەم دەوێ.

- گوتم کە ئازیزەکەم، دایکت کارێکی بۆ پەیدا بووە ناچار بوو لە ماڵێ بچێتە دەرێ.خۆ ئەگەر دایکت بزانێتەوە ورکێنەوت گرتووە نارەحەت دەبێ و غەمێ دەخوا، خۆ تۆ خۆت حەزناکەی دایە غەم بخوا؟ حەزدەکەی؟ مەهدی بە هەمان ئاوازی شیرینی منداڵانەوە گوتی:

- هەرگیز حەزناکەم دایە غەمبار بێت.

- کەواتە ڕاکە بچۆیاری بەکەل و پەلی یارییەکانت بکە.

مەهدی کەوتە گەمان. ڕەبابە خانم هاتەوە لام و لەسەرخۆ بەشێوەیەك کە مەهدی گوێی لێ نەبێ گوتی:

- نازانم داخوا ئاگاداری شین بوونەوەی دەموچاوی مەهدی هەیت یانە نا؟

بەسەر وەڵامی ئەرێم دایەوە و گوتم:

- بەڵێ، دەگەڵ هاتنە ژوورەوێمدا دەموچاوە شین هەڵگەڕاوەکەی منداڵە سەرنجی ڕاکێشام، بە دیتنێی زۆر نارەحەت بووم.

ڕەبابە خانم لەبن لێوانەوە گوتی:

- ڕەها خاتوونێ بەستەزمان! دەبێ بەدیتنێ ئەو حاڵەی جگەرگۆشەکەی چی بەسەرهاتبێ.

دەحاڵێکدا بەتەماشاکردنێ گەمەی مەهدییەوە دانیشتبووین پرسیم:

- نەتانگوت چوونەتە کوێ؟

ڕەبابە خانم کە چاوە ماندووەکانی بەنمە فرمێسکێکەوە تەڕو داپۆشرابوون بەلایەکی سەرپۆشەکەی سڕیەوە و گوتی:

- ئەورۆ رەھا خاتوون دوای دیتنی دەموچاوە شینەکەی مەهدی خۆی رانەگرت بۆ تێگەیشتنێ ئەوەی چووە ماڵێ برایەکەی محەممەدی و هێشتا نەهاتۆتەوە. زۆرم دڵ پێوەیەتی، نە ناو ونیشانی ماڵێ برایەکەی محەممەدی دەزانم و نەدەشتوانم ئەو منداڵەی بەتەنێ بەجێ بێڵم و کارێکی بکەم.

ئەوە بۆ خۆشتان دەزانن مەهدی بەردەوام هەر دایە دایەیتی.

بەنیگەرانییەوە گوتم:

- هەر نەبایە بابیت ئاگادار کردبایەوە، ئەوە هیچ کە رەها دەگەڵ جەمیلەی دەبێتە دەمەقاڵێیان.

رەبابە خانم کە تازە بەتازە ماڵە بابی رەهای وەبیرهاتبۆوە بە دەستە پاچەییەوە گوتی:

- ئەی وای، وەرە هەر لەسبەینێوە تا ئائێستا لەبیرم نەبووە ئاغای فەرهادی ئاگادارکەم.

رەبابە خانم بە پەلە بەرەو لای تەلەفۆنێوە چوو و ژمارەکەی لێداو دووای چەند دەقیقێکان دەستی بە قسان کرد و بەسەرهاتەکەی بەماڵەبابی رەهای گوت. سەعاتێك چوو بەڵام هەواڵێك نە لە رەها و نەلەماڵە بابی نەبوو. ئەوە مەهدیش هەروا بەردەوام وڕکی دایکیەتی.

وردە وردە بەگریان هات. داوام لە رەبابە خانمێ کرد نامەیەکی بۆ رەهای بەجێ بێڵی و مەهدی بباتەوە ماڵێ بابەگەورەی تا لەوێ, مەهدی کەمتر وڕك بگرێت و کەمتر بگریەت.

خودا حافیزیم لە رەبابە خانمێ کرد و لە ماڵێ رەهای هاتمەدەرێ. رەبابەخانم تا بەر دەرکی حەسارێی بەرێ کردم. پێش جیابوونەوەم لە رەبابەخانمێ داوام لێکرد تا هەرهەواڵێك بوو تەلەفۆنم بۆ بکات و ئاگادارم کاتەوە.

گەیشتمەوە ماڵێ و چەندین سەعاتان لەبن تەلەفۆنێ دەچاوەڕێی هەواڵێکی رەها خاتوونێدا دانیشتم.

بەڵام ئەو رۆژە رەها هەواڵێکی نەبوو. رەبابە خانمیش هەر تەلەفۆنی نەکرد. لە رەها و لەو بەسەرهاتەی لێی روودابوو بێ ئاگا بووم و هەر ئەو بێ ئاگاییەش تا دەهات وردە وردە بێزاری دەکردم. رۆژی دوایی بڕیارم دا دووبارە بچمەوە سەردانێ رەهای. هەینی بەیانییەکەی زوو لە ماڵێ هاتمە دەرێ و چوومەوە ماڵێ رەهای. زەنگی دەرگام لێ داو چاوەڕێ راوەستام بەڵام کەس وەڵامی نەدایەوە. بەخەیاڵی ئەوەوە کە رەها و رەبابە خانم هێشتا هەر نوستوون دووبارە زەنگەکەم لێ دایەوە. ماوەیەك راوەستامەوە بەڵام دیسانەوە هەرکەس دەرکەی نەکردەوە. چەند جارێکانم زەنگەکە لێ دا و لێ دایەوە بەڵام دیسانەوە هەواڵێك هەر نەبوو. ناچار بۆ

وەدەستهێنانی سەرە داوێکی کەوتمە گەرانێ بەنێو سەرتانسەری شاریدا. سەعاتێکی هەروا بێ ئامانج بەشاریدا دەگەڕام، زۆرم حەزدەکرد زووتر مەسەلەکە دەست کەوتایە و بزانییایە لەنێوان رەهاو جەمیلەیدا چ روویداوە و چبووە. دوای گەڕان بەشاریدا دووبارە چوومەوە مالێ رەهای و زەنگم لێدایەوە. هەروەك جارەکانی پێشوو کەس نەهات دەرکەی بکاتەوە ناچار بەرەو مالێ خۆمان بوومەوە.

رۆژی دوایی، دوای ئەنجامدانی ئیش وکارەکانم زووتر لە رۆژەکانی پێشتر لە نووسینگەی گۆڤارێ هاتمە دەرێ و خۆم گەیاندەوە مالێ رەهای. زەنگم لێدا. لەدلەوە دەپاڕامەوە، خودایە هاتبنەوە مالێ. دوای ساتە وەختێکی دەنگی رەبابە خانم بەرز بۆوە کە بەدەنگێکی بەرزەوە پرسی:

- کێیەوە؟ راوەستێ ئەوا هاتم.

رەبابە خانم دەرکەی کردەوە. بەدیتنێم توند بەپشتی دەستی خۆی دادا و گوتی:

- دەك خوا بمکوژێ سپێدە خانم، خۆمن هەر لەبیرم چووە تەلەفۆنێکت بۆ بکەم، دیارە زۆرت چاوەڕێی تەلەفۆنی من کردووە؟

لە دیتنێ روخسارە شەرماویەکەی رەبابە خانمێوەم زۆر زك پێی سووتا. بەمیهرەبانیەوە زەردەخەنەیەکم کرد و بەگەرمیەکەوە سلاوم کرد. دە وەلامی وێدا گوت:

- بەلێ، زۆر چاوەڕێ بووم و کە هەوالێکتان نەبوو، چەندین جاران هاتمەوە ئێرە بەلام کەس هەر لەمالێ نەبوو. نارەحەت مەبن ئیشەکەی من جۆرێکە کە بۆ پەیدا کردنێ هەوالێکی هەر دەبێ دەهاتوچۆیەدا و بە پێوەبم و ئەو هاتوچوونانەش نارەحەتم ناکەن. ئێستا رەها خاتوون لەکوێن؟

خۆهیچی ناخۆشی لێ نەقەوماوە؟

رەبابە خانم خۆی لەبەر دەرکی حەسارێ لادا تا بتوانم بێمەوە ژوورێ. ئەوجا گوتی:

- بفەرموون وەرنە ژوورێ، رەها خاتوون لە مالێن، سوپاس بۆ خوا بۆ خۆیان هیچیان لێ نەقەوماوە بەلام...

رەبابە خانم بێدەنگ بوو و منی بەواقی وڕەوە وبەسەرسامی و بەپەشۆکاوییەوە هێشتەوە سەیرێکی دەموچاویم کرد و پرسیم:

- بەلام چی؟

رەبابە خانم سەیرێکی مالێی کردەوە وگوتی:

- دەتۆ فەرموو وەرنە ژووریٚ، خاتوون بۆ خۆی هەموو شتێکتان بۆ دەگێڕێتەوە، پێموایە ڕووداوەکان لەخۆیەوە ببیسن باشترە.

چوومە حەساریٚ و ڕەبابە خانم دەرگاکەی بەدوای مندااخستەوە. بەرەو لای نێو ماڵێوەچووین و لەپلیکانان وەسەرکەوتین. ڕەبابەخانم بە دەنگێکی بەرزەوە بانگی ڕەهای کرد و گوتی:

- خاتوون، میوانتان هەیە، سپێدە خانم هاتووە.

دوای ساتێك ڕەها بەهەڵەداوانەوە بەرەو پیلمەوە هات و بردمیە هۆڵی میوانان کە زۆری شارەزا بووم. چەند دەقیقێکان هەروا بەچاك و چۆنیەوە رابرد. بە وردیم دەسەرتاپای ڕەهایەوە ڕوانی. ڕەبابە خانم ڕاستی دەکرد، ڕەها بە ڕوواڵەت، ساغ و سەلیم بوو و بچووکترین ڕووشانێکی پێوە نەبوو. ئەدی ئەو باسەی کە ڕەبابە خانم گێڕایەوە و پێی نەگوتم؟

لەبابەت ڕۆژی پێنج شەممەکەوە لە ڕەهام پرسی. ڕەها سەرمای ببوو و بە دەنگێکی نووساوەوە بەدەم زەردەخەنەیەکی ڕەزامەندانەوە،کە لێوە جوانەکانی ئەوەندەی دیش جوانترکردبوو گوتی:

- ئاخریەکەی محەممەد لەکەری شەیتان هاتە خواریٚ و دوای چەندین مانگ لە دووریەی مەهدی، ڕەزامەندی بەیەك گەیشتنەوە و دیتنەوەی دایك و فرزەندێی دا. ڕۆژی پێنج شەممە هەروەك هەفتە رابوردووەکانی دی، بەگومانی ئەوەوە کە محەممەد، مەهدی نانێرێتەوە لام نەچوومە جێی وەرگرتنەوەی جارەکانی دیکەی مەهدی. بەیانییەکەی سەرقاڵی خوێندنەوەی کتێبێکی بووم کە زەنگی دەرکەی لێی دا. دوای چەند ساتێکی ئەوجا مەهدی دەگەڵ ڕەبابە خانمێدا هاتنە هۆڵی میوانان. بەبیستنیٚ دەنگی مەهدی شاد و خۆشحال کتێبەکەم پێکەوەنایەوە و بەرەو پیلیەوە چووم. بە دیتنیٚ دەموچاوە شین هەڵگەڕاوەکەی جگەرگۆشەکەم لەجێی خۆم ڕەق بووم. وام هەست دەکرد بەیەکجاری دنیام بەسەرسەریدا وێران بووە. تەواوی بەدەنم گڕی لیٚ هەڵدەستا. وەك ئەو کەسەم لیٚ هاتبوو کە مەقاڵە ئاگرێکیان بەسەر لەشیداکردبیٚ بیٚ ڕاوەستان مەهدیم دەباوەشیٚ گرت و لەبابەت شین بوونەوەی دەموچاویم لیٚ پرسی.

دەدڵی خۆمدا سوێند خوارد کە دەبیٚ سەبەبکاری ئەو ئیشەی زۆر بەتوندی تەمبیٚ کەم جا هەرکەسێك بیٚ، بابیٚ. هەروا کە چاوەڕیٚ بووم مەهدی بەدەم گریانێوە دەستی بۆ بەگێرانەویٚ

کردم کە جەمیلە لێیداوە و ئەو ژنە دڕندەیە منداڵەکەمی بەو حاڵە گەیاندووە. هۆی لێدانەکەیم لێ پرسی، دەزانی منداڵ بەستەزمانە پاك و بێ گوناهەکەم دە وەڵامدا چی گوت:

ڕەها بێدەنگ بوو. بە ئاشکرا دەنگی دەلەرزی، هەناسێکی دوورو درێژی هەلکێشا و درێژەی دایە:

- مەهدی گوتی، مامۆژنە جەمیلە لەتۆڵەی شکانی پەرداغێکی کە لە دەستم بەربۆوە و شکا زۆر تووڕە بوو و ئاوای لێکردم. هەروا بە دەم لێدانێشمەوە جنێو وقسەی ناخۆشیشی بەتۆ دەگوتن.

ئەو ژنە لە خوا بێ ئاگایە هەر تەنیا لەبەر شکانی پەرداغێکی بێ نرخ ئاوای لەو منداڵە بێگوناهەم کردبوو. حەزدەکەم بلوزەکەی مەهدی هەڵدەیەوە و شینیە سەر لەشی ببینی، هەرچەندە لە دەموچاویڕا دیارە چۆنە. ئیدی ئاگام لە خۆم نەما مەهدیم بە ڕەبابە خانمێ سپارد و بۆ خۆشم بەپەلە لە ماڵێ هاتمە دەرێ. ڕقێکی وا دایگرتبووم حەزم دەکرد بەهەردوو دەستەکانم جەمیلەی بخنکێنم. دەحاڵێکیدا کە جنێوم بە ئەرزو ئاسمانان دەدا گەیمە ماڵێ جەمیلەی. دەستم لەسەر زەنگەکەی دانا و تا دەرگایان نەکردەوە دەستم لەسەر هەڵنەگرت. بەڵێنم بەخۆم دابوو ئەگەر بێت و جەمیلە دەرکەی بکاتەوە مستێکی وای لە دەمی دەم زاری پڕکەم لە خوێن بەڵام بە پێچەوانەوە کوڕەبچکۆلەکەی جەمیلە دەرکەی کردەوە و بە دیتنێ من گوتی:

- سلاو مامۆژن.

بەمیهرەبانیەوە وەڵامی سەلامەکەیم دایەوە وپرسیم:

- ئارمان گیان، دایکت لەماڵەوەیە؟

ئارمان لەوەڵامی مندا چاوێکی لەحەساری کرد و وەڵامی دایەوە:

- بەڵێ، ئێستا بانگی دەکەم.

ویستی بەرەو لای ژوورێوە بچێ و دایکی بانگ کات من نەمهێشت و گوتم:

- قەیناکا ئازیزەکەم. بۆخۆم دەچمە سەروەختی.

جەمیلە هاتە بەردەمی دەرکی ژوورێ و بە بەرزییەکەوە لە ئارمانی پرسی:

- ئارمان ئەوە کێیە لەبەر دەرکێیە؟

ئارمانم واوە هێناو چوومە حەسارێ و دە وەڵامی جەمیلەمدا گوت:

- مـنم، هـاتووم بپرسـم بـۆ لەمەهـدیت داوە؟ ئـەوە بـۆوا دەگـەڵ منداڵەکـەی منـدا دەجووڵییەوە؟

جەمیلە چاوێکی بەسەرتاپامدا خشاند و گوتی:

- جا بەتۆچی لێی دراوە؟ ئەگەر هێندە نارەحەتی دەتوانی بێیەوە سەرماڵ و حـاڵ و ژیـانی خۆت و منداڵەکەت بۆ خۆت بەخێوکەی.

هەنگاوێکم هەڵێنایەوە پێشێ و ڕاست لەبەردەمی جەمیلەی ڕاوەستام و قریشکاندم:

- هاتووم پێت بڵێم ئەمە دوایین جارت بێ دەست لە مەهدی هەڵێنیەوە دەنا...

جەمیلە هێندێك هاتە پێشتر، دەستی دە کەلەکێ نا وگوتی:

- دەناچی؟ کێ دەترسێنی؟ پێتوایە زۆر ترساوم، باپێت بڵێم کە نـەتۆ و نـەهیچ کەسـێکی دیکە ناتوانێ هیچ ناماقووڵیەکی بکا. ئیدی کـەمتر ڕوو لێـرە بکـە و قـۆڵ و بـازووی خـۆت دەرخەو مـنداڵان بترسێنە، پێم باشە بزانی ئەم جارەیـان کـەمی خـواردووە جـارێکی دی زیـاتر نۆشی گیان دەکات و دەیخوا جا بابزانم کێ دەتوانێ قسـان بکا!

دەحاڵێکدا کەلە ڕقان دەنگم دەلەرزی گوتم:

- حەز دەکەم تەنیا هەر جارێکی دی، گوێت لێیە چیم گوت؟ تەنیا یەك جاری دی دەسـتی لێ بەرزکەیتەوە ئەو دەمی دەبینی داخوا دەستت دەشکێنم یانە نا؟

جەمیلە ژارە خەندەیەکی کرد و گوتی:

- وەرە و تووبی خودا هێندەم مەترسێنە گوناهم، لێوم ئاورەی دەردەدا، پێم گـوتی ئەگـەر هێنـدە نارەحـەتی دەهـاتی لەسـەر دەرپێـی خـۆت دادەنیـشتی و دادەسـاکای و دەژیـای و منداڵەکەشت ئاوا لەو ماڵە و ماڵان نە دەبوو. ئەوە چۆنە واهەستی دایکایەتییەت بزووتـووە و وەبیرت هاتۆتەوە؟

بەهەمان ئەو ڕقەوەی کەتا دەهات زیاتر دەبوو قریشکاندمەوە:

- خۆتۆ زەرەرت نەکردووە، ئەوجلانەی کە هەمووهەفتێکی بۆ مەهدییان دەکڕم لەبەر وییان دادەکەنی و دەبەر منداڵەکانی خۆتیان دەکەی، منداڵەکانت ساڵی جارێـك ئوتۆمبیلۆکەیـەکی نایلۆن بەخۆیانەوە نابنن بەڵام ئێستا لە سایەی سەری مەهدییەوە هەموو هـەفتان بـە هـەموو جۆر و بەشێکی یاری منداڵانەی کۆکییە بەنرخەکان یاری دەکەن و بۆ خۆشـت ئـەوە ئامـادەی ڕۆژی سـەد جاران بۆ هەزارتومانی بەقوربان و سـەدەقەی محەمـەدی بیـت کـە مانگانـە کرێـی ئاگادارییە مەهدییە دەتداتێ.

جەمیلە بە دووچاوی زەقی دەرپەڕیوەوە لێم هاتە پێشتر. هێندەم لێ هاتە پێشێ دەموچاوی بـە دەموچـاومەوە نـابوو و هەناسـەی وە دەموچـاوم دەکـەوت لـە ڕقـان سـوور هەلگـەرابوو قریشکاندی:

- کێ بۆ هەزار تومانی سەد جاران بەقوربان و سەدەقەی محەممەدی دەبێ؟ ها بۆخـۆت بـڕۆ دەرێ، لە ماڵێم وە دەرکەوە دەنا بۆ خۆم وەدەرێت دەنێم؟ خێراکە لەماڵەکـەم بـچۆرە دەرێ تـا نەم خنکاندووی.

جەمیلە هێرشی بۆ هێنام تا وەدەرم نێ و لە ماڵە خۆیم دەرکاتە دەرێ. منیش کەهـەر لـە بیانوویێکی دەگەڕام تا دەگەڵی تێوەگلێم دەگەڵی کەوتمە دەمەوەرییە و گەیشتینە لێکدانێ.

لەبەر ئەو هەموو زۆر وستەم و کارە نابەجێیانەی دەگەڵ مەهدیشیداکردبوون دڵـم لێـی پـڕ بوو و خوێنی لێ دەتکا، دەستێکم دە سەر و پرچی ناو بە دەستەکەی دیکەشم تـاهێزم تێـدابوو مستێکم لە دەمی دا. هەروەك پێشتر بڕیارم دابوو بەو کـارەی تۆڵـەی هێنـدێکم لـەو جنێـوو قسەنابەجێ و ناماقولانەی لێ کردەوە کە بە مەهدی دابوون. هەر دووکمان تێك ئالاین و هـەر جێیەکی یەکتریمان وەبەر دەستان هاتبایە تەخسیریمان بەلێدانێی نەدەکرد. جەمیلە هەناسەبڕکێ ببوو و دەحالێکیدا کە دەگریا لە جنێو و قسەی ناشیرین و دزێو و قێزە ونی خـۆی نەدەکـەوت کە بەمنی دەدان، ئەمنیش دەگەڵ هەر جنێو و قسەیەکی ناشیرینی تا دەستم دەیهێنا مستێکم لەسەر و چاو و دەم و شەویلاکان دەدا. لێدانێکی چاکم لێدا. لە هات و هاوار و دەنگە دەنگـی من و جەمیلەی داکێ محەممەدی کەلە ماڵێ وان میوان بوو هاتـە دەرێ. هەرکـە چـاوی بـەمن کەوت دەمی جنێوو قسـەی ناسك و ناماقوولی لێ کردمەوە. دە هەلێکی گونجاو و لە باردا خۆم گەیاندە ئەویش و بەهەرچی هێزی دەست و بازووم هەیـە تـەوقاتێکی وام دە دەم و شـەویلاکان کوتا سەری بەدیواری کەوت. بـەهات و هـاوارەوە لەسـەر عـەردی دانیـشت و سـەری دەنێـو دەستەکانی نا. رووم تێکرد و پێمگوت:

- ئەو تەوقاتەم لە جیاتی ئەو قسەبێ جێ و ڕێیانەت لێدای کە بـەمن و کەسـوکارەکەمت گوتن، هیوادارم هەرگیز لە بیرت نەچێتەوە.

جەمیلە دووبارە پەلاماری دامەوە و هەمـدیس تێـك ئالاینـەوە. لـەو دادو بـڕۆ و هـات و هاوارەی مە دەرو دراوسێ ئاسایشیان ئاگادارکرد. هێزی ئاسـایش هـات و لێکـی کردینـەوە و هەمووی بۆ پۆلیسخانەی بردین. لەوێ هەموو بەسەرهاتەکەم بۆ ئەفسـەری لێکۆڵـەرەوە بـاس کرد. ئەفسـەری ئاسایش بۆ سەلماندن و ڕاست و درۆی قسەکانی من دەستوری دا مەهدی بێننـە

پۆلیسخانەی. مەهدی کەلە مالیّ بابم بوو دەگەلّ بابمدا هێنرایە پۆلیسخانەی و ئەفسەری لێکۆلّەرەوە بە دیتنێ دەموچاوەشین هەلّگەڕاوەکە و لەشە برینداره‌کەی مەهدی لەتاوان سەری بادا و بەهاریکاریە وی شکایەتم لە جەمیلەو محەممەدی کرد. بەلّێنیان لە جەمیلەی وەرگرت کە ئیدی نابێ جارێکی دیکە لە مەهدی داتەوە لەمحەممەدیشیان هەر بەلّێن وەرگرت کە ئەویش نابێ دریغیە لە بەخێوکردنێ و ئاگالیّبوونێ مەهدی بکا ئەگەر وانەکا منداڵەکەی بدەنەوە بەمن. ئێستا محەممەد ناچارە مەهدی بەرێتەوە لای موحتەرەمێ تا بۆخۆی چاوەدێری بکات و بەخێوی کا.

رەها بێدەنگ بوو. بە پێچەوانەی چەند دەقیقەیەك لەمەوپێش رەزامەندو گەش و دلّخۆش دەهاتە بەرچاوان. تۆزێك راوەستا و دووبارە دەستی پێ کردەوە:

- ئەوە لەم رۆوە تازە بناشتی بەسەرهاتەکە دەست پێدەکا یارییەکە لەمەودوا خۆش دەبێ. بەرەو روو بوونەوەی موحتەرەمێ دەگەلّ ئەو باسەیدا خۆشە. زۆر باش دەزانم کە ئەم جارەیان موحتەرەم سەری پێك نەهاتنێ دەگەلّ محەممەدیدا لێك دەدات و هەر بە زوویی ناچاری دەکات مەهدی بۆ من بێنێتەوە.

رەها شاد و شەنگولّ دیاربوو و بەهیوایەکەوە دەدوا. بەوەی دلّخۆش بوو کە هەر بەو زووانە مەهدی لەلای خۆیەتی. لە جێ هەستا و گوتی:

- بەلاّم ئەو مەسەلە و باسەی کە ئێوەی هیناوەتە ئێرە!

بەهەوتیەکەوە دەروخسارە جوان و دلّفرێنەکەی رامام و پرسیم:

- ئەو باسەی کە ئێمەی هێناوەتە ئێرە؟

رەها بەدەنگێکی بەرزەوە پێکەنی و گوتی:

- ئەوە هۆشت لە کوێیە؟ ئەدی ئێوە نەهاتبوون بزانن چ وەلاّمێکی ئومێدیم داوەتەوە؟

لە پڕ هەموو شتێکم وەبیر هاتەوە، لەپەدەستێکم لە نێوچەوانم دا و وەلاّمم دایەوە:

- هەقتانە، هەموو شتێکم بە تەواوی لەبیرچوو بۆوە.

رەها بەرەو لای پەنجەرەکەوە چوو و سەیرێکی ناو حەساریی کرد. دووبارە روخسارە جوانەکەی تێکنایەوە و گرژ بوو و غەم تەواوی سەر و رووی داگرتەوە. هەناسێکی قوولّی هەلّکێشا و گوتی:

- ژیانی من وەك سەرەپەتی گلۆلّە بەنییەکە هەر جارەی سەرێکی دەبینینەوە سەرەکەی دیکەی ون دەبێ.

ڕەها دووبارە لە جێیەکەی خۆی دانیشتەوە و گوتی

- بەیانی ئەو ڕۆژەی کە ئێوە لەلای من ڕۆیشتنەوە لە ڕێستۆرانێکی چاوم بە نومێدی کەوت.

نومێد بۆ نانخواردنی ئێوارەی داوەت کرد بووم. دە ڕێستۆرانێکی جوان و ڕازاوە نانی ئێوارەمان خوارد. دەحاڵێکدا کە نومێد هەر دەربارەی نەخشە و پلان و حەزو ئارەزووەکانی ژیانی ئایندە دەدوا و بێدەنگییەکەی منیشی ئاوا دیت پرسی:

- ناکا بەو قسانەم بێزارم کردبی؟

- نا هەرگیز نا، بە وردی ئاگام لەقسەکانتانە.

- ئێوە زۆر بێدەنگن و بێدەنگییەکەشتان وای کرد واتێبگەم بێزارو ماندوو بوو ون.

- نا، گوتم ئاگام لێتانە.

نومێد دووبارە دەستی بەقسان کردەوە و زۆر بە تاسە و کەفوکوڵەوە دەربارەی ئەو یەکەمین جارەی دەدوا کەمنی تێدا دیبوو:

- وای نازانی چیم لێ هات، دەتۆ بیری لێ بکەوە بەو هەموو ئەوین و خۆشەویستیەوە لە پڕ هەواڵی خوازبێنیتانم بیست. ئیدی هیچ کەس و هیچ شتێك مانای نەما لەلای من.

ئیدی ژیان ئەو جوانیەی جارانی نەما، ئەگەر لەترسی خودا و لەبەر دڵی دایك و بابم نەبایە خۆم دەکوشت، بێ لەڕوودامان نەفرەتم لەبابت دەکرد، چونکە ئەو بە بابی گوتبوو تا ڕەها خوێندنەکەی تەواونەکات ڕێی خوازبێنی وهاتنە پێشێتان نادەم، دڵنیابن نە تەنیا هەر بە ئێوە بەڵکە بەهیچ کەسێك، بەڵام هەر دووای مانگێك، ڕۆژێکیان دایکم هەواڵی دەزگیرانیە ئێوە و مێردی پێشووتانی دامێ...

نومێدلە باردی پلەی ئەوین و خۆشەویستی خۆی دەرحەق بەمن دەدوا و دووبارە ڕۆژە ڕابوردووە تاڵەکانی دەمێشکمدا زیندوو دەکردنەوە. دوای سەعاتێك قسەکردن هاتە سەر ئەسڵی بابەتەکە و گوتی:

- هەروەك چۆن دەبەراییەدا پێمگوتن، ئەوین و خۆشەویستیە من دەرهەق بە ئێوە نی ڕۆژێك و مانگێك و ساڵێك نیە بەڵکە ئی ساڵانێکی لەمەو پێشە و ئیستاش کە ئێمە هەر دووکمان دەژیانی پێشوومان‌دا سەر نەکەوتین و کەوتین، ئەگەر بمانەوێ قەرەبووی ئەو تاڵ و سوێریانەی ڕۆژانی پێشوو پێکەوە بکەینەوە چ دەڵێی، داخوا ڕازیت؟

سەرم بەردایەوە و دەحاڵێکدا کەسەیری فنجانی قاوەکەمم دەکرد وەڵامم دایەوە:

- بەداخەوە هەرگیز ئامادەی ئەمەیان نیم

- بۆ؟ ئەو کەوتنە دەژیاندا دەبێ پلەیك بێ بۆ هەستانەوە و پێشڤە چوون، بۆ ئامادەنین تاڵ و سوێریەکانی ژیانی هاوسەریە پێشووتان لەبیر بەرنەوە؟

- هەرگیز مەسەلەکە ئەمە نیە، بەڵکە لەبەر مەهدیە کەدڵم لێوانلێو دەرد و غەم و کەسەرە.

- من بەڵێنتان دەدەمێ هەرچی لە دەستم بێ بۆ هێنانەوەی مەهدی بۆتان دریغی نەکەم.

- من محەممەد بناسم نەتۆ و نەهیچ کەسێکی دیکە هیچی لەدەست نایە.

- یانی دەتەوێ بڵێی کە...

قسەکەیم بڕی و گوتم

- بەڵێ، تا کاتێ مەهدی بەتەك خۆمەوە نەبینم بیر لە هاوسەرێتی و شوو کردنەوێ ناکەمەوە.

ئومێد ماوەیەك غەم دایگرت بەڵام هەوڵی دا غەمەکەی بشارێتەوە، حەزم نەدەکرد ئەوێك کە هەموو عیشق و ئەوین و د ڵداریم بوو کز و مات و غەمگین ببینم بۆیە گوتم:

- تکا دەکەم دەرکم کەی، تۆ دەتوانی دەگەڵ کچێکی دیکەدا بەختەوەربی بەڵام منێك بە بوونی منداڵێك کە هەرجار تك بەسەر و چاوی شین وپشتە دەستی داغ کراوەوە ببینم چۆن دەتوانم بیرلەژیانی هاوسەرێتی بکەمەوە، تۆ هەرگیز دەگەڵە مندا بەختەوەر نابی، ئێوە هێشتاش هەروا دەزانن من ڕەها شاد و شەنگوڵە دڵخۆشەکەی ساڵانی پێشووم بەڵام بەداخەوە کە ئاگات لەستەم وبێ بەزەییە زەمانەی نیە...

ئومێد قسەکەی پێ بڕیم و گوتی:

- من جگە لە ئێوە بیر لەهیچ کچێکی دیکە ناکەمەوە. من تەلاری حەزەکانم بە ئێوەوە هەڵناوە، بووکی خەونەکانم هەر ئێوەن، کەواتە تا ئەو دەمەی تۆ ڕەزامەندییە بە ژن و مێردایەتیەمان دەدەی بهێڵە باهەر بە خەیاڵی ئێوەوە بژیم. تکات لێ دەکەم ئەوەندەت لەمن چاو نەبێ.

سەیرێکی ڕوخسارە جوان و دڵفرێنەکەیم کرد. بە دوای وەڵامێکیدا دەگەڕام بەڵام چەندەم بیرو خەیاڵ کردنەوە هیچ وەڵامێکم نەدیتەوە. لە جێوە هەستام و گوتم:

- بەیارمەتی خۆتان دەچمەوە ماڵێ. ڕاست نیە ژنە تەڵاقدراوێك وەکو من تا دەرەنگانێك لە دەرێ بمێنێتەوە.

ئومێدیش لە جێوە هەستا و گوتی:

- ئەگەر رێ بدەن بتانگەیەنم.

- زەحمەت مەکێشن، ئێوە نارەحەت ناکەم.

- حەزدەکەم ماڵە تازەکەشتان ببینم و ناو و نیشانەکەشی بزانم، ئەویش ئەگەر بەلاتانەوە گران نەبێت.

ناچار دەگەڵ ئومێدیدا وەرێ کەوتم و ئومێد تا بەر ماڵێی بردمەوە لە ئوتومبێلەکە دابەزیم و گوتم:

- دووبارە دەیڵێمەوە، تکا دەکەم ئەم رۆژانە کە خۆشترین رۆژەکانی ژیانتانە هەروا بە ئاسانی لە دەستی مەدەن و لەبەر من لاوەتیتان بەفیڕۆمەدەن.

- خۆشترین رۆژانی ژیانم ئەو کاتەیە کە دەگەڵ تۆدا ژیانێکی هاوبەش و سەر پێکەوە نێین.

ئومێد ئوتومبێلەکەی لێخوڕی و بە هۆرنێکی کورت خوا حافیزی لێ کردم.

دەحاڵێکیدا کە بە چاوانم بەرێ دەکرد لەبن لێوەوە ورتە ورتێکم کرد:

- بە ئومێدی دیدار، بە هیوای رۆژێکی بێ دەردو غەم و رەنجی هەر دووکمان، ژیانێکی ئارام پێکەوە بنێین. هاتمەوە نێو ماڵێ، لە پڕ بابەتێکم وەبیرهاتەوە و زەردەخەنەیەکم هاتە سەر لێوان.

ئومێد ئەوەی لە بیرچۆوە کە دەبوو دەربارەی بەسەرهاتێکی کە گوتبووم لێیان بێ ئاگای بپرسێتەوە.

بەوەش کە ناچار نەببووم بەسەرهاتەکەی ئاغای کەنعانی بۆ بگێرمەوە خۆشحاڵ بووم، بەڵام ئەی دوایە چی؟ ئاخیریەکەی ئەو کاتە هەر دێت کە دەبێ هەموو شتێکی بۆ روون کەمەوە.

رەها بێدەنگ بوو و سەرنجی دەئوختەکیەوە بڕی. باش دەمزانی بیر لە چی دەکاتەوە:

- دەبێ چ بە ئومێدی بڵێم و چۆناو چۆنیشی پێ بڵێم؟

## (١٤)

ڕۆژەکان بەخێرایی ڕادەبردن. کاری چاپکردنی بەسەرهاتەکەی ڕەهای دەستی پێکردبوو. بەسەرهاتەکەی ڕەهای هەفتەی ڕۆژێکی چاپ دەکرا. وردە وردە تا دەهات تیراژی گۆڤارەکە هەڵدەکشاو هەموو ڕۆژێکیش تەلەفۆنێکی زۆر بۆ گۆڤارەکە دەکراو تەواوی خوێنەدەوارانی بەسەرهاتەکەی ڕەهای حەزیان دەکرد زووتر کۆتایی داستانەکە بزانن. هەروا لافاوی نامە بوو و دەگەیشتە نوسینگەی گۆڤاری و هەمووش هەر داوای ئەوەیان بوو کە داستانەکەی ژیانی ڕەهای بەشێوەی ڕۆژانە بەچاپ بگات و یا ئەگەر ناشتوانری هەر نەبی هەفتانە بەشێکی زیاتری لێ چاپ بکری تا خوێندەوارانی زووتر لەکۆتایی داستانەکەی ژیانی ڕەهای ئاگادار ببنەوە. زۆری نامە و تەلەفۆنەکان ئیشەکەمی لە نووسینگەی گۆڤاری دووبەرابەر کردبوو. لە دڵەوە هیوام دەخواست تا هەرچی زووترە محەممەد سەرپەرشتیە مەهدی بەرەهای بسپێرێتەوە و ڕەهاش دەگەڵ مرۆی خەونەکانیدا ژیانێکی هێمن و ئاسوودە دەست پێ بکاتەوە. بەڵام ئەفسوس کە ڕۆژگار لەوە دڵرەق و داخ لەدڵترە کە ڕوویەکی خۆشی پێشان بدات و ئاورێکی ئۆخەی لێ بداتەوە. هەر دەرفەتێکم بۆ ڕەخسابایە سەرێکم لێ دەدا تا دەربارەی ڕووداوی دی قسان بکەین.

لەیەکێك لەسەردانەکانمدا سەیرم کرد یەکجار زۆر غەمبارە. هۆیەکەیم پرسی ڕەها دە وەڵامدا گوتی:

- چەندین ڕۆژە ئومێد پەلەیەتی تا زووە ژیانی هاوسەریەتەمان پێك بێنین و هەر وەڵامیشی لێم دەوێ.

- تاهێشتا مەسەلەکەی ئاغای کەنعانیت هەر پێ نەگوتووە؟

- نە، دەترسم ئومێد بەبیستنی قسەکانم دوای ئەوەش هەر لێم نەبێتەوە و هەمدیس هەر بێتەوە و لەبیری نەچمەوە.

- ئەدی چدەکەی؟ خۆ هەر دەبێ مەسەلەکەی پێ بڵێی وەنا!؟

- دەزانم کە تائێستا درەنگیش بووە دەبوو زووتر لەو رووداوە و بەسەرهاتانە ئاگادار کردبایەوە بەڵام چبکەم بەدەست خۆم نیە، حەز ناکەم ئەو لەدەست خۆم بدەم. نازانم چی پێ بڵێم؟

رەها بێدەنگ بوو و کەوتە خەیاڵانەوە. وەك بڵێی دەناخی خۆیدا بۆ وەڵامێك بگەرێ. زۆر باشم دەزانی کە ئەو بەراستی دەهەل و مەرجێکی دژواردا پەلە قاژەیەتی.

لەلایەکەوە نەیدەتوانی دەگەڵ دڵی خۆیدا دەستەپاچە بووەستێ و دڵی بخاتە ژێر پێوە و لەلایەکی دیشەوە ئەگەر وەڵامێکی نەرێی ئاغای کەنعانیشی دابایەوە ئەوە دووچاری ئازاری ویژدان دەبوو. زۆرم حەز لێ بوو بەهانایەوەبچم و ئەوەی لە دەستم دەهات ئەنجامم دابایە، بەڵام بەداخەوە، نەمن و نەکەسی دیش هیچمان پێ نەدەکرا. تەماشایەکی روخسارە جوانەکەیم کرد. بەمنداڵێکی دەچوو کە هەر بینا لە پرمەی گریانێ بدا. بریاردانی ئەو تابڵێی سەخت و ناخۆش بوو. دەخەیاڵی خۆمدا هەر بە دوای رێگە چارەیەکەوە بووم بۆی. هەر دەوساتەشدا کە ئەوەم هاتە خەیاڵ کە تووشی چارەنووسێکی ئاوا نەهاتووم ئاسوودەو خۆشحاڵ بووم. شیعرێکم هاتەوە بیر کە بۆ یەکەمجاری یەکتر دیتنێمان رەها بۆی خوێندبووەوە:

ساقی پیاڵەیەك مەیم بدەیە، نەخشەکێشی غەیب

هیچ کەس نازانێ، لەپەردەی رازا، چی دەنەخشێنێ

نەمدەزانی چەرخی چەپگەردی ژیان، بۆ ئەو گەمە سەخت و دژوارەی بۆ وی هەڵبژاردووە؟ بۆ ئەو ژنە جوان و نازدارە نە دەبوو وەك هەموو ژنانی دیکە خاوەن ماڵ و حاڵ و ژیانێکی ئاسوودە و ئارام بێ؟

رەها سەری بڵند کردەوە و پرسی:

- بەلای تۆوە کامیان هەڵبژێرم؟ ئەگەر ئێوە لەجێی من بانایا کامیانتان هەڵ دەبژارد؟

لەپرسیارەکەی رەهای تێکرابووم و گوتم:

- راستیت دەوی هەر ئێستا منیش بیرم لەو مەسەلەیەی دەکردەوە کە کامیان بۆ ژیانی ئایندەتان گونجاوترە؟

بەگوێرەی قسەکانی ئاغای کەنعانی بێ، ئەگەر مێردی بە وی بکەنەوە هەم جگەر گۆشەکەت لای خۆت دەبێ و هەم لە پەنای هاوسەری ئایندەشتاندا دەبنە خاوەن ژیانێکی ئاسوودە وئارام وشیرین و دڵنیا.

کەمێك وەستام، ئاوی نێوزارمم قوتدایەوە و درێژەم دایە:

یاره لەبەر ئەوەش کە ئاغای کەنعانی لەخوا پێدانێ منداڵی بێبەشە و منـداڵی نابـێ دسیام منداڵەکەی ئێوەی وەك جگەر گۆشەی خۆی خۆشدەوێ.

رەها سەرنجە غەماوییەکەی دەمنەوە بڕی و گوتی:

- ئێوە پێتان وایە؟ یانی من لە پەنای ئاغای کەنعانیدا بەختەوەرتر دەبم؟

بەنیشانەی نەرێوە سەرێکم بادا و ئەو هەناسەیەی دەسینگمدا حـەپس کردبـوو بەرمـدا و گوتم:

- نا، دیارە کەمەبەسـتەکەم ئـەوە نـەبوو. هـیچ کـەس دەربـارەی ئاینـدەو رووداوەکـانی ئاگادارنیە و هیچ نازانێ.

لەوانەیە ژیانت دەگەڵ ئومێدیدا کە دەمێکە خۆشتدەوێ بەتام و چێژو شـیرین تـر بـێ وەك دەگەڵ ئاغای کەنعانیدا. من تەنیا هەر وەك بۆ چوونێك قسەکەم کرد دەنا دوابڕیـاری خۆتـە. بەهەرحاڵ ئێوە لە کۆتاییدا هەر دەبێ چاو لە یەکێکیان بپۆشن جا یا دەبێ پێ لـە حـەزەکانی دڵت بنێی و یا چاو لەویژدانتان بپۆشن. بـەڵام واباشـترە جـارێ هـەموو لایەنـەکان لـە پـێش چاوبگرن، ئەوجا وەڵام بدەنەوە.

رەها هەناسێکی هەڵکێشا، ئەو موانەی هاتبوونەوە سەر نێوچـاوانی بەدەسـت لای دان و گوتی:

- هەروەك لەسەرەتاوە بۆم باس کردن دایکم و بابم بەهاوسەریەتیە من و ئاغـای کـەنعانی نارازی بوون چونکە بابم پێیوابوو خەڵکی پاشەملە قسان دەکەن و دەڵێن، کە ئەوانە کچەکەیان پێ بەخێو نەکرا بۆیە داویانەتە پیاوێك بەبابی دەشێ بەڵام لەلایەکی دیشەوە لەبەر ئەوەی گفت و بەڵێنیان دەگەڵ خۆیاندا کردووە کە ئیدی هەرگیز دەست نەخەنە ناو ژیانی منداڵەکانیانەوە و بڕیاریان بۆ نەدەن و قسەیان دەقساندا نەکەن ئاغای کـەنعانی هاتـە خوازبێنیـەم. مەسـەلەکە ئەوەیە کەمن ناتوانم لەبەر خاتری گەیشتنم بە ئومێدی چاو لەو هەموو ماندوو بـوون و لـەخۆ بوردەییەی ئەو مرۆڤە پاك و پیرۆزە بپۆشم، دەشترسم، ئەگەر مێـردیش بـە ئاغـای کـەنعانی بکەم چاوم هەر لە دووی ئومێدی بێت و نەتوانم وەك پێویست کەشایانی ئاغـای کـەنعانی بـێ هاوسەرێکی باش و بە ئەمەك بم و ئەو کوخە گەرموگوڕە پڕ خۆشی و شادییەی بـۆ بڕەخـسێنم کە چاوەڕێیەتی.

رەها بەپانی و بەدرێژیە ژوورەکەیدا کەوتە راوێـچکان. بـە هاتوچـوونێیدا دەتزانـی چـەند پەشۆکاو و ئاڵۆزە داوام لێ کرد تا دەگەڵە خۆیدا راستگۆبێت و هەر کامێکیانی بۆ ژیانی خۆی

و منداڵەکەی بەلاوە پەسەندترە ئەویان هەڵبژێرێ. رەها بەرامبەرم دانیشت و راست چاوی دەچاویەوە بڕیم و گوتی:

- راستیەکەی ئومێدیش هەر پێی گوتووم ئەگەر مێردی پێ بکەم بەهەر جۆرێکی بووە مەهدی دێنێتەوە. دوای ئەوەی کە لەوکارەی تەواو بوو هەر چەندێکی پارە تێ بچێ هەوڵبدا ناسنامەی بەناوی خۆی وبنەماڵەی خۆیەوە بۆ دەربێنێتەوە و یەکجاری بیخاتە سەر خۆی. بەڵام دەترسم ئەگەر مێرد بە ئومێدی بکەمەوەو لەویشم منداڵێك ببێ. دیارە لەبەر ئەوەی نا کەلە منداڵبوونێ دەترسم، بەڵکە لەوەی دەترسم ئەودەمی ئومێد دەگەڵ بوونێ مەهدیدا هەڵنەکا و لاو نیو ببێتە هۆی ئێش و ئازارو دەرد ورەنجی مەهدی. هەر ئەوەشە کەمنی ئاوا تووشی دڵەڕاوکێ و دوو دڵی کردووە. ترسی ئایندە، ترسی نامیهرەبانیە ئومێدی بەرامبەر بە مەهدی، ترسی ئەوەی کە بەدەستی خۆم ببمە مایەی ئازارو ئێش و نارەحەتی گیانی مەهدی. ئەوانەن کەمنیان شێواندووە و دەنا یەك ساتەوەختیش رانەدەوەستام و ئەرێم بە ئومێدی دەدا.

هەروەك چۆن ئێوە گوتتان ئەگەر درۆدەگەڵ خۆمدا نەکەم و و دوای دڵی خۆم کەوم ئەوە راست ئومێدی هەڵدەبژێرم بەڵام کاتێك بە ئەقڵەوە سەیری مەسەلەکە دەکەم گیروگرفتێکی زۆر دەو مەسەلەیدا دەبینم.

لە رەهام پرسی:

- ئاغای کەنعانی چەند مانگی دیکەی زیندانی ماوە؟

رەها بیرێکی کردەوە و گوتی:

- نزیکەی مانگێکی دی. من دەبێ دەوماوە کەمەیدا بڕیاری خۆم بدەم و وەڵامی گونجاو بدۆزمەوە.

هەرچەندەم بیر دەکردەوە دەگەڵ تەواوی ئەو قسانەی کردیشمن بە...

زەنگی تەلەفۆنێ لێی دا و قسەکەی بەرەهای بڕی. رەبابە خانم گوشیەکەی هەڵگرت و دوای چەند کورتە قسێکان بانگی رەهای کرد و گوتی:

- خاتوون، دایکتان دەیەوێ قسەتان دەگەڵ بکات.

رەها هەستاو بەداوای لێبووردنەوە بەرەو لای تەلەفۆنەکەوە چوو. منیش خودا حافیزیم لەو کردو لەماڵ وەدەرکەوتم. هێشتاچەند هەنگاوێك دوور نەکەوتبوومەوە کە ئوتومبێلێکی شیك و مۆدیل بەرز لەبەر دەرگای ماڵێ رەهای راوەستا. و پیاوێکی سەرنج ڕاکێش و رێك و پێکی باڵا بەرز لە ئوتومبێلەکە دابەزی و زەنگی دەرگای لێ دا. بەگوێرەی ئەو روونکردنەوانەی کە رەها

دەربارەی ئومێدی دابووی بە ئاسانی ناسیمەوە و تێگەیشتم کە بۆ بڕیاردانی ڕەهای تا ئەو ئەندازەیە سەخت و گران و دژوارە. دەمزانی ئومێد بۆ قسە دەگەڵ کردنی ڕەها و سەرنج ڕاکێشانی وی هاتۆتە ئەوێ تا هەر نەبێ بتوانێ هۆی ئەم خۆدزینەوە و وەڵام نەدانانەوەی بزانێ.

بەوەی کەلەماڵێ ڕەهای هاتبوومە دەرێ پەشێمان بووم. زۆرم حەز دەکرد بگەڕێمەوە و ئاگام لە قسەکانی ئەو دوو ئەویندارە دڵبراوانە بایە کە دەستی زۆرداریە زەمانەی کردبوونیە گاڵتەجاڕی خۆی. کەمێك وەستام دوو دڵ بووم داخوا بگەڕێمەوە یا هەروا بەتەنیا وازیان لێ بێنم تا بەدڵی خۆیان چیان دەدڵێدایە پێکتری بڵێن و بڕیاری ئایندەی خۆیان بدەن و بگەنە سەرەنجامێکی باش.

گەڕانەوەم بۆ ماڵێ ڕەهای بە ناجوان زانی. هەر بۆیەش ملی ڕێی خۆمم گرت. ئەوە بیرو هۆشیشم هەروا لە دەوروبەری ماڵێ ڕەهاش دەخولێتەوە.

بڕیارم دا بەیانی بچمەوە ماڵێ ڕەهای و دەربارەی دیتنێ ئەوڕۆی ئومێدی و ئەو وەڵامەی داویەتەوە بدوێم. تەواو ئەو سات و کاتانەی ئەو ڕۆژەی هەر بیرم لە ڕەهای کردەوە. نەمزانی لە دوایە چی کردۆتەوە؟ ئایا وەڵامێکی گونجاوی خواستەکانی داوەتەوە یا ئەوەتا خۆی لە وەڵامدانەوەکان لاداوەتەوە و خۆی لێ دزیونەتەوە؟

بەیانی ڕۆژی دواتر چوومەوە نووسینگەی گۆڤارەکەو مژوولی ئیشێ بووم. کات و ساتەکان بەسستی تێدەپەڕین و بێزاریان دەکردم و تا گەییە ئەوەی میلی سەعاتێ وەخۆ کەوتن و تەکانێکیان وەبەر خۆدا.

بەهاتنی کاتی سەردانێ ڕەهای خۆشحاڵ بووم شتومەکەکانم کۆکردنەوە. خۆم بۆ چوونەوە ماڵێ ڕەهای ئامادە دەکرد کە بەڕێوەبەری گۆڤارێ بە دوایدا ناردمە لای خۆی.

- بەیارمەتی خۆتان بەزووترین کات خۆتان بگەیەننە دادگای ژمارە... و دەربارەی مەسەلەکە پەروەندەی ڕاپۆرتێك ئامادەبکەن.

بەڵام ئاغای میرزایی، ئێوە بۆ خۆتان دەزانن من سەر قاڵی تەواوکردنی داستانەکەی ڕەهام...

- بەڵێ دەزانم بەڵام تا ئێستا جگە لە ئێوە کەسێکی دی نیە تا بەو پەروەندەیە ڕابگات و ڕاپۆرتێك ئامادەبکات، هەروەك چۆن خۆشتان دەزانن گۆڤارەکە ئیشی هەر تەنیا چاپ و

بڵاوکردنەوەی داستانی ئەو خاتوونەی نیەو هەر تەنیا بەچاپکردنی ئەو داستانەش لاپەرەکانی گۆڤارەکە پڕ نابێتەوە.

بەناچاری قبوڵم کرد هەرچەندە لە ئاغای میرزاییش بەداخ بووم بەڵام ناچاربووم بەزووترین کات ئەو راپۆرتە هەر ئەنجامدەم و ئامادەی کەم.

چوومە هۆڵێ قەڵەباڵغ و پڕ ژاوە ژاوی دادگاوە. هێشتا دادگا دەستی پێ نەکردبوو. شکایەتی ئەو پیاوە لەژنی دووەمی کەزرەکەی ئازارو ئەشکەنجە دابوو خەڵکێکی زۆری راکێشابووە دادگایە.

لە پڕ هەموو لەشم لەرزی، ئاکا شکایەتی محەممەدبێ لەموحتەرەمێ؟ ئاکا موحتەرەم مەهدی بێ دەرەتانی ئازارو ئەشکەنجەدابێ؟

دەنێو هەموو ئامادەبوواندا بەدوای شکایەتکەرەکەیدا دەگەڕام تا لە دەرفەتێکی گونجاودا چاوپێکەوتنێکی دەگەڵدابکەم کەلە پڕ چاوم بەمنداڵێکی سەر پێچراوەی خوردە ساڵ کەوت کە دەباوەشی پیاوێکیدا گرمۆڵە بوو. چەند هەوڵم دا دەموچاوی منداڵەکەی ببینم بەڵام هەر نەمتوانی. سەیرێکی دەموچاوی پیاوەکەم کرد، بەڵام تا ئەو حەلە محەممەدم نەدیبوو نەمدەتوانی بیناسم. دەمویست لەجێی پەیامنێرانەوە بپەڕمەوەو خۆم بگەیەنمە ئەوان کە بەراگەیاندنی دەست پێکردنی دادگا ناچار بووم لەجێیەکەی خۆم دانیشمەوە. کاتێ کە قازی ناوی ئەو پیاوەی راگەیاند هەناسێکم هاتەوە بەرێ، چونکە هەموو شتەکانی دەگەڵ محەممەدیدا بەتەواوەتی جودا بوو.

چەند سەعاتێکان پیاوەکە دەربارەی رەفتارە ناشایستەکانی ژنی دووەمێی بەرامبەر منداڵەکەی ژنی پێشووی قسەکرد و داوای تەڵاقدانێ ژنەکەی کرد. دادگا چەند سەعاتێکانی درێژە کێشا ودەگەڵ زۆر لەسەر رۆیشتنێ قازیش سەرەنجامی دادگا بەفەرمانی لێک جودابوونەوەی ئەو دوانە کۆتایی هات.

دانیشتنێ دادگای تەواو بوو. لەدادگا هاتمە دەرێ. هێندە بەقسەکانی ئەو پیاوەیەوە نیگەران بووم کەوازو و حەوسەڵەی هیچ ئیشێکیم نەبوو. بەرەو ماڵ کەوتمەوە رێ. بە دەم رێوە دەخەیاڵی خۆمدا گوتم کە بۆچی هێندێ کەس ئاوا دڕندە ئاسان کە دەتوانن دەگەڵ منداڵێکی ئاوا خوردە ساڵ و بێ پەنا بەم جۆرە رەفتاربکەن.

بۆ هێندێك ئادەمیزاد تەنیا هەر ناویان ئادەمیزادە دەنا خوویان هەمووی هەر خووی دڕندەو گەزەندانە؟هێندە لەم بارەوە دەبیرو خەیالان راچوو بووم کاتێ کە بەخۆ هاتمەوە، دەموچاوم

شەلاڵی فرمێسکان بوو بوو.هەر کاتێکی کە دەموچاوی ئەو منداڵەم دێنایەوە بەرچاوی خۆم کە بەو تەمەنە کورت و کەمەیەوە ئەو هەموو ئازارو ئەشکەنجەی بەدەست زرداکێوە چەشتووە دڵم دەلەرزی و فرمێسکم بەلووزەو دەهاتنە خوارێ. بۆ ماوەیەکی کەمم رەها وەبیرهاتەوە، زانیم کە ئەویش کاتێ کەمەهدی داد و برۆی بوولە دەست ئازارو ئەشکەنجەی جەمیلەی چی لێ دەهات. یاکە مەهدی بەسەرو چاوی شین هەڵگەڕاوەوە دەبینی چۆن هەموو لەشی دەلەرزی و دڵی ژانی تێ دەزا.

حەزم دەکرد یەك بەخۆم هاوارکەم و بەتەواوی ژن و پیاوانی دنیایە بڵێم:

- تکاتان لێ دەکەم کەمێك بیر لە ئایندەو دوارۆژی منداڵەکانتان بکەنەوە، بۆ رزگارکردن و دەربازبوونێ خۆتان لەناهەمواری و ناخۆشییەکانی ژیان، ئەو گوڵ غونچە نەپشکوتووە ناسکانە مەدەنە دەست رەشەبا و زریانی توند و تیژی زەمانە و بەلێواری هەڵدێر و خەرەندی لەناو چوونیان مەسپێرن.

- رۆژەکانی دیش هەر دەرفەت نەبوو رەهای ببینم و سەردانی بکەمەوە. هەروا لەو و لەو وەلامەی کە بە ئومێدی دابۆوە بێ ئاگا بووم.

دوای یەك هەفتە ئیشی بەردەوام و بێ وەستان چوومە لای رەهایە. رەها بە دیتنێمەوە شاگەشکە بوو و بەگەرمی بەپیلمەوە هات.

لەدوا رۆژەکانی کۆتایی ساڵدا بووین هەوای سازگار و خۆشی دوایین رۆژەکانی مانگی ئەسفەندێ وای لێکردین تا لەبەر بەرۆچکەی دانیشین و بکەوینەوە قسان.

رەها خۆی دەشاڵێکی خوری رەنگ زەیتونیەوە پێچابوو کە ئەوەندەی دیشی جوانتر کردبوو. ئەو پانتۆڵە جینە سپی و ئەوبلووزە سپییەی کەلەبەریشی کردبوو، کردبوویانەوە کیژوکاڵێکی وەك کچۆڵە تازە پێگەیشتووەکان و شاد و خۆشحاڵ دەهاتە بەرچاو و هەروەك منداڵانیشی باسی خۆشییە هەوای دەکرد. رەها رووی دەمن کرد و گوتی:

- ئەتۆ ئاگات لێیە کەمن هەر لە منداڵیەوە شەیدای بەهار و جوانیەکانی بوو وم بەجۆرێکی وا کە دایکم جارەهای جار گوتوویەتی دەبا ناوم بنێن بەهار. بەهەر حاڵ ئەم ساڵیش بەهار هەروەك هەشت، نۆ ساڵ لەمەو پێش دووبارە بەجوانی وشکۆمەندییەوە دەبینم. چونکە دەگەڵ ئاوازی ئاشقانەی مەل و باڵندان، پشکوتنی غونچەی نوێ و تازە چرۆ کردوودا تیشکی هیوام دەدڵیدا دەدرەشێ رەها تابلێی بەو پەڕی شادی و خۆشییەوە قسەی دەکرد و منیشی وە هەڵەکەسەما هێنابوو لە رەهام پرسی:

- دواجار کەلە تۆجیابوومەوە ئاغایەکی جحێڵ زەنگی ماڵێ وەی لێدا کەپێموابێ هەردەبێ ئومێد بووبێ، ویستم بزانم مەزەندەکەم راستبووە یانە نا؟

رەها هەروا کە زەردەخەنەیەکی جوانی بەلێوانەوە بوو گوتی:

- بەڵێ، ئومێد بوو و ئای کە بەرۆیشتنێت نارەحەت بووم. حەزم دەکرد ئێوەش ئومێدتان دیبایە بەڵام ئێستاش کە ئەوتان دیوەو ناسیویشتانە زۆرخۆشحاڵم. رەها تاوێك بێدەنگ بوو و ئەوجا پرسی:

- هەلبژاردنەکەم چۆنە ئایا ئێوەش وەك من بە پیاوێکی لێوەشاوەتان هاتە بەرچاو؟

هێندێکم خۆ هێناو برد و گوتم:

- بەڵێ، منیش هەروەتر پێم خۆش بوو گەڕابامەوە و ئاگام لە گفتوگۆکانتان بایە. بەڵام وام بەباشتر زانی نارەحەتتان نەکەم چونکە دەمزانی کە ئێوە هەر بۆم باس دەکەنەوە.

رەها هەروا کەفنجانی قاوەکەی بەدەستەوە بوو چێژی لە هەڵمی گەرمی فنجانە قاوەکەی دەستی وەردەگرت گوتی:

- هەر دوای رۆیشتنی ئێوە دوای چەند دەقیقەیەك زەنگی ماڵێ لێی دا. من وامزانی کە ئێوەن و شتێکتان لێ بەجێماوە داوام لە رەبابە خانمێ کرد تا دەرگاکە بکاتەوە.

بەحەپەساوییەکی تەواوەوە ئومێدم دیت کە دەگەڵ رەبابە خانمێدا هاتنە هۆڵی میوانان. ئومێد هەروەك جاران دوای پێشەکییەکی دوور و درێژ مەبەستی هاتنەکەی بۆ ماڵێم روون کردەوە و داوای وەڵامێکی ڕاست و رەوانی لێ کردم. هێندێکم منە من کرد وئاخیرەکەی بڕیارم دا مەسەلەکەی ئاغای کەنعانی پێ بڵێم.

ئومێد سەرەتا لە قسەکانم تێکڕابوو بەڵام هێندە بە ئەدەب و لەسەرخۆو هێمن بوو کە گوێی بۆ هەموو قسەکانم بەوردی و بە حەوسەڵەیەکی تەواوەوە راگرت. کاتێ کە قسەکانم تەواو بوو و ئەو هۆیانەشم خستە بەردەمی کە دەبنە مایەی دەردە سەری و ناخۆشی بۆی زەردێکی هاتێ و گوتی:

- بەوەی یەکجار زۆر خۆشحاڵم کە ڕاستگۆییانە هەموو راستییەکانت بۆ گێڕامەوە. بەڵام دەبێ ئەوەیان هەر بڵێم کە ترسان لەپشت گوێ خستن و وەلاوە نانێ کوڕەکەتان بێ جێیە، چونکە منیش ئەو مەرجانەی ئاغای کەنعانیم هەبووە بەڵام کەلەسەرەتاوە دەنگم نەکردووە و پێم نەگوتوون شەرمەزارم. هۆی سەرەکی جیابوونەوەی من و هاوسەرەکەشم هەر بەهۆی منداڵ

نەبوونێ منەوە بوو، منیش هەروەك ئاغای کەنعانی لـە بەخـشش ونیعمـەتی باوکایـەتی بـێ بەشم.

ئەو رۆژە لە پارك غیرەتی باسکردنی ئەم مەسەلەیەم نەبوو. چونکە دەترسام ئەمجارەشت بـۆ جاری دووەم لەدەست بدەمەوە، هەر بە دوای دەرفەتێکیەوە بووم تا پێش هاوسەریەتیەمان ئـەم باسە بێنمەوە گۆڕێ. ئێستا خۆشحالّم کە ئەو دەرفەتە رەخسا تا ئاسـوودەتر قـسەکانم بکـەم، یەکێك لەو مەسەلانەش ئەوە بوو کە دەمهەویست ناسنامەی مەهدی بخەمـە سـەر بنەمالّـەی خۆمان و بەناوی خۆمیەوە ناسنامە بۆ دەربێنمەوە.

ئومێد بەقسەکانی هیچ بیانوویەکی بەدەستەوە نەهێشتم و هەمووی بڕین و منێکـیش کـە خۆم ئامادە کردبوو تا وەلآمی نەرێی بدەمەوە دووبارە خستمیەوە سەر دووڕیـانێکی دیکـەوە. ئومێد داوای لێکردم لە دەستنیشان کردن و هەلّبژاردنێدا پەلە نەکەم و بە بەلگەو بەلۆژیکێکی تەواوەوە هاوسەری ئایندەم هەلّبژێرم. ئەو تەنانەت نەوەشی بەمن گوت ئەگەر هات و رۆژێك لە رۆژان وەلآمەکەی من بە واگۆ و نەرێش بدەیتەوە هەمدیسان تۆ هەر هەمان ئەو مرۆڤـەی کـە وەك رۆژەکانی هەوەلّێ لەلام بەڕێز و خۆشەویستی و دە هەموو کاتێکیشدا ئامادەم هاریکاریت بکەم و بەهاناتەوە بێم و ئەوەش بزانە کـە هەمیـشە دەتـوانی حیـساب لەسـەر هاریکـاری و یارمەتییەکان و پشتیوانیە من بکەی.

بەچاوی ئەبلّەقـەوە دە ڕەهامـەوە دەڕوانـی و حەپەسـابووم کـە ئەمـەیان چ جەفەنگێکـە چارەنووس هێناویەتە ڕێی و دەگەلّیدا دەست پێکردووە. لە ڕەهام پرسـی:

- ئێستاچی؟ ئەرێ بەکامیان دەدەی؟

رەها هەستاو هەروا بەدەم سەیرکردنی ئاسمانێوە گوتی:

- نازانم، واگۆ کردنی هەر کامێکیان یانی تەمـەنێکی تـەواو دەرد و مەینـەتی و ئـێش و ئازار، پێموایە ئومێد دەبارو دۆخێکدایە کە دەتوانـێ بـە ئاسـانی ژن بێنێتـەوە بـەلآم ئاغـای کەنعانی ، پیاوێکە تەنیا و بەراستیش ئێش و ئازار ومەینەت دیدە، ناتوانم هەروا بـە ئاسـانی روو لەو هەموو رەنج و زەحمەت کێشانانەی وی وەرگێڕم وچاویان لێ بپۆشم و ئێستاش کە بیری لێ دەکەمەوە سەیردەکەم ئەو زیاتری پێویست بەمنە تا دەگاتە ئومێد، رەنگە من و ئومێدیش هەر نسیبمان لێك گرێ نەدرابێ بۆ یەکتر ببین ئەوانەی دیتیشمان هەر تەنیا گەمەیەکی تالّ بوو ژیان پێی کردین. هەر ئێستا کە لەبەردەمی ئێوە لێرە دانیشتووم بڕیاری خۆم داوە کـە واگـۆی ئومێد بکەم و وەلآمی نەرێی بدەمەوە. دەمەوێ چاوەڕوانی بـەربوونێ ئاغـای کـەنعانی بم تـا

دوای بەربوونەکەی دە ڕێ و ڕەسمێکی سادە و ساکاردا مێردی پێ بکەم. حەزم لێیە نەمجارەیان من گاڵتە بەچارەنووس بکەم و پێی پێبکەنم.

ڕەها هەر قسەی دەکرد و دەربارەی ژیان و ئایندەی خۆی بەپەنای ئاغای کەنعانییەوە دەدوا بەڵام من دەخەیاڵی ئەوەیدا بووم داخوا بەهەڵە نەچووە؟ ئایا باشترینیانی هەڵبژاردووە؟ ڕۆژو هەفتەکان ڕابردن و لەبەر نزیکبوونەوەی ساڵی نوێش لە ڕەهای بێ ئاگا بووم. ڕۆژانی پشووی نەورۆزیش تەواو بوون و دووبارە چوومەوە نووسینگەی گۆڤارێ و هەروەك ڕۆژانی پێشوو کاروبارەکان دەستیان پێکردەوە.

گەرموو گوڕی وچوست و چالاکییەك دەنێو کوڕەکاندا دەدیترا. ئاغای میرزایی هەموو لەهەمووی کۆکردنەوەو گوتی:

- خوشك و برایان بەهۆی پشووەکانی جەژنی نەورۆزەوە لەبارەی هەواڵ و ڕاپۆرتانەوە هێندێك وەدواکەوتووین بەڵام هەرگیز نیگەرانیش نیم چونکە دەزانم بەپشتیوانی و کۆمەکیە ئێوەوە هەروا بەو زووانە ئەو دواکەوتنە قەرەبوو دەکەینەوە...

ئاغای میرزایی دەنێو یەك وتاری دوور و درێژدا و (با) دەکەوڵ کردنێ کوڕەکاندا قسەکانی بەکۆتا هێنان.

بڕیارم دا هەر لەیەکەمین دەرفەتدا سەرێکی ڕەهای بدەم و چاوم پێی بکەوێ. هەوای خۆش و سازگاری بەهاری و ئاوازی مەل و باڵندەکان هەموو مرۆڤێکی وەجۆش و خرۆش دێنا و دەیخستە هەلەکە سەما. حەزم دەکرد دەوان ساتانەدا تا بتوانم دەو هەوا بەهاریەیدا بای باڵی خۆم بدەم. هێندێك پیاسەی بکەم. چەندین شەقامی مابوون بۆ ماڵێ ڕەهای هەمووم بە پێیان بڕی. بەلای پارکێکدا ڕەتدە بووم کە گوێم لە دەنگێکی ئاشنابوو بانگی کردم:

- سپێدە خانم، دیارە بەرەو ماڵی ئێمەوە دەچی؟

ئاورێکی دواوەم دایەوە و بەدوای خاوەن دەنگەکەمداچاو دەگێڕا. ئەوم چاك دەناسی. ڕەها بەڕوویەکی گەش و بەخۆشحاڵیەوە کە دەستی مەهدی بەدەستەوە بوو لەبەردەمم قیت بۆوە و بە دەممەوە پێدەکەنی. لەوەش کە دەناوەڕاستی ڕۆژەکانی هەفتەیدا مەهدیم بەلایەوە دیت سەرسام بووم، ڕەها و مەهدیم بەگەرمییەکەوە ماچ کردن و و لە هەواڵم پرسین. ڕەها تابڵێی خۆشحاڵ و شاد و شەنگوڵ و بەکەیف بوو و هیچ غەم و خەفەتێکی بەسەر و ڕووانەوە دیارنەبوو. لەسەر پێشنیاری ڕەهای، دەگەڵ ئەو و مەهدیدا چووینە پارکێ تامەهدی هێندێك

گەمان بکا. دوای ئەوەی مەهدی لەیاریگای پارکێ مژوولی گەمان بوو رەهاش لەسەر لاتەختێکی لەتەکمەوە دانیشت و بەسپاییەوە گوتی:

- دەزانی ئێستا خۆم بەبەختەوەرینترین کەسی سەر دنیایە دەزانم.

بەهەوتییەکەوە تێی رامام و بەپێکەنینەوە گوتم:

- بەو بیستنەی تابلێی خۆشحالم بەلام دەتوانم بپرسم هۆی چیە؟

رەها بەچاوە جوانەکانیەوە سەیرێکی کردم و گوتی:

- ئەگەر لێم گەڕێی دوای ئەوەی لەمالێ میوانداریەکی چاکم کردی ئەو دەمی پێت دەلێم هەرچەندە دەشزانم دەتحەپەسێنم و سەرسامیشت دەکەم.

رەها بێدەنگ بوو و کەوتە تەماشاکردنێ یاری و گەمەی مەهدی گوایە وەك بلێی نایەوێ لەبەر خاتری قسان لەسەیری ئەودیمەنە جوانە بێ ئاگابێ. چاك دەمزانی کە سەیرکردنێ مەهدی بەلای ئەوە وە لەهەموو کارێکی دنیایە بەتام و چێژترە. ئەو هەرچی هیواو ئاواتی هەبوو هەمووی لە بوونی مەهدیدا خڕکردبۆوە.

هەردووکمان سەعاتێکمان بەسەیر کردنێ مەهدییەوە بەسەر برد. تا لە دواییدا دەستی لەیاری هەلگرت و بەرەولای رەهاوە هاتەوە و بەشیرین زمانییەکەوە گوتی:

- دایکە ئیدی ماندوو بووم، رەبابە خانم ئێستا کێکی ئامادەکردووە؟

رەها لەسەرەخۆ روومەتی مەهدی گوشی و گوتی:

- ئەدی، هەروەك بەلێنی داویەی ئێستا جوان و زەریف کێکەکەی دروست کردووە داینارە.

مەهدی دەستی رەهای گرت و بەرەو لای خۆیەوەی راکێشاو گوتی:

کەواتە زووکە دایکە، من زۆرم حەز لەو کێکانەیە کە رەبابە خانم دروستیان دەکا.

رەها بە دەم پێکەنینێوە لەجێ هەستاو گوتی:

- زۆر چاکە، ئەوسن هەستە دەی، بەلام دەبێ بەلێن بدەی زۆری نەخۆی و دوای کێك خواردنێش ددانەکانت پاك بشۆیت.

مەهدی نێو چەوانی تێکنا و گوتی:

- ئێستانابێ وەختی نووستنێ بیانشۆم؟

رەها بەسەرسامیەوە پرسی:

- لەبەر چی، خۆ تۆ قەت کورێکی تەمبەل نەبوویتە؟

مەهدی سەری بەردایەوەو گوتی:

- ئاخر حەز دەکەم تامی کێکەکەم چەند سەعاتێکان دە زاریدا بمێنێ.

من و رەها هەر دووکمان بە دەنگێکی بەرزەوە پێکەنین و کە مەهدیش پێکەنینەکەی ئێمەی دیت لە شەرمان سەری دەکۆشێ داکیدا شاردەوەو بەنا بەدڵیەکەوە گوتی:

- ئێ، ئەوە چیە؟!

رەها کە هەر پێدەکەنی گوتی:

- تۆ حەز دەکەی تامی کێکەکەت چەند سەعاتێکان دەزاریدا وەمێنێ و بەوکارەشت داوەتی میکرۆبان دەکەی.

هەموو پێکەوە بەرەو ماڵێ رەهای بووینەوە. بەدرێژایی رێیە مەهدی هەر خەریکی شەیتانیان بوو و چرکەیەك چیە دانە دەساتا و ئارامی نەدەگرت و رەهای نارەحەت دەکرد بەڵام رەها بە حەوسەڵەوە هێوری دەکردەوە و هەڵس و کەوتەکانی بەرزەفت دەکرد و هەربە زمانی منداڵانە دایدەساتاندەوە.

لەماڵێ رەهای، رەبابە خانم چۆنی بەڵێن بە مەهدی دابوو ئاوای کێکەکە ئامادەکردبوو و لەسەرمێزێی دانابوو.

دوای خواردنی عەسرانە، مەهدی چووە ژوورەکەی خۆی و سەرقاڵی گەمە کردنێ بوو بە یارییەکانی.

دوای ئەوەی کە رەها دڵنیابوو مەهدی سەرقاڵی گەمانە و گوێ لەقسەکانی مە ناگرێ لەسەر قەنەفەکە بە تەنیشتمەوە دانیشت و بە دەنگێکی لەسەر خۆوە گوتی:

- باوەڕ دەکەن ئەگەر بڵێم لێرە بە دواوە بۆ هەمیشە مەهدی دەگەڵ مندا دەژی و دەمێنێتەوە!

خۆشحاڵ و سەرسام و بەنا باوەڕییەوە سەیرێکی رەهام کرد و پرسیم:

- بەڕاستی، بەڵام مێردی پێشووتان چۆناوچۆن رازی بوو؟

رەها کۆکەیەکی کرد، هێندێکی خۆ هێناو برد و گوتی:

- محەممەد بۆ خۆی ناردبووی کە هەر کاتێك بمەوێ دەتوانم مەهدی بێنمەوە لای خۆم.

بەزاری بەشەوە گوێم دایە قسەکانی رەهای و هەوڵی ئەوەم بوو بزانم رەها گاڵتە دەکا یان بەڕاستیەتی؟ رەها کەمنی وا بە حەپەساوییەوە دیت گوتی:

- باوەڕ ناکەن؟ باشە دەی باش گوێ بگرە تا بۆتان باس کەم.

ئەوجا بەتاکە کۆکەیەکی سینگی خۆی ساف کردەوە و گوتی:

رۆژێکیان، زەنگی دەرکێ لێی دا. هەروەك هەمیشە رەبابە خانم دەرکەی کردەوە. بەخەیاڵی ئەوەی کە ئەوە ئومێدە و هاتۆتە سەردانێم چوومە حەساریٚ بەلاّم بەحەپەساوییەکی تەواوەوە موحتەرەمم دیت جلێکی رەشی دەبەردایە و بە دەموچاوێکی غەم و خەفەتبارەوە دەستی مەهدی بەدەستەوە دەنێوە ڕاستی حەسارێدا دەگەڵ رەبابە خانمێدا قسان دەکا.

هەرکە مەهدی چاوی پێکەوتم بەڕاکردنەوە لە پلیکانەکانەوە بەرەو سەرەوە هات و خۆی دەباوەشێ هاویشتم. هەرکە موحتەرەمیش چاوی بەمن کەوت فرمێسکی بە چاواندا هاتنە خوارێ و بەرەو لامەوە هات. فەرمووی هۆڵی میوانانم کرد و لە حاڵ و باڵیم پرسی و چاکو چۆنیەکی گەرمیشم لێکرد. موحتەرەم لە جاران پیرو داکەوتەتر دەهاتە بەر چاوان. داوام لە رەبابە خانمێ کرد تا مەهدی بەرێتە ژوورەکەی خۆی.

ئەوجا رووم دەموحتەرەمێ کردەوە و گوتم:

- هیچ شتێکی ناخۆش و دلّتەزێن روویداوە؟ بۆ وا پەریشان و ئالّوزو پەشۆکاوی؟

موحتەرەم کە هەروا بە بێدەنگیەوە فرمێسکی دەڕشتن گوتی:

- محەممەد داوای لێکردم تا مەهدیتان بۆ بێنمەوە و ئەو نامەشی دەگەڵدا بۆ ئێوە ناردووە.

موحتەرەم پارچەکاغەزێکی بۆ راداشتم و لێم پرسی:

- ئەدی محەممەد بۆ خۆی لەکوێیە؟ بۆ بۆ خۆی مەهدی نەهێنایەوە؟

ئیدی موحتەرەم خۆی پێ ڕانەگیراو لەسەلاّی گریانێی دا. بە حەپەساوییەوە سەیرێکیم کردەوە دلّم هەواڵێکی ناخۆشی دەدامێ. دووبارە پرسیمەوە:

- قسان بکە: گوتم محەممەد ئێستا لە کوێیە؟

موحتەرەم سەری بەردایەوە و بە دەم هەنیسکانەوە گوتی:

- محەممەد مردووە.

لەسەرسامی و باوەڕنەکردنێوە قریشکەیەکم لێ دا و پرسیم:

- یانی چی؟ باشە ئەوەکەی و چۆن مرد؟

موحتەرەم هەروا بە دەم گریانێوە دەستی بە گێڕانەوێ کرد:

- ماوەیەك دوای ئەوەی کە مێردم بە محەممەدی کرد ئەوجا زانیم کە ئالّوودە بووە. محەممەد فێرە هێرۆین ببوو وکاری بەرگدروونەکەی بەرەڵلاّ کردبوو. بە زەحمەت پارەو پوولێکی پەیدا دەکرد، ئەوەی دەستیشی کەوتبایە هەر دەیدایەوە بە مادده هۆشبەرەکان. وردە وردە دەگەڵ برادەرێکی قاچاغ فرۆشی خۆی کەوتە فرۆشتنی مەواددی قاچاغ. لەوەی کە دەیفرۆشت پارەی

خەرجییە خۆی و نیمەشی لێ دەدا. تا مەنموران کەوتنە دوایان و دە دەرفەتێکی گونجاودا پێوە دەبن. دەو جانتایەی بەمحەممەدی دەبێ برێکی زۆری ئەو مەوادده قاچاغە تێدا دەبێ کەلە دادگایە برادەرەکەی نکوڵی لەهەموو شتێکی دەکات و دەڵێ ئەو مەوادانە هەمووی ئی محەممەدیە. فەرمانی لەسێدارەدانی هەردووکیان لە دادگایەوە دەردەچێ و فەرمانی مەرگ بەسەر هەر دووکیاندا دەدرێ. لە دوایین چاوپێکەوتنەوێمدا دەگەڵ محەممەدی ئەو بۆ خۆی ئەم نامەیەی دامێ و داواشی لێکردم تا مەهدیش دەگەڵ ئەم نامەیەدا بۆ تۆ بێنمەوە.

بەحەپەساوییەوە سەیری موحتەرەمێم دەکرد و گوێم بۆ قسەکانی شل کردبوو. بە دەستێکی لەرزۆکەوە ئەو نامەیەم هەلپچڕی کە موحتەرەم دابوومیە. ئەوەش نامەکەیە کە محەممەد بۆی نووسیوم و بەهۆی موحتەرەمێوەی ناردووە. واچاکترە ئێوە بۆ خۆتان بیخوێننەوە.

رەها نامەیەکی لەسەر مێزەکە هەلگرتەوەو دایە دەستم. سەیرێکی رەها و دوایەش سەیرێکی نامەکەم کردو چاوێکم پێدا خشاند. رەها بە ئاماژەی سەرداوای لێکردم نامەکە بخوێنمەوە. نامەکەم کردەوەو دەستم بە خوێندنەوە کرد:

- سلاو، دەزانم کە ئیدی کەلکی قسانی پێوە نەماوە بەلام ویستم لەو چەند ساتانەی کەلەتەمەنما ماوە هێندێك لەباری گوناهەکانم سووك کەم. کاتێ کە ئەم نامەیە دەخوێنیتەوە من چەندین رۆژە گەیشتوومەتە مالی تا هەتای خۆم. ئەوەندە دیرانەشم بۆیە نووسین تا گەردەنم ئازادکەی هەرچەندە دەشزانم داوایەکەشم جێ ومایەی پێکەنین و گالتە پێکردنییە، بەلام وەك ئەوەی کە بۆخۆم شارەزای تۆو دڵ و گیانە گەورەکەتم دەزانم کە هەر دەمبەخشی. داوام لە موحتەرەمێ کرد تا مەهدیت بۆ بێنێتەوە و خۆت سەرپەرشتی بکەیت و گەورەی کەی.

ئومێدەوارم کە مندالە بچکۆلانەکەم لەکۆش و باوەشی تۆدا و بەتەك تۆوە تام و چێژی ژیان و بەختەوەرییە بکا.

شەرمی رابردوو دامدەگرێ و تەریق دەبمەوە و تکاشم لە تۆنەوەیە کە لە دوا رۆژدا هیچ شتێك دەربارەی ئەو خراپی و زۆری و ستەمانەی کە دەرهەقی تۆم رەوا دیتن و دەگەلمدا کردی هیچیان بۆ مەهدی نەگێڕیەوەو پێی نەلێی هەرچەندە دەشزانم من شایانی ئەوەش نیم. زۆرم ناڕەوایی دەرهەقی تۆ و مەهدی کردووە بۆیە بەگیانی ئەو مەهدییەت سوێند دەدەم کەبمبەخشی و چاو لە گوناهەکانم بپۆشی.

مێرد و باوکی گوناهبار، محەممەد

دووباره نامەکەم پێچایەوە و بە وردی خستمەوە زەرفەکەی، زەرفەکەم دایەوە دەست ڕەهای.

ڕەها نامەکەی وەرگرتەوە و دەوتەم و غەمە کە بەروخساریەوە نیشتبوو درێژەی دایە:

- دوای ئەوەی کە موحتەرەم مەهدی و نامەکەی دانەوە من لەجێ هەستا تا بچێتەوە ماڵە خۆیان، دەستیم گرت و دامنایەوە. لیم پرسی:

- ئێستا دوای ڕۆیینێ محەممەدی خەرجی خۆت و منداڵەکانت چۆناو چۆن دەردێنی و دابینی دەکەی و بەچ شێوەیەك و بەکام ڕێگایەکەوە دەیانژیەنیت؟

موحتەرەم سەرنجە غەماوییەکانی دە عەردیەوە بڕین و بەشەرمێکەوە وەڵامی دایەوە:

- نازانم، ڕەنگە هەر بەکارەکەریە بیانژیەنم، چونکە پێش مێردکردنیم بە محەممەدی پارەی کرێی خانووم وەردەگرت و خەرجم دەکرد بەڵام لەبەر قەرداریە محەممەدی کەبەسەریدا کەڵەکە ببۆوە ناچار بووم خانووەکە بفرۆشم تا نەکەوێتە زیندانێ، ئێستاش هەرچی هیواو ئاواتێك چیە نەماوە، بۆ خۆم خۆڵم بەسەری خۆمدا کردووە و تازەش باجەکەی دەدەم.

لەجێ هەستام و لەناو قاسەیەکی ئاسندا تاپۆی یەکێك لەو خانوانەم دەرێنا کە لە بابەگەورەوە بە میرات بۆم مابۆوە و دامە دەست موحتەرەمێ. موحتەرەم بەسەرسامیەوە جارێك سەیری من و جارێکیش سەیری تاپۆیەکەی کرد کە بۆم ڕاداشتبوو و پرسی:

- ئەوە چیە؟ من چ ئەو تاپۆیەی کەم؟

دە وەڵامیدا گوتم:

- هیچ، پاداشتی ئەوەیە کە کوڕەکەمت بۆ هێناومەوە، تەنیا ئەوەندە، من بڕیارم دابوو ئەم خانووە لەقەبەڵ ئەو کەسەکەم کە مەهدیم بۆ بێنێتەوە و ئەوە ئێستاش من بڕیارەکەی خۆم بەجێ هێنا، بەیانیش وەرە تا پێکەوە بچین و خانووەکەت بەناو بکەم و بیخەمە سەر تۆ.

موحتەرەم ناباوەڕانە سەیرێکی من و سەیرێکی تاپۆیەکەی کردەوە، وەك بڵێی لەوەی کە دەیبینێ و دەیبیسێ دڵنیانەبێ. بەڵام کاتێ کە ڕاشکاوییە من و بڕیارەکەمی دیت زانی کە فێڵی لێ ناکەم و بەگاڵتەم نیە و نامەوێ ئازاری بدەم تا پۆیەکەی لێ وەرگرتم وویستی دەستم ماچ بکا بەڵام من نەمهێشت.

دوای سوپاسێکی زۆر ماڵی بەجێهێشت و لێیدا ڕۆیی.

موحتەرەم نەیدەزانی کە ئامادەبووم هەرچی هەمە لەبری مەهدی بیدەم هەر هێندە مەهدیم وە دەست کەوێتەوە، ئەو ئەوەشی نەدەزانی کەلە بەرامبەر هێنانەوەی مەهدی ونیوەی مان و

بوونەکەمدا، زۆر لەوە زیاتری پێ قەردارم کەبیری لێ دەکاتەوە. دوای ڕۆیشتنی موحتەرەمێ چەندین جاری دیکەشم نامەکە بەوردی خوێندەوە. بەلەسێدارەدانێ محەممەدی حەپەسابووم و باوەڕم نەدەکرد محەممەد مردبێ. داخی ئەوەم نەدەچوو کە بۆ ئەو چارەنووسێکی ئاوا شوومێ بۆ من و خۆی کێشابوو و بەڵام چونکە بەگیانی مەهدی سوێند دابووم تا بیبەخشم، منیش چاوم لە تەواوی هەموو گوناهەکانی پۆشی و حەزم دەکرد خوداوەندیش بیبەخشێ.

ساڵی نوێم دەگەڵ مەهدی و بەتەك کەسوکارەکانمەوە دەست پێکرد. دەپشووی جەژنی نەورۆزێدا بۆ سەردانێ چوومە ماڵێ خاڵم. لەماڵێ خاڵم تەواوی بەسەرهات و ڕووداوەکانم هەر لە خوازبێنیە ئومێدیەوە تا لە داردانێ محەممەدی و بڕیاردانێ شووکردنەوێم بە ئاغای کەنعانی هەمووم گێڕانەوە.

خاڵم و خاڵۆژنم کە هەر زوو ئاگایان لەو پەیوەندیەی من و ئومێدی بوو و دەیانزانی لەو بۆشاییەی کە دەنێوانمان کەوت چیم بەسەرهات و چەندم نارەحەتی چێشتبوو، ئامۆژگارییان کردمەوە کە هەروا پێ لە خواستەکانی دڵی خۆم نەنێم و هەروا لە ڕووی هەست و سۆزیشەوە بڕیاری بەپەلە نەدەم.

دوایئەوەی کە قسەکانی خاڵ و خاڵۆژنم تەواو بوون دڵنیام کە دوای قوڵبوونەوەیەکی زۆر گەیشتوومەتە ئەو سەرەنجامە و هەر لەسەر بڕیاری خۆشم و هەر چاوەڕێی ئاغای کەنعانیشم.

چەندین ڕۆژ بەسەر دەست پێکردنی ساڵی تازەدا دەڕۆیی. دەگەڵ مەهدیدا چوومە سەردانێ ئیمام ڕەزای تا ئەو نەزرانەی بۆ گەڕانەوەی ئارامی و ئاسوودەییە ژیانم و دەستکەوتنەوەی مەهدیم لە خۆ گرتبوون بیانکەم.

هەفتێکی لە مەشهەد مامەوەو دەگەڵ شیرین و خێزانە خنجیلانەکەیان و مەهدیدا ڕۆژانێکی خۆشمان ڕابوارد.

لەمەشهەد لە حەرەمی ئیمامی هەشتەمدا گریام و داوام لێکرد لە هەڵبژاردنی دووەمێمدا دەهانام بێت و یارمەتیم بدات. داوام لێکردن چ باشە ئاوابێ، هەروەك هەمیشە خۆمم دایەوە دەست چارەنووس. کاتی گەڕانەوە بڕیارم دا تا هەر لەیەکەمین چاوپێکەوتنەوێ ئومێدیمدا، وەڵامی کۆتایی پێ بدەمەوەو تکاشی لێ بکەم بۆ تا هەتایە من لەبیرخۆی بباتەوەو دەگەڵ یەکێکی دیدا لە بەختەوەرییە بگەڕێ و بیدۆزێتەوە دوو ڕۆژم لە گەڕانەوەی تارانێ تێدەپەڕی کە ئومێد بۆ خۆی هاتە سەردانێم. ئومێد لە پوورە فرانکێی بیستبوو کە مەهدی لەلای منەو بۆ پیرۆزباییە هاتبووە ماڵێ.

هەر لە هاتنە ژووره وێی وەك جاران دڵم لەرزی، بۆ ساتەوەختێکی لەو بڕیارەی دابووم پەشێمان بوومەوە بەڵام کە ئاغای کەنعانی و قوربانییەکانیم وەبیرهاتنەوە، دووبارە بڕیارم دایەوە بڕیارەکەم واگۆکەمەوە.

ئومێد سەرقاڵی گەمان بوو دەگەڵ مەهدیدا سەیرێکم کردن. ئومێد بە ئەنقەست تۆپەکەی هەڵدایە حەساری، کاتێ کە مەهدی بۆ هێنانەوەی تۆپەکە لە ئێمە دوور کەوتەوە ئومێد سەرنجێکی ئاشقانەی تێگرتم و گوتی:

- ئێستا دوایین بیانووت بڕا و بەهاتنەوەی مەهدی ئیدی بیانووی واگۆ کردنی پێشنیارەکەشمت نەما.

لەوەش کە ناچاربووم ئەوی لەخۆم بتۆرێنم، رقم لەخۆم دەبۆوە. سەرم بەردایەوەو بەدوای وەڵامێکی گونجاوەوە بووم کە ئومێد خۆی بێدەنگییەکەی شکاند و گوتی:

- بۆ بێدەنگ بووی!؟ پێشینان گوتوویانە بێدەنگی نیشانەی رازیبوونێیە داخوا وایە؟

حەزم دەکرد هاوارکەم، بەڵام بەداخەوەکە نەمدەتوانی. دووبارە بێدەنگییەکی خەست ماڵەکەی داگرتەوە. کە ئومێد بێدەنگییەکەی منی دید بەسپایی گوتی:

- بۆ بێدەنگی؟ توو بی خودا هەر قسێکی بکەو رزگارم کە، ناکا بڵێی ئاغای...

ئومێد نەیتوانی قسەکەی تەواوبکا، پەشۆکا بوو، سەرم بەنیشانەی ئەرێوە لەقاندو گوتم:

- بەڵێ، چاکی تێگەیشتووی، قەرزداری ئاغای کەنعانیم.

ئومێد بە تووڕەییەوە گوتی:

- من نازانم ئەو هەموو سووربوونەت لەپای چیە کەخۆت بە قەرزداری ئەو بزانی. ئەو کە نەیتوانی بۆتۆ و بۆ ئەستاندنەوەی مەهدیش هیچی لەدەست بێ، ئەی کەواتە قەرزداری چی ئەوی؟

لەوەی کەببوومە هۆی تۆرانی ئومێدی نەفرەتم لەخۆم دەکرد بەڵام چارەیەکیشم نەبوو و لە وەڵامدا بە نارامی گوتم:

- راستە کە ئەو هیچی بۆمن و مەهدی لە دەست نەهات بەڵام ئەوەی پێشی کرا کردی و تەنانەت بۆ بە یەك گەیشتنەوەی من و مەهدی شەش مانگان کەوتە زیندانێ.

ئومێد بە رقەوە سەیرێکی کردم و گوتی:

- ئەحیر حاتوون، ئەوان لەبەر بەیەك گەیشتنەوەی تۆو مەهدی نەکەوتنە زینـدانێ بەڵکـە لەبەر بەیەك گەیشتنی خۆی بەتۆ بوو کە کەوتە زیندانێ، بۆ ئەوەیانت قبوڵ نیە و هەوڵ دەدەی خۆت بخەڵەتێنی؟

تکا دەکەم تۆزێك لۆژیکیانەبیربکەرەوە، ئەو پیـاوە بـە بابـت دەشـێ, جارێکـت ژیـان لێ تێکچوو بەس نیە دەتەوێ جارێکی دیکەشی خراپ کەیەوە و تێك و پێکی دەیەوە؟

لە جێوە هەستام و بەرامبەر ئومێد راوەستام، رێك چـاوم دەچـاویەوە بـڕی بـەلاّم تـەواوی بـەدەنم دەسـتی بەلـەرزینێ کـرد و نـەمتوانی قـسێکی بکـەم. سـەرم بەردایـەوەو بـەرەولای پەنجەرەکەوە چووم.

ئومێد دووبارە بێدەنگییەکەی شکاندەوە و راست و ڕەوان گوتی:

- خۆت هەڵ مەخەڵەتێنە دەزانم خۆشتدەوێم، لەچاوتەوە دیارە، بۆ خۆشت چاك دەزانی کـە ئەوت هەر تەنیا لەبەر ماندوو بوون و زەحمەتەکانی دەوێ، بۆ حەز دەکەی رۆڵـی قارەمانیـەتی بگێـڕی؟ ئێـستاش کـە خـۆت حەزناکـەی و نـاتوانی داوای لێ بکـەی بـۆ هەمیـشە لێـت دوورکەوێتەوە، ئەوە من ئەو کارە دەکەم و داوای لێ دەکەم نەبێتە مایە و لەمپەری بەختەوەری ئێمە.

بەترسێکەوە ئاورێکم لێ دایەوە و گوتم:

- ئەگەر ئەوەی بکەی سوێند دەخۆم کە هەرگیز نەتناسم، بۆ ئەوەت پێ قووت ناچێ کەمن ئەوم خۆشدەوێ و دەمهەوێ ژیانی تازەمی دەگەڵدا دەست پێ بکەمەوە.

- ئومێد هەنگاوێك بەرەو پێش هات و هاواری کرد:

- درۆدەکەی زۆرچاکیش دەزانی کە درۆدەکەی ئەوت خۆشدەوێ: پیاوێك کە بەبابت دەشـێ و تۆ بەچاوی فرزەندی خۆی سەیر دەکا، باشە من بۆ هەمیشە لە ژیانی تـۆ دێمـە دەرێ بـەلاّم واباشترە پێش ئەوەی درەنگ بێت هێندێك لۆژیکیانەتر بیربکەیتـەوە ئەڵبەتـە ئەوەشـم لەبـەر خاتری خۆم نیە وا دەڵێم، چونکە هەروەك گوتم من بۆ هەمیشە لە ژیانی تۆ دێمەدەرێ، بەڵکە هەر لەبەر خاتری خۆتمە، تۆ هەرگیز ناتوانی تەمەنێکی دوور و درێژ درۆ دەگەڵ خۆتدا بکەی.

ئومێد رۆیی و بەتووڕەییەوە دەرگاکەی بە دوای خۆیـدا پێکدادایـەوە. ئـەو تەنانـەت بـۆ دوایین جاریش خودا حافیزی لەمن نەکرد. فرمێسکەکانم بەخوڕ دەهاتنە خـوارێ و روخـساریان بەتەواوەتی تەڕ کردبووم. مەهدی بەسەرسامیەوە تێوەی دەڕوانیم و هـۆی ئـەو داد و هـاوارەی ئومێدیشی نەدەزانی. بانگی ڕەبابە خانمێم کردوداوام لێکرد مەهدی بەرێتە ژوورەکـەی خـۆی،

،هدی خۆی دەباوەشێ هاویشتم و دەستی بەگریانێ کرد. هەر بۆ ئەوەی هێوریشی کەمەوە، دەستبەجێ فرمێسکەکانم سڕینەوە و دەستم بەیاریی کردنێ دەگەڵەویدا کرد. کە مەهدی هێوربۆوە داوام لە رەبابە خانم کرد بیباتەوە ژوورەکەی خۆی و بیخافڵێنێ.

رەبابە خانم مەهدی بردەوە ژوورەکەی خۆی و دوای چەند ساتێك دەنگی گەمە و یاریکردن و پێکەنینی بەرزبۆوە. ئیدی خۆم پێ ڕانەگیرا چوومە ژوورەکەی خۆم و لەسەلای گریانێم دا.

ئومێد بۆ تا هەتایەی بەجێهێشتم و رۆیی. من ئەوم بۆ تاهەتایە لەکیس دا، ئەوێك کە پیاوی خەون و خەیاڵەکانم بوو و تەواوی خۆشی و شادی دنیایەم لەودا دەدیت. ئومێد رۆیشت و منیش هەوڵم دا تا خۆم لە دەست ئەو ئازار و رەنج و مەینەتیە بێهودانە رزگارکەم و بۆتا هەتایەی لەبیر بەرمەوە و بیر لەو ژیانە تازەیەی گەڵ ئاغای کەنعانی بکەمەوە. بەڵام بەداخەوە کە ناتوانم و هەمیشە دەگەڵ یادو بیرەوەرییەکانی ئومێدیدا دەژیم.

رەها بێدەنگ بوو، کاتێ کە سەرم هەڵبڕی وسەیرم کرد، فرمێسك دەموچاوی هەموو داپۆشیبوو لەجێوە هەستام و بەبێ هیچ قسەیەك بەجێم هێشت. زانیم ئەو هەوڵ دەدا خۆی هەڵ خەڵەتێنێ و دەیهەوێ بە خۆدەرخستنی خۆی وەك خۆشبەختترین ژنی دنیایە، تا ئەندازەیەك لە غەم و خەفەتی ناخی ناوەوەی دڵ و هەناوی سووك کات. بەڵام دەکرێ ئادەمیزاد درۆ دەگەڵ خۆشیدابکا!

دە رۆژ بەسەر دواین دیداری من و رەهایدا تێدەپەڕی. چەندین جارانم بە تەلەفۆن قسە دەگەڵدا کردبوو. هەموو جارێکیش بە کورتیم لە حاڵ و ئەحواڵی دەپرسی. رەها بە ڕوواڵەت ئارام بوو و هەروەك چۆن لە پێشدا گوتبووی جگە لە ژیانی ئایندەی دەگەڵ ئاغای کەنعانیدا بیر لەهیچ شتێکی دی ناکاتەوە.

دەرۆژ دوای دیدارم بوو دەگەڵ رەهایە کەچوومەوە نووسینگەی گۆڤارێ. نامەیەکی زۆرم لەسەر مێزەکەی بوو نامەکانم هەڵگرتنەوە و سەیری ناو ونیشانی یەکەیەکەی نامەکانم کرد کە لەپڕ لەنێو نامەکاندا چاوم بەکارتی داوەتنامەیەك کەوت. دەستبەجێ زەرفەکەیم کردەوە، بەخۆشحاڵیەوە ناوی رەهام بەسەر کارتەکەوە خوێندەوە. چاوم بەسەرکارتێکی بووك و زاوایەتییە یەکجار جوانەوە ئەوق بوو.

((ئیدی ئاخریەکەی رەها کاری خۆی هەر کرد)) سەیری بەرواری زەماوەندەکەم کرد، کۆتایی هەفتەبوو. دڵشادو خورسەندبەکۆتاهاتنی سەختی و ناخۆشییەکانی رەهاوە سەرقاڵی کاری رۆژانە بوومەوە.

تاهاتنی رۆژی زەماوەندەکە دەستم بە کۆکردنەوەی هەواڵ و ڕاپۆرتی ڕووداو و بەسەرهات و ئاریشە جۆربەجۆرەکان کرد.

رۆژی زەماوەندی بووکێنیە رەهای مۆڵەتم وەرگرت تا خۆم بۆ هاوبەشی و ئامادەبوونی ئەو ئاهەنگەی سازکەم.

خەریکی ئامادەکردنێ جلەکانم بووم کە زەنگی تەلەفۆنی ماڵێ لێی دا. گوشییەکەیم هەڵگرت و وەڵامم دایەوە، دەنگی رەبابە خانمێم ناسیەوە دوای چاك و چۆنیەکی دوورو درێژ رەبابەخانم گوتی:

- خاتوون داوایان کردووە کە ئەگەر دەکرێ هەر ئێستا بگەنە لایان چونکە دەیانهەوێ قسەتان دەگەڵدا بکەن.

رەبابە خانم دڵنیاکردەوەکە تا سەعاتێکی دی لای رەها خاتوونێم. بەپەلە خۆم ئامادەی چوونە ئەو ئاهەنگەی کردو بەرەو لای ماڵی رەهاوە کەوتمە رێ. دەمزانی رەها مەبەستیەتی ئەورۆ داستانی ژیانەکەی بەکۆتابێنێ.

گەیە ماڵێ رەهای و دەرگاکەم بەنیوەکراوەیی دیت. زەنگم لێ دا. رەبابە خانم بەپەلە لەماڵێ هاتە دەرێ و کە چاویشی بەمن کەوت لەبەر دەرکێ چاوەڕێم پێکەنی و بە ئاماژەی دەست گوتی:

- بەیارمەتی خۆت وەرە ژوورێ، ئەوە بۆ لەبەر دەرکێ راوەستاون؟

لە رەبابە خانمێم پرسی:

- ئەوە بۆ دەرگاتان دانەخستووەو بەکراوەییتان بەجێ هێشتووە؟

رەبابە خانم کەلە ماندووەتیان وازی قسانیشی نەمابوو گوتی:

- لەبەیانیەوە تا ئێستا ئەوەندەیان زەنگ لێ داوە، وەرەزبووم هێندەی بچم ودەرکێ بکەمەوە بە پێشنیاری خاتوونێ دەرکەم هەروا بەنیوەکراوەیی هێشتەوە تا ئەوانەی کەخۆمانەن راست بێنە ژوورێ دەگەڵ رەبابە خانمێدا چوومە هۆڵێ. بەدیتنێ رەهای دەکراسی سپی ودرێژی بووکێنییە دا هەوت بووم. رەها لە رۆژانی پێشتر جوانترو دڵفرێنتر دەهاتە بەرچاوان و کراسی سپی و درێژیش جوانییەکەیان چەندان هێندەی دی کرد بوو. تاجیش جوانیە قژە خۆش رەنگەکەی وا رازاندبۆوە جیلوەیەکی تایبەتی دیکەی بەروخساری دابوو.

چەندین سەعاتی بۆ ئاهەنگەکەی مابوو. رەها هەر لەئێستاوە ئامادەببوو. چوومە پێشێ و پیرۆزباییم لێکرد، دەکراسی سپی و درێژی بووکێنییەدا جوانترو دڵفرێنتر لە جاران دەهاتە

بەرچاو رەها بەسەرنجە پرسیاراوییەکانی منی زانی. بەمیهرەبانییەوە دەستی گرتم و لەپەنای خۆیەوە دانام. ئەوجا بە کەفوکوڵ و گورج و گۆڵیەکی زۆرەوە پرسی:

- دەکراسی بووکێنییەدا چۆنم؟ لێم دێ؟

بەچاوی ستایشەوە سەیرێکم کردێ و وەڵامم دایەوە:

- بەڵێ بەراستی جوان بوو ون، بەڵام تا دەست پێکردنی رێ و رەسمەکە چەندسەعاتێکی بە بەرەوەیە، پێتان وانیە زووتان خۆ ئامادەکردووە؟

رەها بەقاقاوە پێکەنی و گوتی:

- یانی مەبەستت ئەوەیە زۆر بەپەلەم.

ویستم مەبەستەکەم روونترکەمەوە بەڵام رەهاکە هەروا پێدەکەنی گوتی:

- راستە هەقی ئێوەیە بەڵام چونکە حەزم کرد ئەورۆ داستانی ژیانەکەم کۆتاییەکی خۆشی هەبێ زووترم خۆ ئامادەکرد و داواشم لە ئێوە کرد بێنە ئێرە. هۆی ئەوەش کە چەند سەعاتێك زووترم داوای ئێوەکرد بێنە ئێرە تا بۆ خۆتان شایەدی هەموو رووداوەکان بن و بەرلەوەش ئاغای کەنعانی بێتە تەلارێ، ئەوەی دەو (١٠) دە رۆژەیدا روویداوە هەموویتان بۆ وەگێرم، ئێستاش تا سەعاتێکی دی کە ئاغای کەنعانی گفتی خەڵاتێکی پێداوم. سەعات چواری دوای نیوەرۆیە بڕیارە هەوتی خەڵاتێکم کا.

منیش حەزم کرد ئێوەش دەو دەمیدا لەوێ بن. و خودی خۆت شایەد بیت. لەبەر ئەوەش کە لە وانەیە قسەکانم درێژە بکێشن وام بەچاك زانی سەرەتا ئامادەبم و ئەوجا دەست بەگێڕانەوەی مەسەلەکان بکەم.

رەها هەر لەجێی خۆیەوە تەکانێکی دا و لۆچەکانی کراسە سپی و جوانەکەی رێك خستەوەو ئەوجا پێکەنی کە پێکەنینەکە هێندەی دیکە دەموچاوی جوان و دڵفرێنتر کرد:

- دوای ئەوەی کە باگۆی ئومێدیم بە نەرێ دایەوە دووبارە رۆژ و سەعاتەکانم هەموو لەلا بێ تام و بێ مانا بوونەوە. لەبەر خاتری ئومێدی کەمنداڵێکی زۆر هەستیارو زیتەڵە و وریایە ناچار بووم رووالەتی خۆم بپارێزم و خۆم شادو بەکەیف نیشاندەم. دوای ئەوەی ئومێدیش بەجێی هێشتم و رۆیی، هیچ چارەیەکی نامێنێ لەوەی بەولاوە کە بەبابم بلێ بۆیە دەچتەلای بابم. ئومێد هەر لە رۆژی چاوپێك کەوتنەکەمان لە دادگایە و داوای خوازبێنییەکەوە هەمووی بۆ بابم دەگێرێتەوە و هانای وەبەردەبا یارمەتی بدا. داوا لەبابم دەکا دەگەڵ دایکمدا بێنە ماڵێ من و بمدوێنن و لەو بارەیەوە قسانم دەگەڵدا بکەن. دایکم و

بابم لەسەر داوا و ریزی داواکەی هاتنە لای من. ئەوان پەیامەکەی ئومێدیان بەمن گەیاندەوە بەڵام من بڕیاری خۆم دابوو. هەر هەمان ئەو وەڵامەم دانەوە کە بەئومێدم دابۆوە. کاتێ کەدیتیان من بڕیاری یەکجارەکی خۆمم داوە ئیدی پرکێشیان نەکرد و بەتەمنیاوئارەزووی بەختەوەری من و ئاغای کەنعانییەوە ئێمەیان بەجێهێشت و چوونەوە. لەو رۆژە بەدواوە ئیدی ئومێدم نەدیتەوە، ئیدی هیچ پەیامێکی دیکەی بۆ نەناردمەوەو هەروەك چۆن گوتبووی ئاوا بۆ هەمیشە لە ژیانی من هاتبووە دەرێ.

رۆژی بەر هەڵدابوونێ ئاغای کەنعانی هات، دەگەڵ بابمدا چەپکەگوڵێکی جوانمان ئامادەکردو بەپێشوازییە ئاغای کەنعانییەوە چووین. ئاغای کەنعانیبەدیتنی ئێمەوە یەکجار زۆر شادو کەیف خۆش ببوو. شوێنەواری سەرسامییەی دە دەموچاوەمیهرەبانەکەیدا بەتەواوەتی دیاربوو، ئەو گوتی:

- هەرگیز چاوەڕێی هاتنی ئێوەم لەبەر دەرکێ نەدەکرد. پێشم وانەبوو هەر بە پێشوازیشمەوە دێن.

بەزۆریە بابم هەموو لە هەموو چووینەوە ماڵێ بابم و نانی ئێوارێمان دە کەش و هەوایەکی شاد و پڕ خۆشەویستیدا خوارد. دوای ئانخواردنێ بابم مەسەلەی مردنێ محەممەدی و ئەوەی کە روویدا بوو بەتایبەتی دەو ماوەیەیدا کە ئەو دەزیندانێدا بووە هەمووی بۆ گێڕایەوە. ئاغای کەنعانی بەبیستنێ مردنی محەممەد زۆر نیگەران و دڵگیربوو و لەبەر ئەوەش کە زۆر ماندووبوو مۆڵەتی لەبابم خواست تا رۆژی دواتر بۆ باسکردنێ مارەیی و چۆنیەتی رێو رەسمی گواستنەوێ بێتەوە ماڵێ وان تاپێکەوە گفتوگۆی لەسەر بکەن.

بابم رازی بوو و ئاغای کەنعانییش سەعاتێك دواتر چۆوە ماڵێ. شەوێ لەماڵێ بابم مامەوە و تا درەنگانێك دەگەڵ دایك و بابمدا هەر قسەکردن. دەمویست رێورەسمێکی سادە و ساکارو بێ دەنگ و بەنگ و پەنهانی بەرێوەبچێ. حەزم دەکرد رێورەسمی ئاهەنگەکە تابکرێ یەکجار زۆر سادەو ساکاربێ. داوام لەدایك و بابیشم کردەوە کە هیچ قسەیەك لەبارەی ئومێد و خوازبێنییەکەیەوە دەگەڵ ئاغای کەنعانیدا نەکەن.

بەیانی رۆژی دوایی ئاغای کەنعانی هاتەوە ماڵێ بابم و پێکەوە چەند سەعاتێکیان گفتوگۆکرد.

هەرچەندە من و بابم هەوڵمان دا و پێمان داگرت تارێ و ڕەسمەکە بە سادەیی وبێ دەنگ و بەنگ و بێ هەراو زەنا بەڕێوەبچێ ئاغای کـەنعانی نەیـسەلماند و هەرسـوور بـوو لەسـەر ئەوەی کە بۆ خۆی چۆنی پێخۆشە ئاوابەڕێوە بچێ.

دوای چەندین سەعاتان گفتوگۆ ئاغای کەنعانی سەرکەوت و چ من و چ بابم هەردووکمان دەبەرامبەر ویست و حەزەکانی ویدا ڕادەست بووین.

ئاغای کەنعانی پێش هەر شتێك ناسـنامەکەی مەهـدی لـەمن وەرگـرت تـا دەربـارەی ناسنامە تازەکەی هەنگاوی پێویست بنێ و ئیشەکە تـەواوکا، کەمنیـشی شـڵەژاو و دوودڵ دیت گوتی لەفەرمانگەی نفوس کەسێکی هەڵناوە کە زۆر بە ئاسـانی و بـەزووترین کـاتیش ناسـنامەکەی دەداتەوە دەستی.

ئاغای کەنعانی دوای ئانخواردنی نیوەڕۆیە ماڵـێ بـابمی بەجێهێـشت بـەڵام تاسـێ ڕۆژان نەهاتەوە لای من و نەسەردانێ بابم. وردە وردە وام بەخەیاڵدا دەهات کەلەو ژن هێنان و ژن و میردایەتییەی من پەشێمان بوویێتەوە و وازی هێنابێ وابوو بەڵام دوو ڕۆژ پێشتر سەردانێکی کردمەوە. هەستم کرد شتێك ڕوویداوە بەڵام ئەو ماندووبوونی کردە بیانوو و گوایە دەو چەند ماوەیدا لەبەر ڕێك و پێك خـستنەوەو بەسـەر ڕاگەیـشتنەوەی کاروبارەکـانی بـووە کـەپێی نەکراوە دیاربێ. ئاغـای کەنعانی بە ڕووالەت خۆشحاڵ و بەکەیف و دەماغ دەهاتە بەرچاو بۆ تەنیا ساتێکیش زەردەخەنەی لە لێوان نەدەبڕا بەڵام نـازانم بـۆ وا هەسـت دەکـەم کـە زەردە خەنەکانی هەمووی دەستکردبوون. دەگەڵیدا چوومە بـازاڕی و چـاکترین و جـوانترین جـل و خشڵ و زێڕی بۆ کڕیم. بەهەردووکمان کـارتی بووکێنییـەمان هەڵبـژارد. دوای هەڵبـژاردنی کارتەکان ئەو خۆی کارتەکانی لای خۆی گلدایەوە و گوتی:

- ئەرکی نووسینی کارتەکان و دابەشکردنیان بەسەر میواناندا لەسەر من.

ڕۆژی پێشتر هەوا تا دەهات بەرەو تاریکیەوە دەچوو کە ئاغای کـەنعانی داوای لێکـردم ئەوڕۆ کەمێك زووتر ئامادەبم و جلی بووکێنییەم دەبەرکـەم، و کـەهۆی ئەوەشـم لێ پرسـی گوتی:

- خەڵاتێکم بۆ ئامادە کردووی کە حەز دەکەم پێش چوونە تەلارێ ئەو خەڵاتەت بدەمێ.

بەر لەوەی ماڵێ جێ بێڵێ چەند جارێکـانی جـەخت کردەوەکـە سـەعات چـواری تـەواو چاوەڕێی بم.

ئەو بەڵێنی دا کە ڕاست یەك سەعات پێش دەست پێکردنی ڕێ و ڕەسمەکە، ئەو خەلات (دیاری) ەی کە بۆی ئامادە کردووم خەڵاتم کات و بداتێ.

ڕەها سەیرێکی سەعاتە زێڕەکەی مەچەکی کرد. سەعات سێ و چل خولەك بوو. بەهەڵچوونێکەوە گوتی:

- هەروەك بەڵێنی داوە تا بیست دەقیقەی دی دەگاتەوە.

ڕەها لەجێوە هەستاو بەرەو لای پەنجەرەی هۆڵی میوانانەوە چوو. سەیرێکی حەسارێی کرد دوای چەند دەقیقێکیان چاوی لە پەنجەرەکەی وەرگێڕا و دەنێو هۆڵێیدا دەست بە راوێچکان کرد. منیش وەك ڕەهای زۆر بە تاسەوە بووم تا زووە ئاغای کەنعانی بگاتەوە جێ و ئەو خەڵات و دیارییەی کە بۆ ڕەهای ئامادە کردووە بەدیاری بیداتێ.

لەخۆمم پرسی:

- ئاغای کەنعانی دەیهەوێ چ شتێکی بکاتە خەڵات و بیداتە ڕەهای بە دیاری؟ ئەگەر مەهدی لەلای ڕەهای نەبایە و لەلایوی نەژیابایە مەزەندەم دەکرد مەهدی بۆ وەرگرتۆتەوە بەڵام ئێستا؟

هەر چەند بیرم دەکردەوە وەڵامێکم نە دەدۆزیەوە سەیرێکی ڕەهام کردەوە لەسەر ئاو و ئاگران بوو و هەر ناوە ناوە دەچووە لای پەنجەرەکەوە و سەیرێکی دەرێی دەکردەوە.

لە ڕەهام پرسی:

- مەهدی نابینم، مەهدی لە کوێیە؟

ڕەها هاتە لامەوە و بەرامبەرم دانیشت و وەڵامی دایەوە:

- دەگەڵ ئاغای کەنعانییە. دەو چەند ڕۆژانە دا خووی پێوەگرتووە و نۆکری بووە. شەوێ دێتە تەلارێ.

سەیرێکی سەعاتی سەر دیواری هۆڵەکەم کرد. لەچەند دەقیقێکانی بەو لاوەتر بۆ سەعات چوار نەمابوو. دەنگی هۆڕنی نەپساوەی ئوتومبێلێك هاتە گوێ. ڕەبابە خانم بە پەلە هاتە هۆڵەکەو گوتی:

- خاتوون وەك بڵێی ئاغا تەشریفیان هێنابێتەوە.

ڕەها بەشڵەژاوییەکەوە لەجێ هەستا وگوتی:

- بەیارمەتی خۆت دەستێکم لەگەڵ بدەیە و کراسەکەم ڕێك خەرەوە.

ڕەبابە خانم بەلای ڕەهاوە هات و کراسەکەی بۆ ڕێك خستەوە. ڕەها پێکەنی و گوتی:

- بەڕاستی ئەو پیاوە خۆش گفت و بەڵێنە. وەك بەڵێنی دابوو لەکاتی خۆیدا هاتەوە تـا دەگەڵ خۆیدا بەریتە تەلاریّ.

رەبابە خانم بەپەلە لە هۆڵیّ چووە دەریّ تـا دەرکـی حەسـاریّ لەسـەر ئاغـای کـەنعانی بکاتەوە. رەها بەسپایی سەری لەبن گوێی نام وگوتی:

- نازانی چەند پڕ کەف و کوڵم...

دەنگی پێی یەکێکی کە دەهاتە هۆڵێوە رەهای ناچار کـرد بێـدەنگ بـیّ. هـەردووکمان چاومان دە دەرکی هۆڵێوە بڕی لەپڕ رەهـا لـە حەپەسـاوییان قریـشکەیەکی لیّ دا. ئـەوەی کەهاتە ژووری هۆڵیّ ئومێد بوو نەك ئاغای کەنعانی!

ئومێد دە ئاستانەی دەرکێدا راوەستابوو و بەدەم رەهایەوە پێدەکەنی. ئاغای کـەنعانیش لەپشتەوییەوە راوەستا بوو و بە دەنگێکی بەرزەوە بە رەهای گوت:

- رەها خاتوون، ئەوەش ئەو خەڵاتەی کەبەڵێنم دابوو.

رەها بەسەرساميیەکەوە هەنگاوێك چووە پێشیّ و بە دەنگێکی لەرزۆکەوە گوتی:

- ئەوە دیارە چیە لێرە، بەڵام من گێژ و وێژم، بەیارمەتی کەسێك بۆم روون کاتەوە.

ئاغای کەنعانی بەدەم پێکەنینەوە هاتە پێشیّ و لەبەردەمی رەهای راوەستاو بەدەنگێکی کە لە خۆشیان دەلەرزی گوتی:

- کچەکەم، هیواو ئاواتی سـەعات و رۆژەکـان بۆتـۆو ئومێـدی دەخـوازم، ئومێـدەوارم هەردووکتان لەپەنای یەکتریدا ژیانێکی شاد و ئاسوودە و بەختەوەر بەسـەربەرن. ئومێـدیش ئەو خەڵات و دیارییە بوو کە بەڵێنم دابوو.

رەها بەهاج و واجییەکەوە جارێکی سەرنجی لە ئاغای کـەنعانی و جـارێکی سـەرنج لـە ئومێدی دەدا. ئاغای کەنعانی کە پەشۆکاوی و حەپەساوییە رەهای ئاوا دیت گوتی:

- وەرە تاوێك دانیشە تا بۆت بگێڕمەوە.

رەها دەستبەجیّ بەرامبەر ئاغای کەنعانی لەسەر قەنەفـەی دانیـشت و چـاوی دەدەمـی وییەوە بڕی.

ئاغای کەنعانی چاوێکی لەمن، و ئومێدو رەبابە خانمیّ کرد و گوتی:

- ئێوەش هەر فەرموون دانیشن تا من ئاسان و ئاسوودەتر مەسـەلەکان بگێڕمەوە. ئەوجا رووی دە رەهای کرد و گوتی:

- بەیانی ئەو رۆژەی کە بۆ قسەکردنێ دەربارەی مارەیی و چۆنیەتی ڕێ و ڕەسمی زەماوەندەکە هاتمە مالێ بابتان چوومە سەردانێ خالت. بەپێچەوانەی چاوەڕوانیە منەوە خالتم بەگرژی دیت.

هەرکاتێ کەباسی هاوسەرگیریەمان دەهاتە پێشێ ئەو دەستبەجێ قسەکانی دەگۆڕی بەشێوەیەك کەتێگەیشتم هیچ حەزناکا دەربارەی ئەو مەسەلەیە بدوێ. بەدوای هۆیەکەیدا چووم بەلام ئەو هەر خۆی دەدزیەوەو لێی لادەدا. کە بەیەکجاری لەونا ئومێد بووم ئەوجا هۆیەکەیم لە خالۆژنت پرسی کە ئەو کابرایە بۆ وایە ئەویش هەر نەیدەویست وەلامی راست و ڕەوانم بداتەوە و هەولی دەدا نکولی لەمەسەلەکە بکا بەلام کە زانی من هەر واز ناهێنم و چەند جارێکانم باسەکە دووبارە کردەوە و هەر پێم داگرت دەمی قسانی بۆوە. بەلام دیسانەوەش خالت هەر ناقایل بوو. بە تەواوەتی وەڕەز ببووم.

هیچیان لەقسەکان نەدەگەیشتم. کورتیەکەی خالتم بەگیانی تۆ سوێند دا کە راستیەکەی چیە ئەوەم پێ بلێ. ئەویش رووداوی تەلاقی ئومێد و جیابوونەوەی لە هاوسەرەکەی پێشووی دوای گیرانی من هەمووی بۆ گێڕامەوە. دوایەش خوازبێنیە ئومێدی لەتۆی هێنایە گۆڕێ و گوتی:

- رەها بەتەواوی هەموو ئەو پەیوەندییەی کە بە ئومێدیەوە هەبووە و هەیەتی بەلام چونکە ئەرێی بە تۆداوە رووی لە ئومێدی وەرگێڕاوە و خۆی بە قەرزداری تۆو هەموو ئەو ماندووبوون و زەحمەتانەی تۆ دەزانێ کە بۆ گێڕانەوەو هێنانەوەی مەهدی بەدەست محەمەدتەوە کێشاوەو هەر بەو هۆیانەشەوەیە کە بە هاوسەریەتییە تۆ قایل بووە.

دەوان ساتانەدا وەك شێتانم تەماشای خۆم دەکرد. بەبێ خودا حافیزی لەمالێ وان هاتمە دەرێ و ئەوانم بەجێهێشت.

چوومەوە مالێ خۆمان و دەربارەی ئەو قسانەی کەلە خالتم بیستبوون زۆر باشم بیرکردەوە. کە باشیشم بیرکردەوە لەخۆم تەریق بوومەوە. کاتێ کەبیریشم لەجیاوازییە نێوان تەمەنی خۆم و تۆش کردەوە هێندەی دی شەرم گرتمی. تێکەیشتم کەمنیش هەلەیەکی زۆرم کردووە کەویستوومە تۆ بێنم کەبەلانی کەمەوە بیست سال لەمن بچووکتری و لەجێی کچمی. دەبەرامبەر گیانە گەورەکەی تۆدا خۆم زۆر بەبچووك و هیچ هاتە بەر چاوان.

بۆیە بڕیارم دا ئەو هەلەیەم راست کەمەوە. چوومەوە لای بابت و باسەکەم هەموو هێنایە گۆڕێ.

بەهاوکارییە بابت و خاڵت قسەمان دەگەڵ ئومێدی کردەوە و ئەومان رازی کرد تا من دە زنجیرکەوتنێ رزگارکات و لەجیاتی من ئەو تەوقی کۆیلایەتی و بەندایەتییە دەملی کا. هەرچەندە کارێکی گرانیش بوو بەڵام ئاخیرەکەی هەر سەرکەوتم و ئەوم رازی کرد لەجیاتی من بکەوێتە داوی عیشق و ئەوینی تۆوە.

هەموومان لەو جەفەنگەی ئاغای کەنعانی بەپێکەنین هاتین و چەپڵەمان بۆ ئەو هەموو فیداکاری و قوربانییانەی لێدا کە دەرهەق رەهای ئەنجامی دابوون. هەر دەو بارەشدا ئافەرینی خودی خۆی و ئەوگیانە بەرزەیمان کرد کە هەیەتی. فرمێسکی شادی دەچاوانی رەهایدا قەتیس مان و بەدەنگێکی لەرزۆکەوە سوپاسی ئاغای کەنعانی کرد. ئومێد لەجێوە هەستاو لەبەردەمی رەهای ڕاوەستا.

رەهاش لەجێی خۆیەوە هەستاو شەیدایانە دەچاوی ئومێدیەوە ڕاما. ئومێد دەحاڵێکیدا زەردەخەنەیەکی کەنیشانەی عیشقی ئاگرینی بۆ رەهایە بەسەر لێوانەوە بوو لێی پرسی:

- ئایا ئامادەی تەمەنێکی دوور و درێژ لەپەنا عاشقە دڵ ماندووەکەت بەهەموو خۆشی و شادی و غەمێکەوە بەسەر بەری؟

رەها سەرنجە ئاشقانەکەی لەسەر ئومێدی وەرگێڕا و بەریدانەوە و دەحاڵێکیدا کە دەنگی بەتەواوەتی دەلەرزی. بەشەرمێکەوە گوتی:

- راستییەکەی لەرووی ئاغای کەنعانیدا تەریق دەبمەوە ئەرێ بەئێوە بدەم.

ئاغای کەنعانی بەسەرسامییەکەوە لەجێ راستبۆوە و پرسی:

- بۆ کچەکەم؟

- چونکە تەواوی ئەو خەرجییانە ئێوە داوتانە.

ئاغای کەنعانی گوتی:

- ئەگەر مەبەستتان پارەو خەرجی کڕین و ڕێ و ڕەسمی ئەورۆیە هەمووی خودی ئومێداغا داویانە و من تەنیا هەر نوێنەری ئەو بووم و موو بەموو فەرمایشاتەکانی ئەوم ئەنجام داوە.

ئومێد دووبارە بەدەنگێکی ئاشقانەتر لەوەی پێشوو پرسیارەکەی لە رەهای کردەوە. رەها ئەمجارەیان بەخۆشحاڵیەوە دەچاوی ئومێدی روانی و وەڵامی دایەوە:

- ئەوە ئەو پەڕی ئارەزوو وئاواتمە ((بەڵێ))

دووباره هەموو چەپڵەمان لێدایەوە. ئەوجا  ئەو دوو مەلە عاشقانە، دەست لەناو دەست بەناو چەپڵەو هوڕای ئامادەبووانـدا لـەهۆڵێ چـوونە دەرێ و بەسـواری ئوتومبێلـە شـیك و جوانەکەی ئاغای کەنعانی بەرەو تەلارێوە جوولاَن.

کـارتی داوەتەکـەم لەجانتاکـەم دەرێنـا و سـەیرێکی نـاوی زاوام کـرد و دەتـەواوی سەرسامییەدا دیـتم نـاوی ئومێـدی بەسـەرەوەیە. سـەرم بـەرزکردەوە و سـەیرێکی ئاغـای کەنعانیم کرد کە هەروا تەماشای دوورکەوتنەوەی ئوتومبێلەکەی دەکرد. گەورەیی و گیانـە بەرزەکـەی ئـەو منیـان هـەوت کردبـوو. منـیش بـەرەو تـەلاری زەماوەندەکـەوە جـوولاَم. دەحاڵێکیدا کەلە خۆمم دەپرسی: رەها لەپەنا ئەو پیاوە گەورەدا خۆشـبەخت و بەختـەوەرتر دەبوو یالە پەنا کەسی خەون و خەیاڵەکانیدا؟

هەرچەندە چارەنووسیش ئومێدی بۆ ئەو هەڵبژاردبوو و دیاری کردبوو.